چاپی دووەم

کتێبی

# ڕێنما

## بۆ فێربوونی ڕێزمانی عەرەبی







لێکۆڵینەوەو وەرگێڕان
عەزیز غەفور پاڵانیانی

کتێبی

# ڕێنما

## بۆ فێربوونی ڕێزمانی عەرەبی

لێکۆڵینەوە و وەرگێڕانی کتێبی ناسراو بە

(كتاب الهداية في النحو)

عەزیز غەفور پاڵانیانی

## پێشکەش بە:

- مامۆستایانی ڕێزدار و لەیادنەچووم
- هاوسەری ژیانم و هەرسێ جگەرگۆشەکەم
- هاوڕێیانم و هاوڕایانم لە ڕێگای فێربووندا
- قوتابیانی خۆشەویستم

بۆ هەموو ئەم خۆشەویستانە و تۆی خوێنەری بەڕێزیش.....

ئەم کتێبە پێشکەش بێت

## پێڕستی بابەتەکان

## پێشەکی چاپی دووەم

سوپاس بۆ خوا چاپی یەکەمی ئەم کتێبە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و لە ماوەیەکی کەمدا خوێنەرانی خۆشەویست توانیان لێی سودمەند ببن، کە هەروەك لە پێشەکیەکەدا ئاماژەم پێکردبوو کتێبەکە کتێبی هەموو ئاستەکان بوو، خوێنکاران لە ئاوەندیەوە بۆ زانکۆ و مامۆستایانی زمانی عەرەبی و ئارادەیەك مامۆستایانی زمانی کوردی و کەسانێك کە ئارەزومەندی فێربوونی زمانی عەرەبین، هەموو ئامانە سودیان لێ وەرگرت، ئەمەش وایکرد کە بۆ جارێکی دی لە چاپی بدەمەوە،

من چاوەڕێی ئەوە بووم کە کتێبەکەم لەبەر ئەوەی خۆم بە دەستی خۆم نوسیومە کەمترین هەڵەی تێدا بێت، بەڵام پاش لە چاپدان بۆم دەرکەوت کە مەتنە عەرەبیەکەی خاڵی نیە لە هەڵە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فۆنتەی کە عەرەبیەکەم پێ نوسیوە، چونکە یەکەمجار بە فۆنتی (Alwand) نوسیبووم بەڵام پاش ئەوەی کە فۆنتەکەم گۆڕی، بۆ (Traditional) نوسینەکە هەڵەی زۆری تێکەوتبوو، بەڵام خۆشبەختانە زۆر بەکەمی بوومتە هۆی دروستکردنی هەڵەی زانستیانە و بەم حاڵەشەوە کتێبەکە سوودی خۆی لەدەست نەداوە، بۆیە داوای لێبوردن لە خوێنەری بەڕێز دەکەم ، و بۆ قەرەبوکردنەوەی ئەوەش جارێکی دی بە چاپم گەیاندەوە و هەوڵم داوە لەم چاپەدا پێداچوونەوەی دەقە عەرەبیەکە بە باشی بکەم و ئەو هەڵانەی تێدا لاببەم، بەڵام پاك و بێگەردی تەنها بۆ خوایە و ئێمە تەنها ئەوەمان لەسەرە کە کارەکانمان بە باشترین شێوە ئەنجام بدەین و سەرەنجامیش هەر بەدەست ئەوە.

هەڵەبجەی شەهید

٢٠١٢/١/١

# پێشەکی

بەناوی خودای بەخشندە و دلۆڤان، درود و ستایش بۆ موحەمەد پێشەوای مرۆڤایەتی و خێزانی پاك و هاوەڵانی فیداکار و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

کتێبی (الهداية في النحو) یەکێکە لەو کتێبانەی چەندین ساڵ لە خوێندنگا و حوجرەکاندا خوێندراوە -بەتایبەت لە ئێران- ، تا ئەمڕۆش بەردەوام فوتابیانی زانستە شەرعیەکان وەك پرۆگرامی خوێندن سوودی لێ وەردەگرن، و چەندین کەسی تریش وەك سەرچاوەیەکی کورت و پڕ مانا دەگەڕێنەوە بۆی، ئەم کتێبە لەسەر ڕیزبەندی کتێبی (الکافیە)ی (ابن حاجب) نوسراوە، بەڕای من کەم کتێب هەیە لەم چەند ساڵانەی دواییدا بەم جۆرە خزمەتی بە فوتابیانی کورد کردبێت لە بواری فێرکردنی ڕێزمانی عەرەبیدا، هۆکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ چەند تایبەتمەندیەك کە لەم کتێبەدایە، لەوانە: شێوازی ئەکادیمی لە نوسین و بەش بەش کردندا، کە وا هەست دەکەیت لەم سەردەمە و بۆ ئەم سەردەمە نووسراوە ، ئەمەش وای کردووە جێگای چەند کتێبێکی پێش خۆی بگرێتەوە، وەك کتێبی: (انموذج، کافیة، اجرومیة، صمدیة) و چەند کتێبێکی تریش، یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی بریتیە لە کەم باسکردن لە مەسەلە خیلافیەکانی نەحو، کە کتێبەکانی پێش خۆی ئەمەندەیان لەم مەسەلانە باس کردووە، وایان لێهاتووە بۆ فوتابیەك نەشێن کە دەیەوێت پوختەیەکی ڕێزمانی عەرەبی بزانێت پێش ئەوەی بچێتە ناو ئەو مەسەلانەوە، هەروەها دەتوانم بڵێم ئەم کتێبە هیچ بابەتێکی نەحوی پشت گوێ نەخستوە و گشتگیرە بۆ هەموو مەسەلەکان، و نەکورت و کەم و کوڕە، و نە درێژ و بێتاقەتکەر.

لەلایەکی ترەوە ئەم کتێبە چەندین پرسیار و ڕاهێنانی بۆ زیاد کراوە، کە یارمەتی فوتابی دەدەن بە کردەیی کار بکات لەسەر ئەوەی فێری بووە. ئەم تایبەتمەندیانە و هەندێکی تریش لەم کتێبەدا هەن، و هیچکام لە کتێبەکانی پێش خۆی و زۆرێك لە کتێبەکانی دوای خۆی-لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچکامیان بەکەم ناگرین- خاوەنی هەموویان نین، و ناتوانن بگەنە ئەم کتێبە.

کتێبی (الهدایه فی النحو) تەنها کتێبی فوتابی نییە، بەڵکو لە ئاستێکی وادایە کە مامۆستایانیش بە دڵنیاییەوە وەك سەرچاوەیەك لێی سوودمەند دەبن، چونکە بەدورە لەو تێکەڵیەی کە لە پرۆگرامەکانی خوێندندا هەیە، کە زانستی نەحو و صەرف تێیاندا بەجۆرێك تێکەڵ کراوە کە زۆرجار گرفت بۆ مامۆستاکانیش دروست دەکات، و ماددەی عەرەبی بە ناڕەوا کردووەتە یەکێك لە ماددە فورسەکان.

کاتێك بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٨٨ز لە ئێران ئاشنای ئەم کتێبە بووم، خێرا جێگای خۆی کردەوە لە دڵ و دەروونمدا، هەستم دەکرد زۆرێك لەو یاسا و ڕێسایانەی زمانی عەرەبی کە لە فوتابخانەکاندا بە

شێوەیەکی زۆر ناڕەحەت و پێچ باسیان لێوە دەکرێت، لێرەدا زۆر بە ئاسانی خراونەتە بەردەست بە ووردی و پوختی، لەو کاتەوە تائێستا ئاواتەخوازم کە ڕۆژێك بێت و ئەم کتێبە بکرێتە پرۆگرامی خوێندن لە قوتابخانەکاندا بۆ قۆناغەکانی دوای سەرەتایی، و لە هەموو خوێندنگا ئاینیەکانیشدا بخوێندرێت، دەتوانم گرینتی ئەوە بدەم کە قوتابیان لە گرێ کوێرەی ئیعراب و لەبەرکردنی بێ جێ و فێرنەبوونی زمانی عەرەبی ڕزگاریان دەبوو، بەڵام ئەمە تائێستاش هەر ئاواتە و منیش هەر چاوەڕێم.

لەبەر ئەم هۆکارانە و پاش ئەوەی هاوڕێیەکی خۆشەویست پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە وەریگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، بڕیارم دا بەو کارە هەستم، بە هیوای ئەوەی توانیبێتم خزمەتێك بە مامۆستایان و قوتابیانی خۆشەویست بکەم، و هەنگاوێکم بەرەوپێش نابێت لە بەکوردی کردنی زانستە شەرعیەکاندا.

## شێوازی کارکردنم لەم کتێبەدا

بۆ سەرچاوە عەرەبیەکەی ئەم کتێبە لە وەرگێڕانیدا سوودم لەو چاپەی مەجمەعی عیلمی ئیسلامی ئێران وەرگرت و چاپێکی تریش وەرگرت کە لەلایەن (علی بن نایف شحود)ەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، و ناوی سورەت و ژمارەی ئایەتەکانی بۆ دانراوە و فەرموودەکانی تەخریج کراون و مانای هەندێك لە شیعرەکانی کراوە، و چەند تێبینی و ڕوونکردنەوەی کورتیشی لەسەر نوسیوە، کە ئەگەر بە پێویستم نەزانیبێت یان لە بابەتەکە لایاندابێت تۆمارم نەکردوون، و هەندێکی تریان کە بەسوودبوون وەك خۆیان بە ئەمانەتەوە نەقڵم کردوون.

جا بۆ ئەوەی حاشیەکانی ئەو تێکەڵ بەو تێبینی و ڕوونکردنەوانە نەبن کە خۆم لەسەر کتێبەکەم نوسیون، ئەوانەی ئەوم بە زمانی عەرەبی- وەك خۆیان نوسیونەتەوە جگە لە چەند تێبینیەك کە وەرمگێڕاونەتە سەرکوردی لەبەر گرنگیان و ئاماژەم بە ناوی خاوەنەکەی لە کەوانەدا کردووە- و ئەوانەی خۆیشم لە خوار وەرگێڕانەکەی خۆمەوە بەکوردی نوسیون.

ناوی سورەت و ژمارەی ئایەت و تەخریجی فەرموودە و شەرحی هەندێ لە شیعرەکان و هەندێ تێبینی تریش کە ئەو ئاماژەی پێکردوون، من لە وەرگێڕانەکەدا دووبارەم نەکردوونەتەوە و هەرکەسێك پێویستی بوو دەتوانێت لەژێرنوسی دەقە عەرەبیەکەدا دەستیان بخات.

سەبارەت بە شێوازی وەرگێڕانەکە گرفتی زۆر ڕوویان تێکردم، سەرەتا ویستم هەموو دەستەواژە عەرەبیەکان وەك خۆیان بنوسمەوە لەناو کەوانەدا، بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت کە بەکارهێنانی ئەو هەموو کەوانەیە جوانی نوسینەکە لەناو دەبات، پاشان هاتمە سەر ئەوەی هەموویان وەرگێڕمە سەر کوردی وەك ئەوەی کە لە کتێبەکانی ڕێزمانی کوردیدا هەیە، بۆ نموونە لە جێگای (فاعل)دا بنوسم (بکەر) و لە جێگای (فعل)دا بنوسم (کار) و (ماضي) بنوسم (ڕابردوو) و...هتد، بەڵام لەبەر ئەوەی

پرۆگرامەكانی خوێندنی ڕێزمانی كوردی هێشتا لە تاوتوێدان و دەستەواژەكانی پێشوو گۆڕانێكی زۆریان بەسەردا هاتووە و هێشتا هەندێكیان یەكلا نەبوونەتەوە، و لەلایەكی ترەوە قوتابی پێویستی بە دەستەواژە عەرەبیەكان هەیە، بۆ ئەوەی فێری ڕێزمانی عەرەبی بێت، بۆیە وازم لەم بیرۆكەیە هێنا و بڕیارم دا ئەو دەستەواژانە هەر بە عەرەبی وەك خۆیان بەكار بهێنم، بەلاّم بە ڕەنوسی زمانی كوردی بیاننوسم، بۆ نموونە بۆ ووشەی(اسم) من (ئیسم)م بەكارهێناوە و بۆ (فعل) من(فیعل) و ....هتد،

مایەوە سەر ئەو پیتانەی كە لە زمانی كوردیدا نین، وەك: (ض، ص، ط، ...) و نوسینیان بە پیتێكی هاوشێوەیان لە كوردیدا، -وەك: نوسینی (زەمیر) لە جێگای (ضمیر)دا، و (موزاریع) لە جێگای (مضارع) دا-، جۆرێك لە بێتامی دروست دەكرد، بۆیە زۆرجار ناچار بووم ئەو پیتانە بەكاربهێنم هەروەك پیتە كوردیەكان، بەلاّم لە ناو ڕەنوسی كوردیدا، بۆ نموونە لە جیاتی (مضارع) نوسیم: (موضاریع) و لە جێگای (ضمیر)دا نوسیم (ضەمیر) و .... هتد. بۆیە داوای لێبوردن دەكەم لەو كەسانەی كە پابەندن بە یاسا و پیت و ڕەنوسی كوردیەوە، چونكە مەبەستی من تەنها سوود گەیاندنە بە خوێندكاران و كتێبەكەش لەسەر ڕێزمانی عەرەبیە نەك كوردی.

یەكێك لە كارە زۆر گرنگەكان كە لەم كتێبەدا ئەنجامم داوە ئەوەیە كە سەردێڕی بابەتەكانم وەرگێڕاوەتە سەر كوردی، بۆ ئەوەی ئەو كەسانەی كە لە ڕێزمانی كوردیدا شارەزاییان هەیە بە ئاسانتر لە ڕێزمانە عەرەبیەكە تێبگەن و بە پێچەوانەشەوە ئەوانەی كە لە ڕێزمانی عەرەبیدا شارەزاییان هەیە بەهۆیەوە بتوانن لە ڕێزمانی كوردی شارەزابن، ئەمە جگە لەو سوودەی كە ئەم كارە هەیەتی لە بەراوردكردنی نێوان دوو ڕێزماندا كە خاڵی هاوبەشیان زۆر زۆرە، كە دەبێتە هۆی فراوان بوونی مێشك و كرانەوەی بەڕووی ئەم زانستەدا، بۆ ئەم مەبەستەش داوای یارمەتیم لە مامۆستا: ( ئیدریس ئیبراهیم ) كرد كە مامۆستای وانەی كوردییە لە هەڵەبجەی شەهید، و لەو بوارەدا ئەزمونێكی باشی هەیە، ئەویش هات بەدەم داواكاریەكەمەوە و پێكەوە دوای تاوتوێ و بەراوردكردنی بابەتەكانی هەردوو ڕێزمانی عەرەبی و كوردی توانیمان بەو ئەنجامانە بگەین لە وەرگێڕانی سەردێڕی باتەتەكاندا، كە جێی خۆیەتی لێرەوە سوپاسی ئەو بەدەمەوەهاتنەی بكەم.

لەكۆتاییدا لە خوای باڵادەست داواكارم كە ئەم كارەم لێ وەربگرێت و بیخاتە ڕیزی چاكەكانمەوە و لە هەڵەكانم ببورێت، چونكە لێبوردە ودلۆڤانە.

عزیز غفور پالانیانی

هەڵەبجەی شەهید ١/٨/ ٢٠١٠

## الدرس الأول

## اَلمُقَدِّمَةُ في المَبَادِئ الَّتي يَجِبُ تَقْدِيمُهَا لِتَوَقُّفِ المَسَائِلِ عَلَيْهَا

## وفيها ثلاثة فصول

### الفَصلُ الأوّلُ - تَعْريفُ عِلمِ النّحْوِ

النَّحوُ: عِلْمٌ بِأصُولٍ تُعْرَفُ بِهَا أحْوَالُ أَوَاخِرِ الكَلِمِ الثَّلاثِ مِنْ حَيْثُ الإعْـرَابُ والبِنـاءُ ، وكَيفِيةُ تَركِيْبِ بَعْضِهَا مَعَ بَعْضٍ.

والغَرَضُ مِنْهُ: صِيَانَةُ اللّسَانِ عَنِ الخَطَأِ اللَّفظِيِّ في كَلامِ العَرَبِ.

وَمَوْضُوعُهُ: الكَلِمَةُ والكَلامُ.

---

## وانەی یەكەم

## پێشەكیەك سەبارەت بەو بنەمایانەی كە پێویستە پێش بخرێن ،

## چونكە بابەتەكانی تر لەسەریان وەستاون

### ئەم پێشەكیە پێك هاتووە لە سێ وەرز

### وەرزی یەكەم: پێناسەی زانستی نەحو

نەحو زانستێكە خاوەن چەند یاسایەكە كە بەهۆیانەوە حاڵەتەكانی كۆتایی سێ ووشەكەی پێ دەزانین لەڕووی ئیعراب و بیناوە، هەروەها بەهۆیەوە چۆنیەتی پێكەوەبەستنی ئەو ووشانە بەیەكەوە دەزانین.

مەبەست لەم زانستە: پاراستنی زمانە لە هەڵەی زارەكیی لە زمانی عەرەبیدا.

بابەتەكەی بریتیە لە: كەلیمە و كەلام -ووشە و ڕستە-.

## اَلفَصلُ الثاني -اَلكَلمةُ وأقسَامُهَا

الكَلِمَةُ: لَفظٌ وُضِعَ لِمَعْنًى مُفرَدٍ ، وَهِيَ مُنْحَصِرَةٌ في ثَلاثَةِ أَقْسَامٍ: اسْمٍ وَفِعْلٍ وَحَرْفٍ ، لأَنّها إمَّا أَنْ لا تَدُلَّ على مَعْنًى في نَفْسِهَا ، فَهِيَ (الحَرْفُ) أَوْ تَدُلَّ عَلَى مَعْنًى فِي نَفْسِهَا ، وأقْتَرَنَ مَعْناها بَأَحَدِ اَلأَزْمِنَةِ الثَّلاثَةِ ، فَهِيَ (الفِعْلُ) ، أَوْ تَدُلَّ عَلَى مَعْنًى فِي نَفْسِهَا وَلَمْ يَقْتَرِنْ مَعْنَاهَا بِأَحَدِ اَلأَزمِنَةِ ، فَهِيَ (الاسمُ).

### الخُلاصَة

النَّحْوُ عِلْمٌ بِقَوَاعِدِ كَلامِ العَرَبِ مِنْ حَيْثُ الإعْرابُ والْبِنَاءُ.

وفائِدَتُهُ: صِيَانَةُ اللِّسَانِ عَنِ الخَطَأِ فِي الكَلامِ.

والكَلِمَةُ: لَفظٌ وُضِعَ لِمَعْنًى مُفرَدٍ.

---

## وەرزی دووەم: کەلیمە( ووشە ) و بەشەکانی

کەلیمە: بریتیە لەو لەفزەی کە دانراوە بۆ مانایەکی تاك. کە خڕ دەبێتەوە لە سێ بەشدا: ئیسم، فیعل، حەرف، چونکە: یان دەلالەت ناکات لەسەر مانایەك لە خۆیدا، ئەوکات پێی دەڵێین (حەرف)، یاخود دەلالەت دەکاتە سەر مانایەك لە خۆیدا و ماناکەش هاوڕێیە لە گەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا —ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو -، ئەوکات پێی دەوترێت (فیعل)، یان دەلالەت دەکاتە سەر مانایەك لە خۆیدا و ماناکەی هاوڕێ نیە لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا، ئەوکات پێی دەوترێت (ئیسم).

### پوختە

نەحو زانینی یاساکانی زمانی عەرەبیە لەڕووی ئیعراب و بیناوە.

سودی: پاراستنی زمانە لە هەڵەکردن لە قسەکردندا

کەلیمە: لەفزێکە دانراوە بۆ مانایەکی تاك[1].

---

١ مەبەست ئەوەیە لە بەرامبەر هەر کەلیمەیەکەوە -ئیسم بێت یان فیعل یان حەرف- تەنها مانایەك هەیە بەڵام ئەگەر بوونە چەند کەلیمەیەك ئەوە ماناکانیش دەبنە چەند مانایەك.

## أَسْئِلَةٌ

١-عَرِّفْ عِلْمَ النَّحْوِ.

٢-بَيِّنْ مَوْضُوعَ عِلْمَ النَّحْوِ.

٣-اُذْكُرْ فَائِدَةَ عِلْمِ النَّحْوِ.

٤-عَرِّفِ الكَلِمَةَ وعَدِّدْ أَقْسَامَهَا.

---

## پرسیار

١. پێناسەی زانستی نەحو بکە؟

٢. زانستی نەحو باس لە چی دەکات؟

٣. سودی ئەو زانستە چیە؟

٤. پێناسەی کەلیمە بکە و بەشەکانی بژمێرە.

## الدرس الثاني

## تَعْرِيفُ الاسْمِ

الاسْمُ: كَلِمَةٌ تَدُلُّ عَلَى مَعْنًى فِي نَفْسِهَا غَيْرِ مُقْتَرِنٍ بِأَحَدِ الأَزْمِنَـةِ الثَّلاثَـةِ ، أَعْنِـي المَاضِـيَ وَالحَالَ وَالاسْتِقْبَالَ نَحْوُ (رَجُلٌ وَعِلْمٌ) وعلامَتُهُ أَن يَصِحَّ الإخبارُ عَنهُ ، وَبِـهِ ، نَحْـوُ (زَيْـدٌ قَائِـمٌ) وَالإِضافَةُ نَحْوُ (غُلامُ زَيْدٍ) وَدُخُولُ لامِ التَّعْرِيفِ عَلَيهِ ، نَحْوُ:(الرَّجُـلُ) وَأَنْ يَصِـحَّ فِيهِ الجَرّ والتَّنْوِينُ وَالتَّثْنِيَةُ وَالجَمْعُ وَالنَّعْتُ وَالتَّصْغِيرُ وَالنِّداءُ ، فإنَّ كُلَّ هذِهِ مِـنْ خَـواصِّ الاسْمِ.

ومَعْنى (الإِخْبارُ عَنْهُ) أَنْ يَكونَ مَحْكومـاً عَلَيْـهِ ، فَـاعِلاً ، أَو مَفْعُـولاً أَو مُبْتَـدَأً. وَمَعْنَـى (الإِخْبارُ بِهِ) أَنْ يَكُونَ مَحْكُوماً بِهِ كَالْخَبَرِ.

---

## وانەی دووەم

## پێناسەی ئیسم ( ناو )

ئیسم: ووشەیەکە دەلالەت دەکاتە سەر مانایەك لە خۆیدا، کە ئەو مانایە هاوڕێ نیە لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا.

مەبەست لە سێ کاتەکە بریتیە لە: ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو، وەك: (رجلٌ، عِلمٌ).

نیشانەکانی ئیسم بریتین لە: دروست بێت خەبەری لە بارەوە بدرێت و خەبەری پێ بدرێت، وەك: (زيدٌ قائمٌ)، ئیزافە، وەك: (غلامُ زيدٍ)، لامی تەعریف -ال- دەچێتە سەری، وەك:(الرجل)، مەجرور دەبێت، تەنوین وەردەگرێت، دەبێتە موسەنا، و جەمع، و صیفەت، و تەصغیر دەکرێت و دەبێتە مونادا. ئەمانە هەموویان نیشانەو تایبەتمەندی ئیسمن.

مەبەست لە (خەبەری لەبارەوە بدرێت) ئەوەیە کە حوکم بدرێت بەسەریدا، بەوەی کە ببێتە فاعیل یان مەفعول، یاخود موبتەدا.

هەروەها مەبەستمان لە (خەبەری پێ بدرێت) ئەوەیە کە حوکمی پێ بدرێت لەسەر شتی تر، وەك ئەوەی کە ببێتە خەبەر.

## تَعْرِيفُ الفِعْلِ

الفِعلُ: كَلِمَةٌ تَدُلُّ عَلى مَعْنًى فِي نَفْسِهَا مُقْتَرِنٍ بِأَحدِ الأَزمِنَةِ الثَّلاثَةِ ، نَحْوُ (نَصَرَ ، يَنْصُرُ ، اُنْصُرْ) وَعَلامَتُهُ أن يَصِحَّ الإخْبارُ بِهِ لا عَنْهُ ، وَدُخُولُ (قَدْ ، والسِّين ، وَسَوْفَ ، وَالجَازِم) عَلَيْهِ ، نَحْوُ (قدْ نَصَرَ ، وَسَيَنْصُرُ ، وَسَوْفَ يَنصُرُ ، وَلَمْ يَنصُرْ). و اتِّصالُ الضَّمَائِرِ البَارِزَةِ المَرفُوْعَةِ بِهِ نَحْوُ (كَتَبْتُ) وَ تَاءِ التَّأنِيثِ السَّاكِنَةِ نَحْوُ (كَتَبَتْ) وَ نُونِ التَّاكِيدِ ، نَحْوُ (اُكْتُبَنْ) فَإِنَّ كُلَّ هذِهِ مِنْ خَواصِّ الفِعْلِ.

---

### پێناسەی فیعل (کار)

فیعل: ووشەیەکە دەلالەت دەکاتە سەر مانایەك لە خۆیدا[1]، کە هاوڕێ بێت لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا. وەك: (نصرَ، ینصرُ، اُنصرْ).

نیشانەکانی فیعل بریتین لە:

خەبەری پێ بدرێت و خەبەری لەسەر نەدرێت، و(قد، س، سوف، جازم) بچێتە سەری، وەك:(قدْ نصرَ، سینصرُ، سوف ینصرُ، لم ینصرْ)، هەروەها گۆڕانکاری بەسەردا بێت بۆ ماضی و موضاریع و ئەمر، و ضەمیرە ئاشکرا مەرفوعەکان پێیەوە بنوسێن، وەك: (کتبتُ)، هەروەها (تاء)ی تەئنیسی ساکین پێیەوە بنوسێ، وەك: (کتبتْ)، هەروەها نونی تەئکید بچێتە سەری، وەك: (اُکْتُبَنْ).

ئەمانەی باسکران هەریەکەیان نیشانەیەکە کە تایبەتە بە فیعلەوە.

---

[1] واتە هەر بەوەی کە فیعلەکە ماناکەی هاوڕێیە لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا، نەك بەهۆی شتێکی ترەوە، بۆ نموونە ئەگەر ووتمان (زید ذاهب غداً) ئەوە دەلالەت دەکاتە سەر داهاتوو بەڵام بە هیچکام لە(زید) و (ذاهب) ناووترێت فیعل چونکە ئەو دەلالەت کردنەیان بەهۆی خۆیانەوە نیە، بەڵکو بەهۆی شتێکی ترەوەیە کە بریتیە لە (غدا).

## أسئلة :

١-مَا هُوَ تَعْرِيفُ الاسْمِ؟ اُذكُرْ مِثالاً لَهُ.

٢-عَدِّدْ عَلامَاتِ الاسْمِ مَعَ ذِكْرِ مِثَالٍ لِكُلِّ واحِدَةٍ مِنْهَا.

٣-اُذكُرْ تَعْرِيفَ الفِعْلِ ، وَمَثِّلْ لِذلِكَ.

٤-عدِّدْ عَلامَاتِ الفِعْلِ ، ومَثِّلْ لِكُلِّ واحِدَةٍ مِنْهَا.

---

## پرسیار:

١.پێناسەی ئیسم چیە؟ نموونەیەك بۆ ئیسم بێنەوە.

٢. نیشانەكانی ئیسم بژمێرە و نمونە بۆ هەریەكەیان بێنەوە.

٣.پێناسەی فیعل بكە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. نیشانەكانی فیعل بژمێرە و نمونەیان بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

لەم ڕستانەی خوارەوەدا ئیسمەكان و فیعلەكان دەربهێنە:

أ- قال تعالى: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) ﴾(الإخلاص/١، ٢).

ب- قال تعالى: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ.. ﴾ ( النـــور/٣٥).

ج- قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بن مسعودٍ رضي الله عنه:"الصَّبْرُ نِصْفُ الإِيمَانِ، وَالْيَقِينُ الإِيمَانُ"[١].

د- اَلصَّلاةُ عَمُودُ الدِّينِ[٢].

هـ- قال تعالى: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ﴾ (الحج/٣٨)

---

١ - المعجم الكبير للطبراني برقم(٨٤٦٦ ) وهو صحيح موقوف

٢ - اصله حديث في سنن الترمذي برقم( ٢٨٢٥ ) وهو صحيح

## الدرس الثالث

## تَعريفُ الحَرْفِ

الحَرْفُ: كَلِمَـةٌ لا تَدُلُّ عَلَى مَعْنًى فِي نَفْسِهَا ، بَلْ فِي غَيْرِهَا ، نَحْوُ (مِنْ) و (إلى) فَإنَّ مَعْنَاهُما الابْتِداءُ وَالانْتِهَاءُ ، وَلَكِنْ لا تَدُلاّنِ عَلَى مَعْنَاهُما إلاّ بَعْدَ ذِكْرِ مَا يُفْهَمُ مِنْهُ الابْتِداءُ والانْتِهَاءُ ، كـ (البَصْرَةِ) وَ (الكُوفَةِ) فِي قَوْلِـكَ (سِرْتُ مِنَ البَصْرَةِ إلى الكَوفَةِ).

وَعَلامَةُ الحَرْفِ إنْ لا يَصِحَّ الإخْبَارُ عَنْهُ ، وَلا بِهِ ، وأَنْ لا يَقْبَلَ عَلامَاتِ الأسْمَاءِ ، وَلا عَلامَاتِ الأفْعَالِ.

---

## وانەی سێیەم:

## پێناسەی حەرف (ئامراز)

حەرف: ووشەیەکە خۆی لە خۆیدا مانایەکی نیە بەڵکو لەگەڵ شتێکی تردا مانای بۆ دروست دەبێت [1]. وەك: (من، إلى) کە مانای سەرەتای مەبەست و کۆتایی مەبەست دەگەیەنن، بەڵام ئەم مانایە ناگەیەنن ئەگەر لە ڕستەدا نەبن، بەڵکو دەبێت بخرێنە ناو ڕستەیەکەوە کە ناوی شتانێکی تێدا برابێت کە مەبەستمان بێت سەرەتا و کۆتاییان دەستنیشان بکەین، وەك: (البصرة) و (الكوفة) لەم نموونەیەدا: (سرت من البصرة الى الكوفة)[2].

نیشانەی حەرف: بریتیە لەوەی نە خەبەری لە بارەوە بدرێت و نە بەهۆیەوە خەبەر بدرێت، هەروەها هیچکام لە نیشانەکانی ئیسم و فیعل وەرنەگرێت و نەچنە سەری.

---

[1] واتە کاتێك دەخرێتە ڕستەوە ئەوە جۆر و مانای ڕستەکە مانای حەرفەکە دیاری دەکات .

[2] واتە: لە بەسرەوە ڕۆیشتم بۆ کوفە .

وَلِلْحَرْفِ فِي كَلامِ العَرَبِ فَوَائِدُ كَثِيرَةٌ ، كالرَّبْطِ بَيْنَ اسْمَيْنِ ، نَحْوُ (زَيْدٌ فِي الدَّارِ) أَو اسْمٍ وَفِعْلٍ نَحْوُ (كَتَبْتُ بالقَلَمِ) أَوْ جُمْلَتَيْنِ ، نَحْوُ (إِنْ جاءَنِي سَعِيدٌ فأَكْرِمْهُ) ، وَغَيْرِ ذلِكَ مِنَ الفَوَائِدِ الَّتِي سَيَأْتِي تَعْرِيفُهَا فِي القِسْمِ الثَّالِثِ إنْ شَاءَ اللهُ تَعَالى.

## الفَصْلُ الثَّـالِثُ -تَعْـرِيفُ الكَـلام

اَلكَلامُ: لَفْظٌ تَضَمَّنَ الكلمتينِ بالإسْنَادِ ، وَالإسْنَادُ نِسْبَةُ إِحْدى الكَلِمَتَيْنِ إلى الأُخْرى ، بِحَيْثُ تفِيدُ المُخاطَبَ فَائِدَةً يَصِحُّ السُّكُوتُ عَلَيْهَا ، نَحْوُ: (قَامَ زَيْدٌ).

---

حەرف لە زمانی عەرەبیدا سودی زۆری هەیە، وەك پەیوەستكردنی دوو ئیسم بەیەكەوە، وەك: (زید فی الدار)، یاخود ئیسمێك و فیعلێك، وەك: (كتبت بالقلم)، یان دوو ڕستە، وەك: (إن جائني سعيد فأكرمه)، چەند سودێكی تریش كە لە بەشی سێیەمدا پشت بەخوا دەیانناسێنین.

### وەرزی سێیەم: پێناسەی كەلام[1] (ڕستە)

كەلام: لەفزێكە دوو ووشەی لە خۆگرتبێت كە یەكێكیان درابێتە پاڵ ئەوی تریان.

دانەپاڵ یان ئیسناد: بریتیە لەوەی یەكێك لە دوو ووشەكە بدەینە پاڵ ئەوی تریان بەجۆرێك سودێكی وا بە گوێگرەكە بگەیەنێت كە ئیتر گونجاو بێت بێدەنگ بێت و لەسەری نەڕۆین[2].وەك: (قام زید)[3].

---

١ مانای كوردی كەلام بریتیە لە (قسە) بەڵام مەبەستی نەحویەكان لە كەلام بریتیە لە (ڕستە).

٢ واتە: ووتنی ڕستەكەمان -بەو شێوەیەی كە باسمان كرد كە دوو ووشەكە یەكێكیان درابێتە پاڵ ئەوی تر- بەس بێت بۆ ئەوەی گوێگر لە مەبەستمان بگات و نەبێتە هۆی پرسیار كردن و چاوەڕوانی كردنی ئەوەی كە ووشەیەكی تر بڵێین كە پێویست بووە و بەڵام ئێمە نەمان ووتووە ، لەلایەن ئێمەشەوە كە قسەكەمان كردووە پێویست بەوە نەكات ڕوونكردنەوەی زیاتری بۆ بدەین.

٣ كە تێیدا نیسبەتی هەستانەوە دراوەتە پاڵ زید .

فَعُلِمَ أَنَّ الكَلامَ لا يَحْصِلُ إلاّ مِنْ اسْمَيْنِ ، نَحْوُ (زَيْدٌ واقِفٌ) ، وَيُسمَّى جُمْلَةً اسْمِيةً. أَو فِعْلٍ واسْمٍ ، نَحْوُ (جَلَسَ سَعِيدٌ) ، ويُسمّى جُمْلَةً فِعلِيَّةً. إذْ لا يُوجَدُ الُمسْنَدُ والُمسْنَدُ إلَيْهِ مَعاً في غَيْرِهِمَا ، فَلا بُدَّ لِلكلامِ مِنْهُمَا

فَإنْ قِيلَ: هذا يَنْتَقِضُ بِالنِّداءِ ، نَحْوُ (يَا خَالِدُ) قُلْنَا: حَرْفُ النِّداءِ قَائِمٌ مَقَامَ (أَدْعُو ، أَوَ أَطْلُبُ) وَهُوَ الفِعْلُ ، فَلا يَنْتَقِضُ بِالنِّداءِ.

## الخُلاصَةُ

تَنْقَسِمُ الكَلِمَةُ إلى ثَلاثَةِ أقْسَام:

اسْمٍ: وَهُوَ مَا دَلَّ عَلى مَعْنًى مُسْتَقِلّ مِنْ غَيْرِ اقْتِران بِأَحَدِ الأَزْمِنَةِ الثَّلاثَةِ.

وَفِعْلٍ: وَهُوَ مَا دَلَّ على مَعْنًى مُسْتَقِلّ مَعَ اقْتِرَانِهِ بِأَحَدِ الأَزْمِنَةِ الثَّلاثَةِ.

---

کەواتە: زانیمان کە کەلام پێك نایەت لە دوو ئیسم نەبێت، وەك: (زيد واقف)، کە بەمەش دەوترێت: ڕستەی ئیسمی، یاخود لە ئیسمێك و فیعلێك، وەك:(جلس سعید)، کە بەمەش دەوترێت: ڕستەی فیعلی ؛ چونکە موسنەد و موسنەد و ئیلەیهیمان پێکەوە دەست ناکەوێت لەم دوو شێوازەدا نەبێت، کەواتە دەبێت ڕستە یەکێك لەم دوو شێوازە بێت.

ئەگەر کەسێك بڵێت: ئەمەی کە وترا هەڵدەوەشێتەوە بە بانگ کردن واتە ئیدا، وەك: (یا خالد)[1] ئێمەش دەڵێین: نەخێر هەڵناوەشێتەوە، چونکە حەرفی ئیداو لە جێگەی فیعلی (ادعو) یان (اطلب)دا دانراوە، کە ئەم دوانەش فیعلن[2].

## پوختە

کەلیمە دەکرێت بە سێ بەشەوە: ئیسم: کە بریتیە لە ووشەیەك کە مانایەکی سەربەخۆی هەبێت و ماناکەی هاوڕێ نەبێت لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا.

فیعل: کە مانایەکی سەربەخۆی هەیە بەڵام ماناکەی هاوڕێیە لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا.

---

١ کە پێك هاتووە لە ئیسمێك و حەرفێك.

٢ واتە کاتێك دەڵێین: (یا خالد) واتە:ئەی خالد ، حەرفی (یا) لە جێگای فیعلێك دا دانراوە کە بریتیە لە (ادعو) یان (اطلب) واتە: (اطلب خالدا) یاخود: (ادعو خالدا) واتە: خالد بانگ دەکەم .

وَحَرْفٍ: وَهُوَ مَا لا يَدُلُّ عَلَى مَعْنًى فِي نَفْسِهِ إلاّ إذا رُكِّبَ مَعَ غَيْرِهِ ، وَفَائِدَتُهُ الرَّبْطُ بَيْنَ الكَلِمَاتِ.

الكَلامُ: هُوَ اللفْظُ المفِيدُ فَائِدَةً يَحْسُنُ السُّكُوتُ عَلَيْهَا وَلا يَحْصُلُ إلاّ مِنْ اسْمَيْنِ ، أَوِ اسْمٍ وَ فِعْلٍ.

أسئلة:

١–اُذْكُرْ تَعْرِيفَ الحَرْفِ ، وَمَثِّلْ لَهُ.

٢–بَيِّنْ فَوائِدَ الحَرْفِ ، ومَثِّل لَها.

٣–عَرِّفِ الكَلامَ ، وَ وَضِّحْ ذلِكَ بِمِثَالٍ.

٤–مَتى تَكونُ الجُملَةُ كَلاماً؟ وَضِّحْ ذلِكَ بِأَمْثِلَـةٍ.

٥–اُذكُرْ أَقْسَامَ الجُمْلَةِ ، وَمَثِّلْ لَهَا.

---

حەرف: کە لەخۆیدا مانایەك ناگەیەنێت بەڵکو لێك بدرێت لەگەڵ غەیری خۆیدا[1].

سودی حەرف ئەوەیە کە ووشەکان پێکەوە دەبەستێتەوە.

کەلام: گوتراوێکە سودێکی وا دەگەیەنێت کە دروستە لەسەری بێدەنگ بین. و بەدەست ناکەوێت لە دوو ئیسم یان لە ئیسمێك و فیعلێك نەبێت.

پرسیار:

١.پێناسەی حەرف بکە و نمونەی بۆ بهێنەوە.

٢.سودەکانی حەرف بڵێ و نمونەیان بۆ بهێنەوە.

٣.پێناسەی کەلام بکە و بە نمونەوە ڕوونی بکەوە.

٤.چ کاتێك ڕستە دەبێتە کەلام، بە نمونە ڕوونی بکەوە.

٥.بەشەکانی کەلام بنوسە و نمونەی بۆ بهێنەوە.

---

١ واتە بخرێتە ڕستەوە.

## ڕاهێنان:

١-هەر ئیسم و فیعل و حەرفێك لەم ڕستانەدا هەیە دەری بهێنە و جۆری ڕستەکان دیاری بکە:

أ-اِشْتَرَيْتُ الكِتَابَ.

ب-قَالَ سَعِيْدٌ هذا صَدِيقِي.

ج-إنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ [١].

د- أكَلَ الوَلَدُ الخُبْزَ مَعَ الجُبْنِ.

هـ-اِحْتَرِمِ الكَبِيرَ وَارْحَمِ الصَّغِيرَ.

و-رَأيْتُ الحَقَّ مُنْتَصِراً.

٢- ڕستە ئیسمی و ڕستە فیعلیەکان لە یەکدی جیا بکەوەو پاشان حەرفەکان دیاری بکە:

أ-اَلإِيْمَانُ مَعْرِفَةٌ بِالقَلْبِ ، وإقْرارٌ بِاللِّسانِ ، وَعَمَلٌ بِالأرْكَانِ [٢].

ب-الصَّوْمُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ [٣].

ج-اُطْلُبِ العِلْمَ مِنَ المَهْدِ إلى اللَّحْدِ.

د-قِيمَةُ كُلِّ امْرِىٍ ما يُحْسِنُهُ.

هـ- قال تعالى: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (٢) ﴾ (المؤمنون/١-٢)

---

١ - حديث صحيح اخرجه البخاري برقم(١)

٢ - قول مشهور عن السلف ، ولم يصح عن صحابي

٣ - سنن الترمذي برقم( ٧٦٩ ) وهو صحيح لغيره

## الدرس الرابع

## الاسْمُ

الاسْمُ يَنقَسِمُ إلى قِسْمَيْنِ: مُعْرَبٍ ، وَمَبْنِيّ ، وَنَذْكُرُ أَحْكَامَهُ في بَابَيْنِ:

اَلبَابُ الأوَّلُ: الاسْمُ المُعْرَبُ ، وَفِيهِ مُقَدِّمَةٌ ، وَثَلاثَةُ مَقَاصِدَ ، وخَاتِمَةٌ.

اَلْمقَدِّمةُ ، وَفِيهَا ثَلاثَةُ فُصُولٍ.

### اَلفَصْلُ الأوَّلُ -الاسْمُ المُعْرَبُ

اَلاسْمُ المُعْرَبُ: هُوَ كَلُّ اسْمٍ رُكِّبَ مَعَ غَيْرِهِ ولا يُشْبِهُ مَبْنِيَّ الأصْلِ، أعْني الحَرْفَ، وَالفِعْلَ المَاضِي والأمْرَ الحَاضِرِ ، نَحْوُ (سَعِيدٌ) في (جاءَ سَعِيدٌ) لا (سَعِيد) وَحْدَهُ ، لِعَدَمِ التَّرْكِيبِ

---

## وانەی چوارەم

## ئیسم (ناو)

ئیسم دەکرێت بە دوو بەشەوە: موعرەب و مەبنی، حوکمی هەرجۆرەش لە بابێکی سەربەخۆدا باس دەکەین.

بابی یەکەم: سەبارەت بە ئیسمی موعرەب دەبێت، کە پێك هاتووە لە پێشەکیەك و سێ مەقصەد و خاتیمەیەك.

پێشەکی: کە ئەمیش دەبێتە سێ وەرزەوە:

### وەرزی یەکەم : ئیسمی موعرەب

ئیسمی موعرەب: ئەو ئیسمەیە کە خرابێتە ڕستەوە، و لە شتێك نەچێت کە لە بنەڕەتدا مەبنی بێت.

مەبەست لەو شتەی کە لە بنەڕەتدا مەبنیە بریتیە لە:(حەرف، فیعلی ماضی ، ئەمری حازر).

نموونەی ئیسمی موعرەب وەك: (سعید) لە ڕستەی (جاء سعید)دا، نەك (سعید) بەتەنها، چونکە ئەمەیان لە ڕستەدا نیە و -ئێمەش ووتمان ئیسمی موعرەب دەبێت لە ڕستەدا بێت- [1].

---

[1] کەواتە هەرناوێك کە ئێمە دەیبینین دەبێت حوکم بدەین کە مەبنیە ئەگەر لە ڕستەدا نەبوو، پاشان ئەگەر خرایە ڕستەوە ئەوکاتە لە ڕستەکەدا دەردەکەوێت کە نیشانە ئیعرابیەکەی چیە.

ولا (هذا) في (قامَ هذا) لِوُجُودِ الشَّبَهِ بالحَرْفِ ويُسَمَّى (مُتَمَكِّناً) لِقَبُولِهِ التَنوِينَ ، وَحُكْمُهُ أَنْ يَخْتَلِفَ آخِرُهُ بِاخْتِلافِ العَوامِلِ لَفْظاً ، نَحْوُ (جَاءَنِي زَيْدٌ ، ورَأَيْتُ زَيْداً ، ومَرَرْتُ بِزَيْدٍ). أَوْ تَقْدِيراً ، نَحْوُ (جاءَنِي فَتًى ، رَأَيْتُ فَتىً ، ومَرَرْتُ بِفَتىً).

وَالإِعْرابُ: مَا بِهِ يَخْتَلِفُ آخِرُ المُعْرَبِ ، كَالضَّمَّةِ ، والفَتْحَةِ ، وَالكَسْرَةِ ، وَالوَاوِ ، واليَاءِ ، والأَلِفِ.

وَإِعْرابُ الاسْمِ ثَلاثَةُ أَنواعٍ: ١-رَفْعٌ ، ٢- نَصْبٌ ، ٣- جَرٌّ.

---

هەروەها نەك (هذا) لە ڕستەی (قام هذا)دا [١]، چونكە لە حەرف دەچێت. پێیشی دەڵێن موتەمەكین چونكە قەبوڵی تەنوین دەكات[٢].

حوكمی موعرەب ئەوەیە كە كۆتاییەكەی بگۆڕێت بە هۆی گۆڕانی ئەو عامیلانەوە كە دەچنە سەری، جا گۆڕانەكە بە لەفزی دەركەوێت، وەك: (جائني زيدٌ، رايت زيداً، مررت بزيدٍ)، یاخود دەرنەكەوێت بەڵكو بۆی تەقدیر بكەین،وەك: (جائني فتىً، رايت فتىً، مررت بفتىً).

ئیعرابیش بریتیە لەو گۆڕانكاریەی كە بەسەر كۆتایی ئیسمی موعرەبدا دێت، وەك: ضەممە و فەتحە و كەسرە و واو و یاء و ئەلف[٣].

ئیعرابی ئیسم سێ جۆرە: ١. ڕەفع ٢. نەصب ٣. جەڕ.

---

١ هەرچەندە لە ڕستەیشدایە .

٢ ئەم دەستەواژەیە:(و يسمى متمكنا لقبوله التنوين) -بە ناوی موعرەب دەوترێت موتەمەكین چونكە تەنوین قەبوڵ دەكات- هەڵەیە چونكە هەموو ناوێكی موعرەب تەنوین قەبوڵ ناكات. بەڵكو موعرەب دەكرێت بە دوو بەشەوە: مونصەریف و غەیرە مونصەریف كە ئەمەی دووەمیان تەنوین قەبوڵ ناكات. موتەمەكین بوونیش لەبەر وەرگرتنی تەنوین نیە بەڵكو لەبەر وەرگرتنی حەرەكاتی ئیعرابیە، نوسەر خۆیشی لەپاشدا لە وانەی شەشەمدا ، فەصڵی سێیەم ، باسی لێوە كردووە ، كە ئەوەیان ڕاستە و لێرەدا نوسەر بە هەڵەدا چووە .

٣ كە ئەمانە هەریەكەیان جۆرێكە لە گۆڕانكاری كە دەكەوێتە كۆتایی ناوی موعرەبەوە و هەریەكەیان نیشانەی حاڵەتێكی ئیعرابیە و درێژەی ئەم نیشانانە لە بابەتەكانی پاشتردا دێت .

والْعامِلُ: مَا يَحْصُلُ بِهِ الرَّفْعُ ، والنَّصْبُ ، وَالجَرُّ. وَمَحَلُّ الإعْرابِ من الاسْمِ هُوَ الحَرْفُ الآخِرِ ، نَحْوُ: (قَرَأَ خَالِدٌ) فَإنَّ (قَرَأَ) عَامِلٌ ، و (خَالِدٌ) مَعْرَبٌ ، و(الضَّمَّةُ) إعْرابٌ وَحَرْفُ الدَّالِ مِنْ (خَالِدٌ) مَحَلُّ الإعْرابِ.

وَاعْلَمْ أنَّهُ لا مُعْرَبَ فِي كَلامِ العَرَبِ إلاّ الاسْمُ المُتمكّنُ والفِعلُ المُضارِعُ. وَسَيَجِيءُ حُكْمُهُ فِي القِسْمِ الثَّانِي إنْ شاءَ اللهُ تَعَالى.

### الفَصْلُ الثَّاني -أصْنَافُ إعْرابِ الاسْمِ

إعْرابُ الاسْمِ تِسْعَةُ أَصْنَافٍ:

الأوَّلُ: أنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بالضَّمَّةِ ، والنَّصْبُ بِالفَتْحَةِ ، والجَرُّ بالكَسْرَةِ ، وَيَخْتَصُّ بِمَا يَلي:

---

عامیل[1]: ئەوەیە کە دەبێتە هۆی مەرفوع یان مەنصوب یان مەجرور بوون.

شوێنی ئیعراب لە ئیسمدا: بریتیە لە حەرفی کۆتایی، وەك: (قرا خالد)، کە تیایدا (قرا) پێی دەوترێت عامیل و بە (خالد)یش دەوترێت مەعمولێکی موعرەب، بە ضەممە کەیش دەوترێت ئیعراب، بە حەرفی دال لە ووشەی (خالد)دا دەوترێت شوێنی ئیعراب[2].

بزانە لە زمانی عەرەبیدا موعرەبمان نیە جگە لە ناوی موتەمەکین و فیعلی موضاریع[3] .

### وەرزی دووەم

### جۆرەکانی ئیعرابی ئیسم

ئیعرابی ئیسم دەکرێت بە نۆ جۆرەوە:

یەکەم: ڕەفع بە ضەممە بێت و نەصب بە فەتحە و جەڕ بە کەسرە، ئەم جۆرە ئیعرابەیش تایبەتە بە:

---

١ بۆیە پێی دەوترێت عامیل واتە: کارکەر، چونکە کارێك دەکات لە ووشەیەکی تردا، واتە دەبێتە هۆی مەرفوع بوون یان مەجرور بوون یان مەنصوب بوون یان مەجزوم بوونی ناوێك یان کارێکی تر.

٢ چونکە ئیعرابی فاعیلەکە کە لەم ڕستەیەدا بریتیە لە ضەممە، لەسەر دالەکە دانراوە .

٣ موتەمەکین بە هەردوو جۆرەکەیەوە موتەمەیکینی ئەمکەن کە پێی دەوترێت مونصەریف و موتەمەکینی غەیرە ئەمکەن کە پێی دەوترێت غەیرە مونصەریف.

أ-بالاسْمِ المُفْرَدِ المُنصَرِفِ الصَّحيحِ ، وَهُوَ عِنْدَ النُّحَاةِ: مَا لا يَكونُ آخِرُه حَرْفَ عِلَّةٍ نَحْـوُ: (أسَدٌ).

ب-بالجَاري مَجْرى الصَّحيحِ ، وَهُوَ: مَا يَكُونُ آخِرُه واواً ، أو يَاءً مَا قَبْلَهَا سَاكِـنٌ، نَحْوُ: (دَلْوٌ ، ظَبْيٌ)

ج-بالجَمْعِ المُكَسَّرِ المُنصَرِفِ ، نَحْوُ (رِجَالٌ).

تَقُولُ: (هَاجَمَنِي أسَدٌ ، وَجَرْوٌ ، وظَبْيٌ ، ورِجَالٌ ، ورأيْتُ أسَداً ، وَجَرْواً وظَبْياً وَرِجَـالاً ، وَمَرَرْتُ بِأسَدٍ ، وَجَرْوٍ ، وظَبْيٍ ، ورِجَالٍ).

اَلثَّاني:- أنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِالضَّمَّةِ ، والنَّصْبُ وَالجَرُّ بالكَسْرَةِ وَيَختَصُّ بالجَمْعِ المُؤنَّثِ السَّالِمِ ، نَحْوُ: مُسْلِمَاتٍ ، تَقُولُ: جَاءَتنِي مُسْلِمَاتٌ ، وَرأيتُ مُسْلِمَاتٍ ، ومَرَرْتُ بِمُسْلِمَاتٍ.

---

أ. ئیسمی موفرەدی مونصەریفی صەحیحەوە، صەحیحیش بەلای زانایانەوە ئەوەیە کە کۆتاییەکەی حەرفی عیللە نەبێت، وەك: (أسد).

ب. ئەو ئیسمەی کە جاری مەجرای صەحیحە واتە وەك صەحیح مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، کە ئەوەش بریتیە لەو ئیسمەی کە کۆتاییەکەی واو یاخود یاء یێکە کە حەرفەکەی پێشەوەی ساکین بێت،وەك:(دلوٌ، ظبيٌ).

ج. جەمعی تەکسیری مونصەریف، وەك: (رجالٌ).

کەواتە: تۆ دەڵێیت: (هاجمني اسدٌ، و جروٌ، و ظبيٌ، و رجالٌ) و (رأيت اسداً، و جرواً، وظبياً، و رجالاً) و (مررت بأسدٍ، و جروٍ، و ظبيٍ، و رجالٍ).

دووەم: ڕەفع بە ضەممە بێت و نەصب و جەڕ بە کەسرە بێت. ئەم جۆرە ئیعرابەیش تایبەتە بە جەمعی مونەنەسی سالمەوە، وەك: (مسلمات)، دەڵێیت: (جاءني مسلماتٌ) و (رأيت مسلماتٍ) و (مررت بمسلماتٍ).

اَلثَّالِثُ:- أَنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِالضَّمَّةِ ، والنَّصبُ والجَرُّ بالفَتْحَةِ، ويَختَصُّ بِغَيرِ المُنصَرِفِ نَحْـوُ (أَحْمَد) ، تَقُولُ: (جَاءَنِي أَحْمَدُ ، وَرَأَيْتُ أَحْمَدَ ، ومَرَرْتُ بِأَحْمَدَ).

اَلرَّابِعُ:- أَنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِالوَاوِ ، وَالنَّصْبُ بِالأَلِفِ ، وَالجَرُّ بِالياءِ ، وَيَختَصُّ بِالأَسْمَاءِ السِّتَّةِ ، مُكَبَّرَةً (غَيْرَ مُصَغَّرَةٍ) مفردةً (غَيْرَ مُثَنَّاةٍ وَلا مَجْمُوعةٍ) مُضَافَةً إلى غَيْرِ يَاءِ المُتَكَلِّمِ ، وَهِيَ: أَخُوكَ ، وأَبُوكَ ، وَحَمُوكَ ، وَفُوكَ ، وَهَنُوكَ ، وَذو مَالٍ ، تَقُولُ: (جَاءَنِي أَخُوكَ ، وَرَأَيْتُ أَخَاكَ ، وَمَرَرْتُ بِأَخِيكَ) وَكَذا البَوَاقِي.

**اسئلة:**

١-عَرِّفِ الاسْمَ المُعْرَبَ ، وَمَثِّلْ لَهُ.

٢-مَا هُوَ الاسْمُ المُتَمَكِّنُ؟ اِضْرِبْ مِثَالاً لَهُ؟

٣-اُذكُرْ مَعْنى الإِعْرابِ؟

---

سێیەم: ڕەفع بە ضەممە بێت، نەصب و جەڕ بە فەتحە بێت. ئەم جۆرە ئیعرابەیش تایبەتە بە ئیسمی غەیرەمونصەریفەوە، وەك: (احمد)، دەڵێیت: (جاءني احمدُ)و (رايت احمدَ)و (مررت بأحمدَ).

چوارەم: ڕەفع بە واو بێت ، نەصب بە ئەلیف بێت و جەڕ بە یاء بێت، ئەم ئیعرابەیش تایبەتە بە ئەسمائی سیتتەوە بەمەرجێ: ١. گەورەکراو بن و تەصغیرنەکرابن ٢. موفرەد بن واتە موسەنا یاخود جەمع نەکرابنەوە ٣.درابنە پاڵ شتێکی تر واتە ئیزافە کرابن بەمەرجێ ئیزافەکردنەکەیان بۆ لای یاءی موتەکەلیم نەبێت، ئەسمائی سیتتەش بریتین لە: (اخوك، ابوك، حموكَ، فوك، هنوك، ذومال)، دەڵێیت: (جاءني اخوك) و (رايت اخاك) و (مررت بأخيك) ئیسمەکانی تریش هەر بەم شێوەیە دەبن.

**پرسیار:**

١.پێناسەی ئیسمی موعرەب بکەو نمونەی بۆ بێنەوە.

٢.ئیسمی موتەمەکین چیە؟ نموونەیەکی بۆ بێنەوە

٣. واتای ئیعراب چیە؟

٤-اُذْكُرْ أَنْوَاعَ إعْرَابِ الاسْمِ؟

٥-عَرِّفِ العَامِلَ ، وَبَيِّنْ مَحَلَّ الإعْرَابِ؟

٦-كَمْ هِيَ أَصْنَافُ إعْرَابِ الاسْمِ ، اِشْرَحْ أَرْبَعَةً مِنْهَا مَعَ ذِكْرِ مِثَالٍ لِكُلِّ صِنفٍ مِنْها؟

٧-مَا هُوَ الاسْمُ الجَارِي مَجْرَى الصَّحِيحِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٨-كَيْفَ يُعْرَبُ كَلٌّ مِنَ الاسْمِ المُفْرَدِ الصَّحِيحِ ، وَالجَارِي مَجْرَى الصَّحِيحِ وَالجَمْعِ المُكَسَّرِ المُنْصَرِفِ؟

٩-اُذْكُرْ كَيفِيَةَ إعْرابِ جَمْعِ المُؤَنَّثِ السَّالِمِ ، وَمَثِّلْ لِذلِكَ؟

١٠-بِمَ يُعْرَبُ الاسْمُ غَيْرُ المُنْصَرِفِ؟ هَاتِ مِثَالاً يُوَضِّحُ ذلِكَ؟

١١-اُذْكُرِ الأسْمَاءَ السِّتَّةَ وَبَيِّنْ عَلامَاتِ إعْرابِهَا مَعَ ذِكْرِ أمْثِلَةٍ؟

---

٤.جۆرەکانی ئیعرابی ئیسم بڵێ.

٥.پێناسەی عامیل بکە و محەلی ئیعراب دیاری بکە.

٦.ئیعرابی ئیسم چەند جۆرە، چواریان باس بکە لەگەڵ نموونەدا بۆ هەر جۆرێك.

٧.ئیسمی جاری مەجرای صەحیح کامەیە. نمونەی بۆ بێنەوە.

٨.چۆن ئیعرابی هەریەکە لە ئیسمی موفرەدی صەحیح و جاری مەجرای صەحیح و جەمعی تەکسیری مونصەریف دەکەی؟

٩.چۆنیەتی ئیعرابی جەمعی مونەنەسی سالم بڵێ بەنموونەوە.

١٠.ئیسمی غەیرە مونصەریف بە چ شێوەیەك ئیعراب دەکرێت؟ بەنموونەوە ڕوونی بکەوە.

١١.ئەسمائی سیتتە بڵێ و نیشانەکانی ئیعرابیان بنوسە بە نموونەوە.

**ڕاهێنان:**

**١- ئیسمە موعرەبەکان لەم ڕستانەدا دەربهێنە و جۆر و ئیعرابەکانیان بنوسە:**

أ- قال تعالى: ﴿الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الفاتحة/٢).

ب-الإنْسَانُ حَرِيصٌ عَلى مَا مُنِعَ مِنْهُ.

ج- قال تعالى: ﴿.. إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ...﴾ (العنكبوت/٤٥).

د- جَاءَ أَبُوْ حَسَنٍ مِنْ دَمَشْقَ.

هـ- هذا الأسْتَاذ ذو عِلْمٍ بالْموضُوعِ.

و- الْمُمَرِّضَاتُ يَسْهَرْنَ عَلَى سَلامةِ المَرِيضِ

ز- سَلَّمْتُ عَلَى أحْمَدَ في المَدْرَسَةِ.

**٢- ئیسمێکی گونجاو لە ئەسمائی سیتتە لە هەریەك لەم بۆشاییانەی خوارەوەدا دابنێ:**

أ-اِحْتَرِمْ...... وَاعطف عَلَى......

ب-رَأَيْتُ...... في صَلاةِ الجُمُعَةِ.

ج-اُنْظُرْ إلى......

د-...... طَالِبٌ ذَكِيٌّ.

هـ-جَالِسْ كُلَّ...... عِلْمٍ.

و-سَلَّمْتُ عَلَى......

ز-وَفَّقَ اللهُ...... لِعمَلِ الخَيْرِ.

## الدرس الخامس

## بَقِيَةُ أصنَافِ إعْرَابِ الاسْمِ

الخامِسُ: أنْ يَكُونَ الرّفْعُ بالألِفِ ، والنَّصْبُ وَالجَرُّ بالياءِ المَفْتُوحِ مَا قَبْلَهَا.

وَيَخْتَصُّ بالمُثَنَّى ، وَ (كِلاَ) وَ (كِلْتَا) إذا كَانَا مُضَافِينِ إلى ضَمِيرٍ ، وَ (اثْنَانِ وَ اثْنَتَانِ) تَقُولُ: (جَاءَني الرَّجُلانِ كِلاهُمَا ، وَاثنَانِ ، وَرَأَيْتُ الرَّجُلَيْنِ كِلَيْهِمَا ، وَاثْنَيْنِ ، وَمَرَرْتُ بِالرَّجُلَيْنِ كِلَيْهِمَا وَاثنَيْنِ).

السَّادِسُ: أنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِالوَاوِ المَضْمُومِ مَا قَبْلَهَا ، وَالنَّصْبُ والجَرُّ بِاليَاءِ المَكْسُورِ مَا قَبْلَهَا. وَيَخْتَصُّ بِالجَمْعِ المُذَكَّرِ السَّالِمِ ، (والمُلْحَقُ بِهِ) كـ: أُوْلِي ، وَعِشْرِينَ وَأَخَوَاتِهَا ، تَقُولُ: (جَاءَنِي مُسْلِمُونَ ، وَعِشْرُونَ رَجُلاً ، و أُولُو مالٍ ، وَرَأَيتُ مُسْلِمِينَ ، وَعِشْرِينَ رَجُلاً ، وَأُولِي مَالٍ ، وَمَرَرْتُ بِمُسْلِمِينَ ، وَعِشْرِينَ رَجُلاً ، وَأولِي مَالٍ).

---

## وانەی پێنجەم:

## پاشماوەی جۆرەکانی ئیعرابی ئیسم

پێنجەم: ڕەفع بە ئەلف بێت، نەصب و جەڕ بە یاء ێك بێت کە حەرفەکەی پێشەوەی فەتحەی هەبێت.

ئەمەش تایبەتە بە موسەنا و (کلا) و(کلتا)وە بەمەرجێ ئەم دوانەی کۆتایی ئیزافە کرابن بۆ لای ضەمیر، هەروەها تایبەتیشە بە (اثنان)و (اثنتان)ەوە، کەواتە دەڵێیت: (جاءني الرجلان کلاهما واثنان) و (رایت الرجلین کلیهما واثنین) و (مررت بالرجلین کلیهما والثنین).

شەشەم: ڕەفع بە واوێك بێت کە حەرفەکەی پێشەوەی ضەممەدار بێت، نەصب و جەڕیش بە یاء ێك بێت کە پێشەوەی کەسرەدار بێت، ئەمەش تایبەتە بە جەمعی موزەکەری سالمەوە و هەروەها بەو ووشانەوە کە خراونەتە ڕیزیەوە واتە مولحەق کراون پێیەوە، وەك: (اولي) و (عشرون و خوشکەکانی)، دەڵێیت: (جاءني مسلمون، وعشرون رجلا، واولو مال) و (رایت مسلمین، وعشرین رجلا، واولي مال) و(مررت بمسلمین وعشرین رجلا، واولي مال).

وَاعْلَمْ أَنَّ نُوْنَ التَّثْنِيَةِ مَكْسُورَةٌ أَبَداً ، وَنُـوْنَ الجَمْـعِ مَفْتُوحَـةٌ أَبَـداً. وَهُمـا يَسْـقُطَانِ عِنْـدَ الإِضَافَةِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي غُلامَا زَيْدٍ ، وَمُسْلِمُو مِصْرَ).

السَّابِعُ: أَنْ يَكُونَ الرَّفعُ بِتَقْدِيرِ الضَّمَةِ ، وَالنَّصْبُ بِتَقْدِيرِ الفَتْحَةِ ، وَالجَرُّ بِتَقْدِيرِ الكَسْـرَةِ. وَيَخْتَصُّ بِالمَقْصُورِ ، وَهُوَ: مَا آخِرُهُ أَلِفٌ مَقْصُورَةٌ نَحْوُ (مُوْسى)، وَبِالمُضَافِ إِلى يَاءِ المُتَكَلِّمِ غَيْرَ التَّثْنِيَةِ وَالجَمْعِ المُذَكَّرِ السَّالِمِ نَحْوُ (غُلامِي) تَقُولُ: (جَاءَنِي مُوْسَـى وَغُلامِـي، وَرَأَيْـتُ مُوْسى وَغُلامِي ، وَمَرَرْتُ بِمُوْسَى وَغُلامِي).

الثَّامِنُ: أَنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِتَقْدِيرِ الضَّمَّةِ ، وَالنَّصْبُ بِالفَتْحَةِ ، والجَرُّ بِتَقْدِيرِ الكَسْرَةِ ، وَيَخْتَصُّ بِالمَنْقُوصِ ، وَهُوَ: ما آخِرُهُ يَاءٌ مَكْسُورٌ مَا قَبْلَهَا نَحْوُ (القَاضِي) تَقُولُ: جَاءَنِي القَاضِي ، ورَأَيْتُ القَاضِيَ ، وَمَرَرْتُ بِالقَاضِي).

---

بزانە کە نونی موسەنا هەمیشە کەسرەی هەیە، و نونی جەمع هەمیشە فەتحەی هەیە، ئەم دوو نونەش لە کاتی ئیزافەکردندا دەڕۆن، وەك: (جاءني غلاما زيد) و (مسلمو مصر).

حەوتەم: ڕەفع بە تەقدیری ضەممە بێت، نەصب بە تەقدیری فەتحەبێت، و جەڕ بە تەقدیری کەسرە بێت، ئەمەش تایبەتە بە ئیسمی مەقصورەوە.

ئیسمی مەقصور: بریتیە لەو ئیسمەی کە کۆتاییەکەی ئەلفێکی مەقصورە بێت، وەك: (موسى).

هەروەها تایبەتە بە ئیسمی ئیزافەکراوەوە بۆ لای یاءی موتەکەلیم، بەمەرجێ ئەو ئیسمە موسەنا و جەمعی موزەکەری سالم نەبێت، وەك: (غلامي)، تۆ دەڵێیت: (جاءني موسى و غلامي) و(رأيت موسى وغلامي)و (مررت بموسى وغلامي).

هەشتەم: ڕەفع بە تەقدیری ضەممە بێت، و نەصب بە فەتحەیەکی لەفزی بێت، و جەڕ بە تەقدیری کەسرە بێت، ئەمەش تایبەتە بە ئیسمی مەنقوصەوە.

ئیسمی مەنقوص: ئەو ئیسمەیە کە کۆتاییەکەی یاء یێك بێت کە حەرفەکەی پێشەوەی کەسرەی هەبێت. وەك: (القاضي)، دەڵێیت: (جاءني القاضي) و(رأيت القاضيَ) و(مررت بالقاضي).

التَّاسِعُ: أَنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِتَقْدِيرِ الوَاوِ ، وَالنَّصْبُ وَالجَرُّ بِاليَاءِ لَفظاً وَيَخْتَصُّ بِالجَمْعِ المُذَكَّرِ السَّالِمِ مُضَافاً إلى يَاءِ المُتَكَلِّمِ ، تَقُولُ: (جَاءَنِي مُعلِّميَّ) أَصْلُهُ " مُعلِّمُوْيَ " ، اِجْتَمَعَتِ الوَاوُ وَاليَاءُ فِي كَلِمَةٍ وَاحِدَةٍ ، والأولى مِنهُمَا سَاكِنَةٌ ، فَقُلِبَتِ الوَاوُ يَاءً ، وأُدْغِمَتْ فِي اليَاءِ وَابدِلَتِ الضَّمَّةُ بِالكَسْرَةِ ، مُنَاسَبَةً لِلْيَاءِ ، فَصَارَ " مُعَلِّميَّ " تَقُولُ: (جَاءَنِي مُعلِّميَّ ، وَرَأَيْتُ مُعلِّميَّ، وَمَرَرْتُ بِمُعلِّميَّ).

**اَلخُلاصَةُ:**

اَلاسْمُ المُعْرَبُ: كُلُّ اسم رُكِّبَ مَعَ غَيْرِهِ وَاخْتَلَفَ آخِرُهُ بِاخْتِلافِ العَوَامِلِ.

إعرَابُ الاسْمِ: هُوَ ما بِهِ يَخْتَلِفُ آخِرُهُ.

عَلامَةُ إعْرابِ الاسْمِ: الضَّمَّةُ ، والفَتْحَةُ ، وَالكَسْرَةُ ، والأَلِفُ وَالوَاوُ وَاليَاءُ، وَلإعْرابِ الاسْمِ تِسْعَةُ أَصْنافٍ:

---

نۆیەم: ڕەفع بە تەقدیری واو بێت، و نەصب و جەڕ بە یاء یێکی لەفزی بێت.

ئەمەش تایبەتە بە جەمعی موزەکەری سالەوە بە مەرجێ ئیزافە کرابێت بۆ لای یاءی موتەکەلیم، تۆ دەڵێیت: (جاءني معلميَّ) ئەم ووشەیە لە بنەڕەتدا (معلموي) بوە، واو و یاء لە یەك ووشەدا کۆ بوونەتەوە و یەکەمیان ساکینە، لەبەر ئەوە واوەکە دەکەین بە یاء ، پاشان لەگەڵ یائەکەی تردا دەغمی دەکەین، پاشان ضەممەی میمەکە دەکەینە کەسرە بۆ ئەوەی لەگەڵ یائەکەدا بگونجێ، لەکۆتاییدا ووشەکەمان دەبێتە (معلميَّ)، کەواتە تۆ دەڵێیت: (جاءني معلميَّ)و (رايت معلميَّ) و(مررت بمعلميَّ).

**پوختە**

ئیسمی موعرەب: ئەو ئیسمەیە کە خرابێتە ڕستەوە و کۆتاییەکەیشی بە هۆی گۆڕانی عامیلەکانەوە بگۆڕێت.

ئیعرابی ئیسم: ئەوەیە کە بەهۆیەوە کۆتایی ئیسمەکە دەگۆڕێت.

نیشانەکانی ئیعرابی ئیسم بریتین لە:(ضەممە، فەتحە، کەسرە، ئەلف، واو، یاء).

ئیعرابی ئیسم دەکرێت بە نۆ جۆرەوە:

١-الرَّفْعُ بالضَّمَّةِ وَالنَّصْبُ بالفَتْحَةِ والجَرُّ بالكَسْرَةِ ، كأَسَدٍ ، ودَلْوٍ ، وظَبْيٍ ورِجالٍ.

٢-الرَّفْعُ بالضَّمَّةِ وَالنَّصْبُ والجَرُّ بالكَسْرَةِ ، كـ (مُسْلِمات).

٣-الرَّفْعُ بالضَّمَّةِ وَالنَّصْبُ والجَرُّ بالفَتْحَةِ ، كـ (أحْمَد).

٤-الرَّفْعُ بالواوِ والنَّصْبُ بالألِفِ والجَرُّ بالياءِ ، كالأسْماءِ السِّتَّةِ.

٥-الرَّفْعُ بالألِفِ والنَّصْبُ والجَرُّ بالياءِ ، ويَخْتَصُّ بالمثَنّى ومُلْحَقَاتِهِ.

٦-الرَّفْعُ بالواوِ والنَّصْبُ والجَرُّ بالياءِ ، ويَخْتَصُّ بِجَمْعِ المذَكَّرِ السَّالِمِ ومُلْحَقاتِهِ.

٧-الرَّفْعُ بتَقْدِيرِ الضَّمَّةِ والنَّصْبُ بتَقْدِيرِ الفَتْحَةِ والجَرُّ بتَقْدِيرِ الكَسْرَةِ ، كـ (مُوسَى).

٨-الرَّفْعُ والجَرُّ بتَقْدِيرِ الضَّمَّةِ والكَسْرَةِ والنَّصْبُ بالفَتْحَةِ لَفْظاً ، كـ (القاضِي).

٩-الرَّفْعُ بتَقْدِيرِ الواوِ والنَّصْبُ والجَرُّ بالياءِ لَفْظاً ويَخْتَصُّ بجَمْعِ المذَكَّرِ السَّالِمِ مُضـافاً إلى ياءِ المتَكَلِّمِ ، كـ (مُعَلِّمِيَّ).

---

١.ڕەفع بە ضەممە و نەصب بە فەتحە و جەڕ بە کەسرە بێت، وەك: (اسد، دلو، ظبي، رجال).

٢.ڕەفع بە ضەممە بێت و نەصب و جەڕ بە فەتحە بێت، وەك: (احمد)

٣.ڕەفع بە ضەممە بێت و نەصب و جەڕ بە کەسرە بێت، وەك: (مسلمات).

٤.ڕەفع بە واو و نەصب بە ئەلف و جەڕ بە یاء بێت، وەك: ئەسمائی سیتتە.

٥.ڕەفع بە ئەلف و نەصب و جەڕ بە یاء بێت، ئەمەش تایبەتە بە موسەنا و هاوشێوەکانیەوە.

٦.ڕەفع بە واو بێت و نەصب و جەڕ بە یاء بێت، ئەمەش تایبەتە بە جەمعی موزەکەری سالم و هاوشێوەکانیەوە.

٧.ڕەفع بە تەقدیری ضەممە بێت و نەصب بە تەقدیری فەتحە و جەڕ بە تەقدیری کەسرە بێت، وەك: (موسى)

٨.ڕەفع و جەڕ بە تەقدیری ضەممە و کەسرە بێت و بەڵام نەصب بە فەتحەیەکی دیار بێت، وەك: (القاضي)

٩.ڕەفع بە تەقدیری واو بێت و نەصب و جەڕ بە یاء یێکی دیار بێت، ئەمەش تایبەتە بە جەمعی موزەکەری سالەوە بەمەرجێ ئیزافە کرابێت بۆ لای یاءی موتەکەلیم، وەك: (معلميّ).

## أسئلة:

١-كَيفَ يُعْرَبُ المثَنَّى؟ بَيِّن ذلِكَ بِمثَال.
٢-أيُّ الأسْمَاءِ تُرْفَعُ بِالوَاوِ؟ اُذكُرْ بِمَ تُنصَبُ وتُجَرُّ مَعَ ذِكْرِ أمْثلَةٍ.
٣-مَا هِيَ حَرَكَةُ نُونَي التَّثْنِيةِ والجَمْعِ دَائِماً؟ مَثِّلْ لَهُمَا.
٤-مَتَى تَسْقُطُ نُونَا التَّثْنِيَةِ والجمعِ المُذَكَّرِ السَّالِمِ؟ أَجِبْ بِأمْثِلَةٍ مفِيدَةٍ.
٥-أيُّ الأسْمَاءِ تُقَدَّرُ جَمِيعُ عَلامَاتِ إعْرابِهَا؟ اُذكُرْهَا مَعَ مِثَالٍ يُبَيِّنُ ذلِك.
٦-عَرِّفِ الاسْمَ المَنْقُوصَ ، وَبَيِّنْ عَلامَاتِ إعْرابِهِ مَعَ ضَرْبِ أمْثِلَةٍ.
٧-كَيْفَ يَكُونُ إعْرَابُ جَمْعِ المُذَكَّرِ السَّالِمِ إذا أُضِيفَ إلى يَاءِ المُتَكَلِّمِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

---

## پرسیار:

١.موسەنا چۆن ئیعراب دەکرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.
٢.چ ئیسمێك ڕەفعی بە واوە؟ نەصب و جەڕیشی دیاری بکە بە نموونەوە.
٣.نونی موسەنا و جەمع هەمیشە چ حەرەکەیەکیان هەیە؟ نموونەیان بۆ بێنەوە.
٤.چ کاتێك نونی موسەنا و جەمعی موزەکەری سالم لادەبرێن؟ بە نموونەوە وەڵام بدەوە.
٥.کام ئیسم هەموو حەرەکەتە ئیعراب بیەکانی تەقدیردەکرێن؟ دیاری بکە بەنموونەوە.
٦.پێناسەی ئیسمی مەنقوص بکە، نیشانەی ئیعرابیشی بڵێ بە نموونەوە.
٧. ئیعرابی جەمعی موزەکەری سالم چۆنە کاتێك کە ئیزافە دەکرێت بۆ لای یائی موتەکەلیم؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

ئیسمە موعرەبەکان لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە و پاشان جۆر و نیشانەی ئیعرابەکەشیان بنووسە:

١-" اَلْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ يَدِهِ وَلِسَانِهِ [1]. "

٢-" طُوبَى لِلزَّاهِدِينَ فِي الدُّنْيا ، الرَّاغِبِينَ فِي الآخِرَةِ [2]. "

٣-نَحْنُ ثَلاثَةُ طُلاَّبٍ ، نَجْتَمِعُ فِي مَدْرَسَتِنَا هـذِهِ كُـلَّ يَـومٍ مَسَـاءً إِلاَّ يَـوْمَ الجُمُعَـةِ ، نَجْتَمِعُ كَيْ نَتَعَلَّمَ اللُّغَةَ العَرَبِيَّةَ ، وَلَنَا فِي الأُسْبُوعِ خَمْسَةُ دُرُوسٍ ، يَبْتَدِئُ دَرْسُنَا فِي السَّاعَةِ السَّادِسَـةِ.

٤-(إذا أَضَرَّتِ النَّوافِلُ بِالفَرائِضِ فَارْفُضُوهَا).

٥-(مَوَدَّةُ الآباءِ قَرَابَةٌ بَيْنَ الأَبنَاءِ).

٦-عَلَّمَ أَبُوْ لَيْلَى مُوسَى القُرآنَ.

٧-سَأَلَ القَاضِي الجَانِيَ عَنْ جُرْمِهِ.

بـ ئیسمێك لەم بۆشاییانەدا دابنێ کە ئیعرابی بە حەرف یاخود بە حەرەکەی تەقدیرکراو بێت:

١- هذان...... عَاتِكَةَ.

٢-رَجَعَتْ...... مِنَ المَسْجِدِ.

٣-نَحْنُ...... مُجْتَهِدَانِ.

٤-...... تِلمِيذٌ ذَكِيٌّ.

٥-...... يَمْتَحِنُونَ الطُّلابَ.

---

١ - حديث صحيح البخاری برقم( ١٠) و مسلم برقم(١٧١)

٢ - هو من قول علي رضي الله عنه شعب الإيمان للبيهقي برقم(١٠٢٢٣) وفيه جهالة

## الدرس السادس

## اَلفَصلُ الثّالِثُ -اَلاسْمُ المُعْرَبُ

الاسْمُ الْمعرَبُ ، نوعان:

أ-مُنصَرِفٌ ، وَهُوَ مَا لَيْسَ فِيهِ سَبَبَانِ مِنَ الأسْبَابِ التِّسْعَةِ الآتِيَةِ ، نَحْوُ (سَعِيدٌ) ويُسَمَّى مُتَمَكِّناً.

وَحُكْمُهُ أنْ تَدْخُلَهُ الحَرَكَاتُ الثَّلاثُ مَعَ التَّنوِينِ ، مِثْلُ أنْ تَقُولَ: (جَاءَنِي سَعِيدٌ ، ورَأَيتُ سَعِيداً ، ومَرَرْتُ بِسَعِيدٍ).

ب-غَيْرُ مُنصَرِفٍ ، وَهُوَ مَا فِيه سَبَبَانِ مِنَ الأسْبابِ التِّسْعَةِ ، أوْ واحِدٌ مِنْهَا يَقومُ مَقَامَهُمَا.
وَحُكْمُهُ أنْ لا تَدْخُلَهُ الكَسْرَةُ والتَّنوِينُ ، وَيَكُونَ فِي مَوْضِعِ الجَرِّ مَفْتُوحاً ، كَمَا مَرَّ.
والأَسْبَابُ التِّسْعَةُ هِيَ: اَلْعَدْلُ ، وَالوَصْفُ ، والتَّأنِيثُ ، والمَعْرِفَةُ ، والعُجْمَةُ ، والجَمْعُ ، وَالتَّرْكِيبُ ، وَوَزْنُ الفِعْلِ ، وَالألِفُ والنُّونُ الزَّائِدَتَانِ.

---

## وانەی شەشەم

## وەرزی سێیەم- ئیسمی موعرەب

ئیسمی موعرەب دوو جۆرە:

ا. مونصەریف: ئەو ئیسمەیە کە دوو هۆ لەو نۆ هۆیەی تێدا نیە کە پاشتر باسیان لێوە دەکەین، وەك: (سعید) هەروەها پێیشی دەوترێت (متمکّن).

ب.غەیرە مونصەریف: ئەو ئیسمەیە کە دوو هۆی لە نۆ هۆکە تێدابێت یان تەنها یەك هۆی تێدا بێت بەڵام ئەو هۆیە بتوانێت لە جێگای دوو هۆدا دابنیشێت.

حوکمەکەشی ئەوەیە کە کەسرە و تەنوین وەرناگرێت، و لە حاڵەتی جەڕ دا فەتحەی دەدرێتێ. ئەمەش پێشتر ئاماژەی پێ کرا.

نۆ هۆیەکەش ئەمانەن:

(العدل، الوصف، التأنیث، المعرفة، العجمة، الجمع، الترکیب، وزن الفعل، الألف والنون الزائدتان).

وَتَفْصِيلُها كَما يَلي:

١-اَلعَدْلُ: وَهُوَ تَغْيِيرُ اللَفْظِ مِنْ صِيغَتِهِ الأصْلِيَّةِ إلى صِيغَةٍ أُخرَى (بِلا تَغْيِيرٍ في المَعْنَى)، وَهُوَ عَلَى قِسمَيْنِ:

أ-تَحْقِيقِيٌّ نَحْوُ (مَثْنَى ، ثُلاثَ) وَهُمَا مَعْدُولانِ حَقِيقَةً عَن (اِثْنَيْنِ اِثْنَيْنِ ، وَثَلاثَةٍ ثَلاثَةٍ).

ب-تَقْدِيْرِيٌّ نَحْوُ (عُمَرُ ، زُفَرُ) حَيْثُ قُدِّرَ فِيهِمَا العُدُولُ عَن (عَامِرٍ وَزَافِرٍ) لِيُوَجَّهَ بِهِ مَنْعُ الصَّرْفِ.

وَعُلِمَ مِنْ ذلِك أنَّ العَدْلَ يَجْتَمِعُ مَعَ الوَصْفِ في الأوَّلِ ، وَمَعَ العَلَمِيَّةِ في الثَّاني ، ولا يَجْتَمِعُ مَعَ وَزْنِ الفِعْلِ أصْلاً.

---

درێژەی هەریەکە لەم نۆ هۆیەش بەم شێوەیەیە:

١. عەدل -واتە لادان-: بریتیە لە لادانێك لە ووشەدا لە صیغەیەکەوە بۆ صیغەیەکی تر، بەبێ ئەوەی گۆڕان لە واتای ووشەکەدا دروست بکات.

ئەمیش دەکرێت بە دوو بەشەوە:

أ. تەحقیقی، واتە ڕاستەقینە، وەك: (مثنى، ثلاث)، کە ئەم دوانە لە ڕاستیدا لایانداوە لە:(اثنين اثنين) و (ثلاثة ثلاثة)ەوە.

ب. تەقدیری، وەك: (عمر، زفر)، چونکە وادانراوە کە ئەم دوانە لە (عامر) و (زافر)ەوە لا درابن، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە مەرج نیە وا بوبێت چونکە زانایانی نەحو ئەمەیان تەنها لەبەر ئەوە ووتوە کە بینیویانە (عمر، زفر) و هاوشێوەکانیان غەیرە مونصەریفن و هیچ هۆیەکیان بۆ ئەو حاڵەتەیان دەست نەکەوتووە ناچار خستونیانەتە ئەم ڕیزەوە و وایان داناوە کە لە (عامر)و (زافر)ەوە لایان داوە.

لەم نمونانەوە زانیمان کە عەدل لە گەڵ وەصفدا کۆبوەتەوە لەیەکەمداو لەگەڵ عەلەمیەتدا لە دووەمیاندا، و عەدل هەرگیز لەگەڵ وەزنی فیعل دا کۆنابێتەوە[1].

---

[1] واتە: لەزمانی عەرەبیدا هەرگیز نموونەیەکمان دەستناکەوێت کە تێیدا ئەم دووهۆیە پێکەوە هەبن.

٢-اَلوَصْـفُ:وَشَرْطُهُ أنْ يَكُونَ وَصفاً في أَصْلِ الوَضْعِ، فَإنَّ (أَسْوَد، وَأَرْقَم) غَيْرُ مُنْصَرِفِينِ ، وَإنْ صَارا اسْمَيْنِ لِلحَيَّةِ. لأِصالَتِهِما في الوَصفيةِ. وَ(أَرْبَـع) في قَوْلـِـكَ: (مَـرَرْتُ بِنِسْـوَةٍ أَرْبَعٍ) مُنْصَرِفٌ، مَعَ أنَّ فيهِ وَصفيةً وَوَزْنَ الفِعْلِ، لِعَدَمِ الأصـلِيَّةِ في الوَصْـفِ، وَلا يَجْتَمِـعُ الوَصْفُ مَعَ العَلَمِيّةِ أصْلاً.

٣-اَلتَّـأنيثُ بِالـتَّاءِ: وَشَرْطُهُ أنْ يَكُونَ عَلَماً ، نَحْوُ (طَلْحَة وفَاطِمَة) وَكَذا المَعْنوِيُّ وهُوَ مَا جُعِلَ عَلَماً دُونَ عَلامةِ تَأنِيثٍ ، مِثْلُ: (زَيْنَب).

---

٢.وەصف: مەرجەكەيشی ئەوەیە كە ووشەكە هەر لە سەرەتای دانانیەوە بۆ وەصف دانرابێت، وەك: (اسود، ارقم)، كە هەردوانیان غەیرە مونصەریفن، هەرچەندە بیانكەینە ناو بۆ مار، چونكە هەر لە بنەڕەتدا ئەم دوانە وەصف بوون.

بەڵام ووشەی (اربع) لەم ڕستەیەدا: (مررت بنسوة أربع)، مونصەریفە، هەرچەندە ئێستا وەصف و وەزنی فیعلی[1] تێدایە، چونكە لە بنەڕەتدا وەصف نەبووە[2]. هەروەها وەصف هەرگیز لەگەڵ عەلەمدا لەیەك ووشەدا كۆنابێتەوە[3].

٣.تەئنیس بەهۆی تائەوە: مەرجی ئەم هۆیە ئەوەیە كە ووشەكەمان عەلەم بێت، وەك:(طلحة، فاطمة). هەروەها ئیسمی مونەنەسی مەعنەوی -كە: بریتیە لەو ئیسمەی كرابێتە عەلەم بۆ مونەنەس بە بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەكی ئیسمی مونەنەسی پێوە دیار بێت - بە هەمان شێوەیە، وەك: (زینب).

---

١ چونكە وەزنەكەی لە فیعلی ماضی ڕوباعی دەچێت، وەك (اكرم) .

٢ لەبنەڕەتدا ناو بووە بۆ ژمارە و لەم ڕستەیەدا وەك وەصف بەكارمان هێناوە.

٣ چونكە هەركاتێك ووشەیەك كە وەصفی تێدا بوو كردمانە عەلەم بۆ كەسێك یان شتێك ئەوە هەر بەو كارە وەصفیەتەكەی وون دەكات، چونكە عەلەم تەنها دەلالەت لەسەر خاوەنەكەی دەكات و مەرج نیە ڕەچاوی ماناكەی بكرێت ، بەڵكو دەگونجێت عەلەمێكمان هەبێت و صیفەتێكی خراپ بێت كەچی خاوەنەكەی باش بێت یان بە پێچەوانەوە.

ثُمَّ المُؤنَّثُ المَعنَوِيُّ إنْ كانَ ثُلاثِيّاً سَاكِنَ الوَسَطِ، غَيْـرَ أَعْجَمِـيّ يَجُـوزُ صَـرْفُهُ مَـعَ وُجُـودِ السَّبَبَيْنِ، نَحْوُ (هِنْد) لأَجْلِ الخِفَّةِ، وَإلاّ وَجَبَ مَنْعُهُ، نَحْوُ (زَيْنَب، وَسَقَر، وَمَاه وَجَـوْر).

وَالتَّأنِيثُ بِالألِفِ المَقْصُورَةِ نَحْوُ (حُبْلَى) وَ المَمْدُودَةِ نَحْوُ (حَمْراء) مُمتَنِعٌ صَرْفُهُ البَتَّةَ ، لأنَّ الألِفَ قَائِمٌ مَقَامَ السَّبَبَين: التَّأنِيثِ وَلُزُومِهِ ، فَكَأَنَّـهُ أُنِّثَ مَرَّتَيْنِ.

٤-المَعْرِفَةُ: وَلا يُعْتَبَرُ فِي مَنْعِ الصَّرْفِ بِها إلاّ العَلَمِيّةُ وتَجْتَمِعُ مَعَ غَيْرِ الوَصْفِ ، مِثْلُ: إبْرَاهِيمَ وَأحْمَدَ.

## أسْئِلَة :

١-كَمْ قِسْماً يَنقَسِمُ الاسمُ المُعرَبُ؟

٢-عَرِّفِ الاسْمَ المُنْصَرِفَ ، وَمَثِّلْ لَهُ.

---

پاشان مونەنەسی مەعنەوی، ئەگەر سیانی و ناوەڕاست ساکین و نائەعجەمی بوو، لەبەر ئەوەی لەسەر زمان سوکە، دەتوانین صەرفی بکەین هەرچەندە دوو هۆی تێدا بێت، وەك: (هِند)، ئەگەر نا ئەوە واجبە مەنع بکرێت لەصەرف، وەك: (زینب، سقر، ماه، جور)[1]

پاشان تەئنیس بە ئەلفی مەقصورە، وەك: (حبلی)، و ئەلفی مەمدودە، وەك:(حمراء) پێویستە بەیەکجاری مەنع بکرێت لەصەرف ، چونکە ئەلفەکەی لەجێگای دوو هۆدا دادەنیشێت: یەکەمیان بریتیە لە: تەئنیس، دووهەمیان: جێگیر بوون و بەردەوامی لەسەر تەئنیس، لەبەر ئەوە وەك ئەوە وایە دوو جار تەئنیس کرابێتەوە.

٤.مەعریفە: ئەم هۆیە بۆ مەنعکردن لە صەرف تەنها جۆری عەلەمیەکەی بە هەند دەگیرێ، ئەم هۆیەش لەگەڵ غەیری وەصفدا کۆ دەبێتەوە، وەك:(إبراهیم، احمد).

## پرسیار:

١.ئیسمی موعرەب دەبێتە چەند بەشەوە؟

٢.پێناسەی ئیسمی مونصەریف بکە و نموونەی بۆ بێنەوە.

---

١ (ماه) ناوی دێیەکە، (جور) ناوی شارێکە لە فارس.

٣-عَرِّفْ غَيْرَ الْمُنصَرِفِ مِنَ الأَسْمَاءِ ، وَعَدِّدْ أَسْبَابَ مَنْعِ الصَّرْفِ ، مَعَ ذِكْرِ أَمْثِلَةٍ لأَرْبَعَةٍ مِنْهَا.

٤-عَرِّفِ العَدْلَ فِي الأَسْمَاءِ الممْنُوعَةِ مِنَ الصَّرفِ ، وَبَيِّنْ أَقْسَامَهُ مَعَ ذِكْرِ أَمْثِلَةٍ.

٥-مَعَ أَيِّ الأَسْبَابِ التِّسعَةِ يَجتَمِعُ العَدْلُ؟ بَيِّنْ ذلِك بِمِثالٍ.

٦-مَا هُوَ الوَصْفُ فِي الأَسْمَاءِ غَيْرِ الْمُنصَرِفَةِ؟ بَيِّنْ شَرْطَهُ مَعَ ذِكْرِ مِثَالٍ.

٧-أُذكُرْ شُرُوطَ التَّأنِيثِ فِي الأَسْمَاءِ الْمُنصَرِفَةِ ، وَمَثِّلْ لذلِك.

٨-إذا كَانَ الْمُؤَنَّثُ المَعْنَوِيُّ عَلَماً سَاكِنَ الوَسَطِ فَهَلْ يَجُوزُ صَرْفُهُ؟ مَثِّلْ لِمَا تُجِيبُ.

٩-مَا هُوَ سَبَبُ مَنْعِ الصَّرْفِ مَعَ العَلَمِيَّةِ؟

١٠-مَا هُوَ سَبَبُ عَدَمِ الصَّرْفِ فِي التَّأْنِيثِ بِالأَلِفِ المَقْصورَةِ والمَمْدودَةِ؟

---

٣.پێناسەی نامونصەریف بکەو هۆکانی مەنع لەصەرف بژمێرە، لەگەڵ هێنانەوەی نموونە بۆ چواریان.

٤.پێناسەی عەدلیەت بکەو بەشەکانی ڕوون بکەوە لەگەڵ نموونەدا.

٥. عەدل لەگەڵ کام لە نۆ هۆیەکەدا کۆ دەبێتەوە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٦.وەصف لە ئیسمە نامونصەریفەکاندا چیە؟ مەرجەکەی بڵێ لەگەڵ نموونەدا.

٧.مەرجەکانی تەئنیس لە ئیسمە نامونصەریفەکاندا بنووسە، و نموونەشی بۆ بێنەوە.

٨.مونەئەسی مەعنەوی ئەگەر عەلەمێکی ناوەڕاست ساکین بوو، ئایا دروستە صەرف بکرێت؟ نموونە بۆ وەڵامەکەت بێنەوە.

٩.کام جۆری ئیسمی مەعریفەیە بە هەند دەگیرێ لە مەنعی صەرفدا[1]؟

١٠.بۆچی تەئنیس بە ئەلفی مەقصورە و مەمدودە بە تەنها دەبێتە هۆی مەنعی صەرف؟

---

١ ئەم پرسیارە عەرەبیەکەی ڕوون نیە، بەڵام پێم وایە ویستراوە پرسیارەکە بەم شێوەیە بێت: ( اي نوع من المعرفة يعتبر في منع الصرف؟) بۆیە من کوردیەکەم هەر بەم جۆرە داڕشت.

## ڕاهێنان

ا-ئیسمە نامونصەریفەکان لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە، پاشان هۆی مەنعکردنیان لە صەرف بنووسە:

١-البَبغَاءُ خَضْراءُ وحَمْراءُ.

٢-خَرَجَ الُمصَلّونَ مِنَ المَسْجِدِ مَثنَى.

٣-سَلّمْتُ عَلى حَمزَةَ وزَكَرِياءَ.

٤-هذا مِنْ قَبِيلَةِ مُضَرَ.

٥-فَرِحَتْ بُشْرى بِنَجاحِها.

٦-خَرَجَتْ بُشْرى مِنَ المَزْرَعَةِ.

ب- چوار ئیسمی نامونصەریف بنووسە و هۆکەشیان ڕوون بکەوە، پاشان چوار ئیسمی مونصەریفیش بنووسە.

## الدرس السابع

## تتمةُ أسبابِ منعِ الصَّرْفِ

٥-اَلعُجْمَةُ: وَشَرْطُها أنْ تَكُونَ عَلَماً في العَجَمِيَّةِ (غَيْرَ العَرَبِيَّةِ) ، وَزائِداً عَلَى ثلاثةِ أحْرُفٍ نَحْوُ (إبْرَاهِيم وَ إسْمَاعِيل) ، أو ثُلاثِيّاً مُتَحَرِّكَ الوَسَطِ نَحْوُ (لَمَك) " فـ(لِجَام) مُنصَرِفٌ مَعَ كَوْنِهِ أعْجَمِيّاً " لأنَّهُ لَيْسَ بِعَلَمٍ ، وَ (نُوْح ، وَلُوْط) مُنْصَرِفَانِ ، لِسُكُونِ الأوْسَطِ فِيهِمَا.

٦-اَلجَمْعُ: وَشَرْطُهُ أنْ يَكُونَ عَلى صِيغَةِ مُنْتَهى الجُمُوعِ وَهُوَ أنْ يَكُونَ بَعْدَ أَلِفِ الجَمْعِ حَرْفَانِ مُتَحَرِّكَانِ نَحْوُ (مَسَاجِد ، وَدَوَابّ) ، أوْ ثَلاثَةُ أحْرُفٍ أوْسَطُهَا سَاكِنٌ غَيْرُ قابِلٍ لِلتَّاءِ نَحْوُ (مَصَابِيْح) ، وَإنَّ (صَيَاقِلَة وَفَرَازِنَة) [1] مُنْصَرِفَانِ لِقَبُولِهِما التَّاءَ.

---

## وانەی حەوتەم

## پاشماوەی هۆکانی مەنعی صەرف

٥.عوجمە- ناعەرەبی-: مەرجەکەیشی ئەوەیە کە لە بەکارهێنانە عەجەمیەکەیدا، -واتە پێش ئەوەی عەرەب بەکاری بهێنن- عەلەم بووبێت، و زیاتر لە سێ حەرف بێت، وەك: (ابراهیم، إسماعیل)، یاخود سێ حەرفی بێت، بەڵام ناوەڕاستەکەی حەرەکەتداربێت، وەك: (لمك)، کەواتە ووشەیەکی وەك:(لجام) لەگەڵ ئەوەشدا عەجەمیە بەڵام لەبەر ئەوەی عەلەم نیە مونصەریفە، هەروەها (نوح، لوط) بەهەمان شێوە مونصەریفن چونکە حەرفەکەی ناوەڕاستیان ساکینە.

٦. جەمع: مەرجەکەیشی ئەوەیە مونتەهای جوموع بێت. کە بریتیە لەو جەمعەی کە لە پاش ئەلفی جەمعەکەوە دوو حەرفی حەرەکەتدار هەبن، وەك: (مساجد، دَوابّ)، یاخود سێ حەرف هەبن کە حەرفەکەی ناوەڕاستیان ساکین بێت، هەروەها لە کۆتاییەکەیدا تاء وەرنەگرێت، وەك:(مصابیح). کەواتە: (صیاقلة، فرازنة) هەردوکیان مونصەریفن لەبەر ئەوەی تاء یان وەرگرتووە.

---

١ - صَيَاقِلَةٌ جمعُ صَيْقَلٍ : شحّاذُ السُّيوفِ . وفَرَازِنَةٌ : جمعُ فَرْزَانٍ وهيَ من لعبِ الشَّطرَنْجِ والأصلُ ( صَيَاقِلُ وفَرَازِينُ ) .

وهو أَيـضاً قائِمٌ مَقَامَ السَّبَبَيْنِ: الجَمْعُ وَامْتِنَاعُهُ مِنْ أنْ يُجْمَعَ مَرَّةً أُخرى جَمْعَ التَكْسِير ، فَكَأَنَّهُ جُمِعَ مَرَّتَيْنِ.

٧-اَلـتَّرْكِيبُ: وَشَرْطُهُ أنْ يَكُونَ عَلَماً بِـلا إضَـافَةٍ ولا إسْـنَادٍ ، نَحْـوُ (بَعْلَبَـكّ) [١] ، وإنَّ (عَبْدَاللهِ) مُنصَرِفٌ ، لِلإضَافَةِ ، وإنَّ (شَابَ قَرْنَاهَا) مَبْنِيٌّ للإسْنَادِ.

٨-الألِفُ وَالـنُّونُ الزَّائِدَتان: وَشَرطُهُمَا – إنْ كَانَتَا في اسْمٍ – أنْ يَكُونَ الاسْمُ عَلماً نَحْوُ (عِمْران ، وَعُثْمَان). وَ (سَعْدَان) مُنْصَرِفٌ ، لأنَّهُ اسْمُ نَبْتٍ ، وَلَـيْسَ عَلَمـاً. وَإنْ كَانَتَـا في الصِّفَةِ فَشَرْطُهَا أنْ يَكُونَ مُؤَنَّثُها فَعْلانَةً ، نَحْوُ (نَشْوان وَنَشْـوَى) ، وَ (نَـدْمَانٌ) مُنْصَـرِفٌ لِوُجُودِ (نَدْمَانَة).

---

ئەم جەمعەش لە جێگای دوو هۆدا دادەنیشێت: ١.جەمع ٢. قەبوڵ نەکردنی ئەوەی کە جارێکی تر جەمع بکرێتەوە بە جەمعی تەکسیر. بۆیە وەك ئەوە وایە کە دوو جار جەمع کرابێتەوە.

٧. تەرکیب: مەرجەکەشی ئەوەیە کە عەلەم بێت، بەڵام تەرکیبەکەی نە بەهۆی ئیزافەوە بێت نە بەهۆی ئیسنادەوە، وەك: (بعلبك).

کەواتە: (عبدالله)لەبەر ئەوەی ئیزافەیە مونصەریفە، هەروەها (شاب قرناها) لەبەر ئەوەی ئیسنادیە مەبنیە.

٨.ئەلف و نونی زیادە: ئەم هۆیە ئەگەر لە ئیسمدا بوو ئەوە مەرجەکەی ئەوەیە کە ئیسمەکە عەلەم بێت، وەك: (عمران، عثمان). بۆیە (سعدان) لەبەر ئەوەی ناوی درەختە و عەلەم نیە مونصەریفە.

ئەگەر ئەم هۆیە لە صیفەتدا بوو ئەوە مەرجەکەی ئەوەیە موئەنەسەکەی لەسەر وەزنی (فعلانة) نەبێت، وەك: (نشوان، نشوى). کەواتە: (ندمان) لەبەر ئەوەی موئەنەسەکەی (ندمانة) یە مونصەریفە.

---

١ - يتكون من لفظين : بعل وبكّ ، بعل هو اسم صنم قوم إلياس كما جاء في قوله تعالى في سورة الصافات آية {أتدعُونَ بَعلًا وتذَرُونَ أحسَنَ الخَالِقِينَ} (١٢٥) سورة الصافات وبكّ : صاحب الصنم .

٩-وَزْنُ الفِعْـلِ: وَشَرْطُهُ أنْ يَختَصَّ بِالفِعْلِ نَحْوُ (ضُرِبَ ، وَشَمَّرَ) ، وَإنْ لَمْ يَختَصَّ بِهِ فيجِبُ أَنْ يَكونَ في أوَّلِهِ إحْدَى حُرُوفِ المُضارَعَةِ ، وَ لا يَدْخُلَهُ الهَاءُ [١] ، نَحْوُ (أحْمَدُ وَ يَشكُرُ ، وَتَغْلِبُ ، وَنَرْجِس). وَ (يَعْمَلُ) مُنْصَرِفٌ ، لِقَبُولِهِ التَّاءَ كَقَوْلِهِمْ (نَاقَةٌ يَعْمَلَةٌ) [٢].

وَاعْلَمْ أنَّ كُلَّ مَا يُشْـتَرَطُ فِيـهِ العَلَميّـةُ – وَهُـوَ: التَّأنِيـثُ بِالتَّـاءِ وَالمعْنَـوِيُّ، وَالعُجْمَـةُ ، وَالتَّرْكِيبُ ، والاسْمُ الَّذِي فِيهِ الألِفُ وَالنُّونُ الزائدتان – وَمَا لَمْ يُشْتَرَطْ فِيهِ ذلِك وَلكِـن اجْتَمَعَ مَعَ سَبَبٍ آخَرَ ، – وَهُوَ: العَدْلُ ، وَوَزْنُ الفِعْل فَقَط – إذا نَكَّرْتَهُ ، الصَرَفَ.

أمَّا في القِسْمِ الأوَّلِ، فَلِبَقَاءِ الاسْم بِلا سَبَبٍ، وأمَّا في القِسْمِ الثَّـاني فَلِبَقَائِـهِ عَلَـى سَـبَبٍ وَاحِدٍ، تَقُولُ: (جَاءَ طَلْحَةُ وَطَلْحَةٌ آخَرَ، وقَامَ عُمَرُ وعُمَرٌ آخرَ، وَقَامَ أحْمَدُ وَأحْمَدٌ آخَرَ).

---

٩. وەزنی فیعل: مەرجەکەی ئەوەیە کە ئەو وەزنە تایبەت بێت بە فیعلەوە، وەك: (ضُرِبَ، شَمَّر)، بەڵام ئەگەر تایبەت نەبوو بە فیعلەوە ئەوە پێویستە لە سەرەتاکەیەوە یەکێك لە حەرفەکانی موزارەعە هەبێت و تاء وەرنەگرێت، وەك: (احمد، يشكر، تغلب، نرجس). کەواتە: (يعمل) لەبەر ئەوەی تاء وەردەگرێت مونصەریفە -وەك عەرەب دەڵێن: (ناقة يعملة) –

پاشان بزانە: هەر کام لەو هۆیانەی کە بەمەرج گیراوە عەلەمیەتی لەگەڵدا بێت کە بریتین لە: (التأنيث بالتاء، التأنيث المعنوي، العجمة، التركيب، الإسم الذي فيه الألف والنون الزائدتان) وە ئەوانەش کە عەلەمیەت تێیاندا بەمەرج نەگیراوە، بەڵام لەگەڵ مەرجێکی تردا کۆبووەتەوە، وەك: (العدل، وزن الفعل) ئەمانە هەموو ئەگەر بیانکەیتە نەکیرە دەبنە مونصەریف.

لە جۆرەکانی یەکەمدا لەبەر ئەوەیە کە ئیسمەکە هیچ هۆیەکی تری بۆ نامێنێتەوە[٣]، لە جۆرەکانی دووەمدا –ئەوانەی کە تێیاندا بەمەرج نەگیراوە- لەبەر ئەوەیە تەنها یەك هۆی بۆ دەمێنێتەوە، دەڵێیت: (جاءَ طلحةُ و طلحةٌ آخر، قام عُمَرُ وعُمَرٌ آخر، قام احمدُ واحمدٌ آخر).

---

١ - استعمَلَ المصنِّفُ هنا ( الهاءَ وَالتاءَ ) بِمَعْنىً واحدٍ .

٢ - اليَعْمَلةُ مِنَ الإبلِ : النَّجيبَةُ المُعتَمِلَةُ المطبُوعَةُ على العَمَلِ ، ولا يُقالُ ذلِكَ إلاّ للأُنثى .

٣ چونکە ئەو هۆیەش کە لە پاش نەمانی عەلەمیەتەکە دەمێنێتەوە لەبەر ئەوەی عەلەمیەت مەرجی ئیعتیبارکردنی خۆیەتی، هەر بە نەمانی عەلەمیەتەکە ئیعتیباری خۆیشی نامێنێت.

وَكُلُّ مَا لا يَنصَرِفُ إذا أُضِيفَ ، أَو دَخَلَهُ اللامُ دَخَلَتْهُ اَلْكَسْرَةُ فِي حَالَةِ الجَرِّ ، نَحْوُ مَرَرْتُ بِأحْمَدِكُمْ وَبِالأَحْمَرِ)

**الخُلاصَةُ:**

الاسْمُ المُعْرَبُ عَلَى نَوْعَينِ:

١-مُنصَرِفٌ: وَهُوَ مَا لَيْسَ فِيهِ سَبَبَانِ مِنْ أسْبَابِ مَنْعِ الصَّرْفِ التِّسْعَةِ ، أو سَبَبٌ وَاحِدٌ يَقُومُ مَقَامَهُمَا ، وَتَدْخُلُهُ الحَرَكَاتُ الثَّلاثُ والتَّنوِينُ.

٢-غَيْرُ مُنصَرِفٍ: وَهُوَ الَّذِي اجْتَمَعَ فِيهِ سَبَبَانِ مِنَ الأَسْبَابِ التِّسْعَةِ ، أو سَبَبٌ وَاحِدٌ يَقُومُ مَقَامَ السَّبَبَيْنِ ، وَ لا تَدْخُلُهُ الكَسْرَةُ وَلا التَّنوِينُ.

الأَسْبَابُ التِّسْعَةُ لِمَنْعِ الصَّرفِ:

١-اَلعَدْلُ. ٢-اَلوَصْفُ. ٣-اَلتَّأنِيثُ. ٤-اَلمَعْرِفَةُ. ٥-اَلعُجْمَةُ. ٦-اَلجَمْعُ. ٧-اَلتَّرْكِيبُ. ٨-وَزْنُ الفِعْلِ. ٩-اَلأَلِفُ وَالنُّونُ الزَّائِدَتَانِ.

---

**هەروەها هەر ئیسمێکی غەیرە مونصەریف ئەگەر ئیزافە کرا، یاخود (لام) چووە سەری ئەوە کەسرە وەردەگرێت لە حاڵەتی جەڕدا، وەك: (مررت بأحمدكم، مررت بالأحمر).**

**پوختە**

**ئیسمی موعرەب دوجۆرە:**

**١. مونصەریف: ئەویش ئەو ئیسمەیە کە دوو هۆ لە نۆ هۆکەی مەنعی صەرف، یاخود یەك هۆی بەهێزی وا کە بتوانێت لە جێگای دوو هۆدا دابنیشێت، تێدا نەبێت، و هەرسێ حەرەکەتەکە و تەنوین وەردەگرێت.**

**٢. غەیرە مونصەریف: ئەویش ئەو ئیسمەیە کە دوو هۆ لە نۆ هۆکەی تێدابێت، یاخود هۆیەکی بەهێزی تێدا بێت کە لە جێگەی دوو هۆدا دابنیشێت، ئەم ئیسمانەش کەسرە و تەنوین وەرناگرن.**

**نۆهۆیەکەی مەنعی صەرف بریتین لە: ١. (العدل) ٢.(الوصف) ٣.(التأنيث) ٤.(المعرفة) ٥.(العجمة) ٦.(الجمع) ٧.(التركيب) ٨.(وزن الفعل) ٩.(الألف والنون الزائدتان).**

أسئلةٌ:

١-مَا هُوَ شَرْطُ العُجْمَةِ فِي المَنعِ مِنَ الصَّرْفِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٢-هَلْ يُمْنَعُ مِنَ الصَّرْفِ الأعْجَمِيُّ إذا كانَ ثُلاثِيّاً سَاكِنَ الوَسَطِ؟ اُذكُرْ أَمْثِلَةً لذلِـك.

٣-بَيِّنْ شَرْطَ الجَمعِ فِي مَنعِ الصَّرفِ.

٤-هَلْ سَبَبُ الجَمْعِ يَقُومُ مَقَامَ السَّبَبَيْنِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٥-إذا كَانَ التَّرْكِيبُ بِالإضَافَةِ أوِ الإسْنَادِ فَهَلْ يُمْنَعُ مِنَ الصَّرْفِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثَال.

٦-مَا هُوَ شَرْطُ الألِفِ والنُّونِ لِمَنعِ الصَّرْفِ فِي الاسْمِ؟ وَمَا شَـرْطُهُما لِلمَنْـعِ فِي الصِّـفَةِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٧-اُذكُرْ شُرُوطَ سَبَبِ مَنْعِ الصَّرْفِ فِي الاسْمِ الّذي لَهُ وَزْنُ الفِعْلِ.

٨-هَلْ يَجُوزُ انصرافُ العَلَمِ المُؤنَّثِ إذا نُكِّر؟ ولِمَاذا؟ وَضِّحْ ذلِكَ بِمِثَال.

---

پرسیار:

١. مەرجەكانی عوجمە لە مەنعی صەرف دا بژمێرە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. ئایا ئیسمی عەجەمی دەبێتە غەیرە مونصەریف ئەگەر سێ حەرفی بێت و ناوەڕاستەكەی ساكین بێت؟ بە نموونەوە وەڵام بدەوە.

٣. مەرجەكانی جەمع لە مەنعی صەرف دا بڵێ.

٤. ئایا جەمع لە جێگەی دوو هۆدا دادەنیشێت؟ نموونە بهێنەوە.

٥. ئایا ئەگەر تەركیب بە هۆی ئیزافە یاخود ئیسنادەوە بوو دەبێتە هۆی مەنعی صەرف؟ بە نموونەوە ڕوونی بكەوە.

٦. مەرجی ئەلف و نون لە مەنعی صەرف دا چیە؟ مەرجەكانی چین بۆ مەنعی صەرف لە صیفەتدا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٧. مەرجەكانی وەزنی فیعل لە مەنعی صەرف دا بڵێ.

٨. ئایا ئەگەر عەلەمی موئەنەس كرایە نەكیرە دەبێتە مونصەریف؟ بۆچی؟ بەنموونەوە ڕوونی بكەوە.

٩-لِمَاذا يَجُوزُ الصِرَافُ الاسْمِ المَعْدُولِ إذا نُكِّرَ؟

١٠-مَا هِيَ صِيغَةُ مُنتهى الجُمُوعِ ، وَضِّح ذلِك بِمثَال.

٩. بۆچ دروسته ئیسمێك كه عەدلی تێدا بێت صەرف بكرێت ئەگەر كرایه نەكیره؟

١٠. صیغەی مونتەهای جوموع چیه؟ به نموونەوه ڕوونی بكەوە.

## ڕاهێنان:

ا-ئەو هۆیانەی مەنعی صەرف كه مەرجیان عەلەمیەته بژمێره ، بەنموونەوە.

ب-لەم ڕستانەدا ئیسمه مونصەریف و غەیره مونصەریفەكان دیاری بكه:

١-جَاءَتْ زَيْنَبُ إلى المَدْرَسَةِ.

٢-سَافَرْتُ إلى حِمْصَ.

٣-رَأَيْتُ عَدْنانَ في الصَّفِّ.

٤-أَنَا عَطْشَانٌ.

٥-أهْلُ البَيْتِ أدْرَى بِمَا فِيهِ.

٦-يُثِيبُ اللهُ عُمَّارَ المَسَاجِدِ.

٧-قَرَأْتُ عَنِ الصَّقَالِبَةِ شَيْئاً كَثِيراً [1].

ج- لەم ئیسمانەدا مونصەریف و غەیره مونصەریفەكان دیاری بكه، و پاشان هۆی مەنعی صەرفەكەیان بنوسه: (جماهير، صيادلة، مناهل، نجوى، نعمان، ألوان، دیاربكر، مقامع، فريدة، رمّان، إبراهيم، غسّان، دمشق، مصابيح، لمياء، سقر، شجر).

د- ئەو هۆیانەی مەنعی صەرف بژمێره كه هەریەكەیان له جێگای دوو هۆدا دادەنیشێت، پاشان نموونەیان بۆ بێنەوە.

---

١- ( الصقالبة )جيل من الناس كانت مساكنهم إلى الشمال من بلاد البلغار و انتشروا الآن في كثير من شرقي أوروبة و هم المسمون الآن بالسلاف - المعجم الوسيط - (ج ١ / ص ١٠٧٥)

## الدرس الثامن

## اَلمَقْصَدُ اَلأوَّلُ فِي الأَسْمَاءِ المَرْفُوعَةِ

وَهِيَ ثَمَانِيَةُ أَقْسَامٍ:

١-اَلـفَاعِلُ.

٢-المَفْعُولُ الَّذي لَمْ يُسَمَّ فَاعِلُهُ.

٣و٤-المبتَدَأُ وَ الخَبَرُ.

٥-خَبَرُ إنَّ وَأَخَوَاتِهَا.

٦-اِسْمُ كَانَ وَأَخوَاتِهَا.

٧-اسْمُ (مَا) و (لا) المُشَبَّهَتَيْنِ بِـ (لَيْسَ).

٨-خَبَرُ (لا) الَّتِي لِنفي الجِنْسِ.

---

## وانەی هەشتەم

## مەقصەدی یەکەم-لەبارەی ئیسمە مەرفوعەکانەوە

ئیسمە مەرفوعەکان دەبنە هەشت بەشەوە:

١.فاعیل

٢. ئەو مەفعولەی کە فاعیلەکەی ناونەبراوە [1].

٣.موبتەدا

٤. خەبەر

٥. خەبەری (إن) و خوشکەکانی

٦. ئیسمی (کان) و خوشکەکانی

٧. ئیسمی (ما) و(لا)ی موشەببەهـ بە (لیس).

٨. خەبەری (لا)ی (نافیة للجنس)

---

١ پێیشی دەوترێت (نائب فاعل) .

## اَلقسمُ الأوّلُ: اَلفـاعلُ

وَهُوَ: كُلُّ اسْمٍ قَبْلَهُ فِعْلٌ ، أَو شِبْهُهُ يَقُومُ بِهِ الفِعْلُ [١] ، وَيُسْـنَدُ إِلَيْـهِ ، نَحْـوُ (قَـامَ خالِـدٌ ، خَالِدٌ قَائِمٌ أَبُوهُ ، مَا زارَ سَعيدٌ خَالِداً).

وَكُلُّ فِعْلٍ لا بُدَّ لَهُ مِنْ فَاعِلٍ مَرْفُوعٍ ، مُظْهَراً كَانَ نَحْوُ (ذَهَـبَ سَـعيدٌ) أَوْ مُضْـمَراً نَحْـوُ (سَعِيدٌ ذَهَبَ) ، وَإِنْ كَانَ مُتَعَدِّياً كَانَ لَـهُ أَيْضـاً مَفْعُـولٌ بِـهِ مَنصُـوبٌ نَحْـوُ (خَالِـدٌ زَارَ سَعِيداً).

فَإِنْ كَانَ الفَاعِلُ اسْماً ظَاهِراً، وُحِّدَ الفِعْلُ أَبداً، نَحْو: دَرَسَ زَيْدٌ ، وَدَرَسَ الزَّيْدانِ وَدَرَسَ الزَّيدُونَ ، وَإِنْ كَانَ الفَاعِلُ مُضْمَراً ، وُحِّدَ الفِعْلُ لِلفَاعِلِ [٢] الوَاحِدِ ، نَحْوُ: زَيْدٌ دَرَسَ ،

---

### بەشی یەکەم: فاعیل (بکەر)

فاعیل: هەموو ئیسمێکە کە فیعل یان شیبهە فیعلێك لە پێشیەوە بێت، کە فیعلەکە بە هۆی ئەوەوە بوونی هەبێت و ئیسناد درابێتە پاڵی، وەك: (قام خالد)، (خالد قائم ابوه)، (مازارسعید خالدا).

بزانە دەبێت هەموو فیعلێك فاعیلێکی مەرفوعی هەبێت، ئیتر ئەو فاعیلە دیاربێت واتە زاهیر بێت وەك: (ذهب سعید) یاخود نادیار بێت واتە موزمەر بێت، وەك: (سعید ذهب).

پاشان ئەگەر فیعلەکە موتەعەدی بوو ئەوە پێویستیشی بە مەفعول بیهی یەکی مەنصوب دەبێت، وەك:(خالد زار سعیدا).

ئەگەر فاعیل ئیسمێکی دیار- ظاهیر- بوو، ئەوە دەبێت هەمیشە فیعلەکەمان موفرەد بێت[٣]، وەك: (درس زید)، (درس الزیدان)،(درس الزیدون). بەڵام ئەگەر فاعیلەکەمان نادیاربوو -واتە: موزمەر بوو-، ئەوە بۆ فاعیلی موفرەد پێویستە فیعلەکە موفرەد بێت، وەك: (زید درس) ،

---

١ - صفةُ الفِعْلِ مِنَ الفِعْلِ كاسم الفاعل واسم المفعول و ...

٢ - والفاعِلُ هنا هوَ مُبتدأً لتقدُّمِهِ على الفعْلِ .

٣ مەبەست ئەوەیە کە فیعلەکە ضەمیری جەمع یان تەسنیە وەرنەگرێت ، چونکە وەك ئاشکرایە فیعل موفرەد وجەمعی نیە بەڵکو موفرەد و جەمع لە تایبەتمەندیەکانی ئیسمە .

وَيُثَنَّى لِلمُثَنَّى ، نَحْوُ: الزَّيْدَانِ دَرَسَا ، ويُجْمَعُ لِلجَمْعِ ، نَحْوُ: الزَّيْدُونَ دَرَسُوا.
وَإنْ كَانَ الفَاعِلُ مُؤَنَّثاً حَقِيقِيّاً – وَهُوَ مَا يُوجَدُ بِإزائِهِ مُذَكَّرٌ مِنَ الحَيَوَانَاتِ – أُنِّثَ الفِعْلُ أَبَداً إنْ لَمْ يَقَعِ الفَصْلُ بَيْنَ الفِعْلِ وَالفَاعِلِ ، نَحْوُ (قَامَتْ هِنْدٌ) ، وَإنْ لَمْ يَتَّصِلْ ، جَازَ التَّذْكِيرُ وَالتَّأنِيثُ نَحْوُ (دَرَسَ اليَوْمَ هِنْدٌ) ، وإنْ شِئْتَ تَقُولُ: (دَرَسَتِ اليَوْمَ هِنْدٌ) ، وَكذلِك يَجُوزُ التَّذْكِيرُ وَالتَّأْنِيثُ فِي المُؤَنَّثِ غَيْرِ [1] الحَقِيقِيِّ ، نَحْوُ (طَلَعَتِ الشَّمْسُ) وَإنْ شِئْتَ قُلْتَ (طَلَعَ الشَّمْسُ) ، هذا إذا كَانَ الفِعْلُ مُقَدَّماً عَلَى الفاعِلِ ، وَأَمَّا إذا كَانَ مُتَأَخِّراً أُنِّثَ الفِعْلُ ، نَحْوُ (الشَّمْسُ طَلَعَتْ).
وَجَمْعُ التَكْسِيرِ كَالمُؤَنَّثِ غَيْرِ الحَقِيقِيِّ ، تَقُولُ: (قَامَ الرِّجَالُ ، وَقَامَتِ الرِّجَالُ).

---

و بكرێته موسەنا ئەگەر فاعیلەکە موسەنا بێت، وەك: (الزيدان درسا)، و بکرێتە جەمع ئەگەر فاعیلەکەمان جەمع بێت، وەك:(الزيدون درسوا).

بەڵام ئەگەر فاعیلەکە موئەنەسی حەقیقی بوو -کە بریتیە لەو موئەنەسەی لەبەرامبەریەوە گیانلەبەرێکی موزەکەر هەبێت – ئەوە فیعلەکەمان دەبێت بە هەمیشەیی موئەنەس بێت، بەمەرجێك جیایی نەکەوتبێتە نێوان فیعل و فاعیلەکەیەوە بە ووشەیەکی تر، وەك: (قامت هند)، کەواتە ئەگەر جیایی لەنێواندا هەبوو ئەوە هەریەکە لە تەزکیر و تەئنیس لە فیعلەکەدا دروستە ، وەك:(درس اليوم هند)، یاخود ئەگەر بتەوێت دەتوانی بڵێی:(درست اليوم هند)، هەروەها دروستە تەزکیر و تەئنیس لە فیعلەکەدا ئەگەر فاعیلەکە موئەنەسی غەیرە حەقیقی بوو، وەك:(طلعت الشمس)، دەشتوانی بڵێی:(طلع الشمس)، ئەمە لەکاتێکدایە کە فیعلەکە پێش کەوتبێت بەسەر فاعیلەکەدا، بەڵام ئەگەر دوا کەوتبوو ئەوە پێویستە فیعلەکە موئەنەس بێت، وەك:(الشمس طلعت).

جەمعی تەکسیریش وەك موئەنەسی غەیرەحەقیقیە، دەڵێیت:(قام الرجال) و(قامت الرجال).

---

[1] كلمة"غير"في أصل الكتاب جاء مع الألف واللام وهي من الموغلات في الإبهام ولا تفيدها الألف واللام تعريفا .

وَيَجِبُ تَقْدِيمُ الفَاعِلِ عَلَى المَفْعُولِ إذا كَانَا مَقْصُورَيْنِ ، وَخِيْفَ اللَّبْسُ ، نَحْوُ (نَصَرَ مُوْسَى عِيْسَى) ، وَيَجُوزُ تَقْدِيمُ المَفْعُولِ عَلَى الفَاعِلِ إذا كَانَتْ قَرِينَةٌ تُوجِبُ عَدَمَ اللَّبْسِ ، سَوَاءٌ كَانَا مَقْصُورَيْنِ ، أوْ لا ، نَحْوُ (أَكَلَ الكُمَّثْرى يَحْيَى ، وَنَصَرَ خَالداً سَعِيدٌ).

وَيَجُوزُ حَذْفُ الفِعْلِ حَيْثُ كَانَتْ قَرِيْنَةٌ ، نَحْوُ (سَعِيدٌ) فِي جَوابِ مَنْ قَالَ: (مَنْ جَاءَ؟) وَكَذا حَذْفُ الفَاعِلِ والفِعْلِ مَعاً ، نَحْوُ (نَعَمْ) فِي جَوابِ مَنْ قَالَ: (أَقَامَ زَيْدٌ؟).

**اَلقِسْمُ الثَّاني: مَفْعُولُ مَا لَمْ يُسَمَّ فَاعِلُهُ**

وَهُوَ كُلُّ مَفْعُولٍ حُذِفَ فَاعِلُهُ ، وَأُقِيمَ المَفْعُولُ مَقَامَهُ وَيُسَمَّى نَائِبَ الفَاعِلِ أَيْضاً ، نَحْوُ: نُصِرَ سَعِيدٌ. وحُكْمُهُ فِي تَوْحِيدِ فِعْلِهِ ، وَتَثْنِيَتِه ، وَجَمْعِهِ ، وَتَذْكِيرِهِ ، وَتَأْنِيثِهِ عَلَى قِياسِ مَا عَرَفْتَ فِي الفَاعِلِ.

---

ئەگەر هەرکاتێك ترسابن فاعیل و مەفعولمان لێ تێك بچێت - وەك ئەوەی کە هەردووکیان مەقصوربن - ئەوە پێویستە فاعیل ئەومیان بێت کە پێش کەوتووە، وەك:(نصر موسى عیسى)، بەڵام ئەگەر بەهۆی بوونی نیشانەیەکەوە کە بەڵگە بێت لەسەریان لێمان تێك نەدەچوو ئەوە لەم حاڵەتەدا دروستە مەفعول پێش بکەوێت ئیتر هەردوویان مەقصوربن یان نا، وەك:(اکل الکمثری یحیی) یاخود (نصر خالدا سعیدٌ).

دروستە حەزف کردنی فیعل ئەگەر نیشانە واتە قەرینە هەبوو لەسەری، وەك:(سعیدٌ) لە وەڵامی کەسێکدا کە پرسیار دەکات و دەڵێت:(من جاء؟)، بەهەمان شێوە دروستە فیعل و فاعیل پێکەوە حەزف بکرێن، وەك:(نَعَم)، لەوەڵامی کەسێکدا کە پرسیار دەکات:(ا قام زیدٌ؟).

**بەشی دووەم: مەفعولی ئەو فیعلەی کە فاعیلەکەی ناونەبراوە ( جێگری بکەر )**

ئەو مەفعولەیە کە فاعیلەکەی حەزف کرابێت و خۆی لە جێگەیدا دانرابێت، هەروەها پێیشی دەوترێت نائیب فاعیل، وەك:(نُصِرَ سعیدٌ)،واتە:سەعید سەرخرا.

حوکمەکەیشی لە ئیفراد و تەسنیە و جەمع و تەزکیر و تەئنیس کردنی فیعلەکەیدا بەو شێوەیە کە لەباسی فاعیلدا زانرا.

## اَلـخُلاصَةُ:

اَلْمَرْفُوعَاتُ مِنَ الأَسْمَاءِ ثَمَانِيَةٌ: اَلفَاعِلُ ونَائِبُ الفَاعِلِ والْمُبتَدأُ وَالخَبَـرُ وخَبَـرُ إنَّ وَأَخواتِهـا واسْم كَانَ وأَخَواتِهَا واسْمُ (مَا) و (لا) الْمُشَبَّهَتَيْنِ بِـ(لَيْسَ) وخَبَرُ (لا) الَّتِي لِنفي الجِنْسِ.

اَلفَاعِلُ:اِسْمٌ يَقَعُ بَعْدَ فِعْلٍ أَوْ شِبْهِهِ، يَقُومُ بِهِ الفِعْلُ، وَيُسْنَدُ إلَيْهِ. وَهُوَ اسْمٌ ظَاهِرٌ أوْ ضَمِيرٌ.

تَأنِيثُ الفِعْلِ: يَجِبُ تَأنِيثُ الفِعْلِ إذا كَانَ الفَاعِلُ مُؤَنَّثاً حَقِيقِيّاً أَوْ مَجازِيّاً أَو مُتَقـدِّماً عَلـى الفِعْلِ ، وَيَجُوزُ التَّأنيثُ والتَّذكِيرُ إذا كَانَ الفَاعِلُ مُؤَنَّثاً حَقِيقِيّاً مَفْصُـولاً عَـنِ الفِعْـلِ ، أَوْ مُؤَنَّثاً مَجازِيّاً.

تَقْدِيمُ الفَاعِلِ وَحَذْفُهُ: لا يَجُوزُ تَقْدِيمُ الْمَفْعولِ عَلَى الفَاعِـلِ إلاّ إذا وُجِـدَتْ قَرِينَـةٌ ، كَمَـا يَجُوزُ مَعَ القَرِينَةِ حَذْفُ الفِعْلِ ، والفَاعِلِ ، وَحَذْفُهُما مَعاً.

نَائِبُ الفَاعِلِ: مَفْعُولٌ أُقِيْمَ مَقَامَ الفَاعِلِ الَمحْذُوفِ.

---

## پوختە

ئیسمە مەرفوعەکان هەشتن: فاعیل، نائیب فاعیل، موبتەدا، خەبەر، خەبەری إن و خوشکەکانی ، ئیسمی کان و خوشکەکانی، ئیسمی ما و لا ی موشەبەهـ بە(لیس)، خەبەری لای نافیەی جنس.

فاعیل: ئیسمێکە دەکەوێتە دوای فیعل یان شیبهە فیعلێکەوە، کە بوونی فیعلەکە بەهۆی ئەوەوە بێت و دەدرێتە پاڵی، دەکرێت فاعیلەکە ئیسمێکی دیار یاخود نادیار واتە ضەمیر بێت.

تەئنیس کردنی فیعل: پێویستە فیعلەکەمان تەئنیس بکرێت ئەگەر فاعیلەکەی موئەنەسی حەقیقی یان موئەنەسی مەجازی پێشکەوتوو بوو بەسەر فیعلەکەیدا، بەڵام ئەگەر فاعیلەکەمان موئەنەسێکی حەقیقی جیاکراوە لە فیعلەکەی بوو، یاخود موئەنەسی مەجازی بوو، ئەوە هەریەکە لە تەزکیر و تەئنیس دروستە.

پێشکەوتنی فاعیل و حەزفکردنی: دروست نیە پێشکەوتنی مەفعول بەسەر فاعیل دا لە کاتێکدا نەبێت نیشانەیەکمان هەبێت لەسەری، هەروەها دروستە حەزفکردنی فیعل یان فاعیل، یاخود هەردوویان پێکەوە ئەگەر نیشانەمان هەبوو لەسەریان.

نائیب فاعیل: مەفعولێکە لە جێگای فاعیلێکی حەزفکراودا دانراوە.

## اسئلة:

١-عَدِّدِ المَرْفُوعَاتِ مِنَ الأسْمَاءِ.

٢-عَرِّفِ الفاعِلَ ، وَمَثِّلْ لَهُ.

٣-عَدِّدْ أنْواعَ الفَاعِلِ مَعَ ذِكْرِ أمثِلَةٍ لَهَا.

٤-مَتَى يُصَاغُ اَلْفِعْلُ مُفْرَداً لِلفاعِلِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٥-مَتَى يُطَابِقُ الفِعْلُ الفَاعِلَ؟ وَضِّح ذلِك بِامْثِلَةٍ.

٦-اُذكُرْ مَوَارِدَ تَأنِيثِ الفِعْلِ وَتَذْكِيرِهِ مَعَ ذِكْرِ اَمْثِلَةٍ لَهَا.

٧-مَتَى يَجُوزُ تَقْدِيمُ المَفْعُولِ عَلى الفَاعِلِ؟ وَهَل يَجُوزُ مَعَ كَوْنِهِمَا مَقْصُورَيْنِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٨-هَلْ يَجُوزُ حَذْفُ الفِعْلِ؟ وَمَتى؟ مَثِّلْ لذلِك.

٩-مَتَى يَقُومُ المَفْعُولُ مَقَامَ الفَاعِلِ؟ وَمَاذا يُسَمَّى؟ اُذكُرْ ذلِك مَعَ إيْرَادِ مِثَالٍ.

١٠-مَا هُوَ حُكْمُ نَائِبِ الفَاعِلِ في تَوْحِيدِ فِعلِهِ ، و تَثْنِيَتِهِ ، وجَمْعِهِ؟

---

## پرسیار:

١. ئیسمە مەرفوعەکان بژمێرە.

٢. پێناسەی فاعیل بکەو نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. جۆرەکانی فاعیل بژمێرە بە نموونەوە.

٤. چ کاتێك پێویستە فیعل موفرەد بێت بەهۆی فاعیلەکەیەوە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. چ کاتێك فیعل لەگەڵ فاعیلەکەی موتابیق دەبێت؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

٦. ئەو شوێنانەی کە پێویستە فیعل موزەکەر یان موئەنەس بکرێت، ڕوون بکەوە بە نموونەوە.

٧. کەی دروستە مەفعول پێش بخرێت بەسەر فاعیلدا؟ ئایا ئەمە دروستە ئەگەر هەردوویان مەقصور بن؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

٨. ئایا حەزف کردنی فیعل دروستە؟ چ کاتێك؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. چ کاتێك مەفعول لە جێی فاعیل دادەنیشێت؟ چی پێ دەوترێت؟ باسی بکە بە نموونەوە.

١٠.حوکمی نائیب فاعیل چیە لەڕوی ئیفراد و تەسنیە و جەمع کردنی فیعلەکەیەوە؟

## ڕاهێنان:

أ-فاعیل و نائیب فاعیل و مەفعول بیهی لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١-قال تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ( البقرة/١٨٣).

٢- قال تعالى: ﴿إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ (النصر /١)

٣-اُزْجُرِ المُسِيءَ بِثَوابِ المُحْسِنِ.

٤-اُحْصُدِ الشَّرَّ مِنْ صَدْرِ غَيْرِكَ بِقَلْعِهِ مِنَ صَدْرِكَ.

٥-أَدَّتْ زَيْنَبُ الصَّلاةَ.

٦-قُرِئَ الكِتَابُ.

٧-عُوقِبَ المُسِيءُ.

ب- فاعیلی ئەم ڕستانە لابە و مەفعولەکە بخەرە جێگاکەیەوە:

١-أَكَلْتُ التُّفَاحَةَ. ٢-عَلِمْتُ الخَبَرَ.

٣-جَمَعْتُ هذِهِ المَعْلُومَاتِ مِنْ كُتُبِ اللُّغَةِ. ٤-عَلَّمَنِي محمودٌ الوَاجِبَ.

ج-فاعیل یان نائیب فاعیل یان مەفعولێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەوە:

١-شُرِبَ......

٢-يَحْتَرِمُ الطَّالِبُ......

٣-كَتَبَ...... الدَّرسَ.

٤-تَعَلَّمْ...... وَعَلِّمْهُ غَيْرَكَ.

٥-تَنَزَّهَ...... فِي مُنْتَزَهِ الأُمَّةِ.

٦- قال تعالى:﴿وَإِذَا قُرِئَ.... فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾(الأعراف/٢٠٤)

٧-صَلَّى...... فِي المسْجِدِ.

## الدرس التاسع

## اَلقسمُ الثّالثُ وَالرّابعُ: المبْتَدأ وَالخبَرُ

وهُما اسْمَانِ مُجَرَّدانِ عَنِ العَوَامِلِ اللّفْظِيَّةِ ، أَحَدُهُمَا مُسْنَدٌ إِلَيْهِ وَيُسَمَّى المبَـتَـدأ ، والثّـاني مَسْنَدٌ بِهِ ، وَيُسَمَّى الخَبَرَ ، نَحْوُ (سَـعِيدٌ واقِـفٌ) ، وَعَامِـلُ الرَّفْـعِ فِيهِمَـا مَعْنَـويٌّ ، وَهُـوَ الابْتِداءُ.

وأَصْلُ الْمُبْتَدإ انْ يَكُونَ مَعْرِفَةً، وَأَصْلُ الخَبَرِ أَنْ يَكُونَ نَكِرَةً، وَالنَّكِرَةُ إذا وُصِفَتْ جَـازَ أَنْ تَقَعَ مُبْتَدَأً، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالى:﴿وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ﴾(البقرة/٢٢١)

---

## وانەی نۆیەم:

## بەشی سێیەم و چوارەم: موبتەدا و خەبەر (نیهاد و گوزارە)

دوو ئیسمن کە خاڵین لە عامیلە لەفزیەکان. واتە: زارەکیەکان. یەکەمی ئەم دووئیسمە ئیسناد بۆدراوە واتە: موسنەد ئیلەیهیە، و پێی دەوترێت موبتەدا، دووهەمیشیان ئیسناد دراوە، واتە:موسنەدە، و پێی دەوترێت خەبەر، وەك: (سعید واقف)، ئەو عامیلەی کە کاریگەری بەسەریانەوە هەیە و بووەتە هۆی مەرفوع بوونیان شتێکی لەفزی نیە و مەعنەویە [1] ، ئەو شتەش بریتیە لە لەسەرەتاوەبوون واتە ئیبتیدا [2].

ئەسڵ لە موبتەدادا ئەوەیە کە مەعریفە بێت، و لە خەبەریشدا ئەوەیە کە نەناسراو واتە نەکیرە بێت. بەڵام ئەگەر نەکیرە وەصف کرا ئەوا دروستە ببێتە موبتەدا، وەك فەرمودەی خودا:﴿ وَلَعبدٌ مُّؤمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ﴾،

---

١ مەبەست لە مەعنەوی ئەوە نیە کە شتێکی نەزانراوە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو عامیلە شتێکی لەفزی نیە و بە زمان ناوترێت ، چونکە زانایانی نەحو زۆر جار ووشەی مەعنەوی لەبەرامبەر لەفزییەوە دادەنێن .

٢ ئەم بۆچوونەی نوسەر ڕای هەندێ لە زانایانە و نزیکە لە ڕای (ابن مالك)ەوە کە خاوەنی (الفیە)یە بەڵام ئەو بەلایەوە وایە کە عامیلی مرفوع بوونی موبتەدا بریتیە لە ئیبتیدا -واتە لەسەرەتاوەبوون- و عامیلی مرفوع بوونی خەبەر بریتیە لە موبتەداکەی خۆی .

، وكَذا إذا تَخَصَّصَتْ بِوَجْهٍ آخَرَ ، نَحْوُ: أَرَجُلٌ فِي الدَّارِ أَمِ امْرَأَةٌ؟ وَمَا أَحَدٌ خَيْراً مِنكَ ، وَفَرَحٌ عَمَّ العَائِلَةَ، وَ فِي الدَّارِ رَجُلٌ ، وَسَلامٌ عَلَيْكَ. وإنْ كَانَ أَحَدُ الإسْمَيْنِ مَعْرِفَةً ، وَالآخَرُ نَكِرَةً فَاجْعَلِ المَعْرِفَةَ مُبْتَدَأً ، وَالنَّكِرَةَ خَبَراً ، كَمَا مَرَّ ، وإنْ كَانَا مَعْرِفَتَيْنِ فَاجْعَل أَيَّهُما شِئْتَ مُبْتَدَأً والآخَرَ خَبَراً ، مِثْلُ (اللهُ إلهُنا ، وآدمُ أَبُونا ، وَمُحَمَّدٌ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّمَ نَبِيُّنَا).

وَقَدْ يَكُونُ الخَبَرُ جُمْلَةً اسْمِيَّةً ، نَحْوُ (سَعِيدٌ أَبُوهُ صَائِمٌ) ، أوْ فِعْلِيَّةً ، نَحْوُ (زَيْدٌ قَامَ أَبُوهُ) ، أوْ شَرْطِيَّةً ، نَحْوُ (سَعِيدٌ إنْ جَاءَنِي فَأَكْرِمْهُ) ، أَو ظَرفِيَةً ، نَحْوُ (خَالِدٌ خَلْفَكَ ، وَسَعِيدٌ فِي الدَّارِ).

وَالظَّرْفُ يَتَعَلَّقُ بِجُمْلَةٍ عِنْدَ الأَكْثَرِ ، وَهِيَ: (اِسْتَقَرَّ) ، لأَنَّ الْمُقَدَّرَ عَامِلٌ فِي الظَّرْفِ وَالأصْلُ

---

بەهەمان شێوە ئەگەر بەهەر شێوازێکی تر تەخصیص واتە تایبەت بکرێت ، وەك:(ارجل في الدار ام امراة؟)، (ما احد خيرا منك)، (فرح عمّ العائلة)،(في الدار رجل)، (سلام عليك).

ئەگەر یەکێ لە دوونیسمەکە مەعریفە بوو و ئەوی دیکەیان نەکیرە بوو ئەوە دەبێت مەعریفەکە بکرێتە موبتەدا و نەکیرەکە بکرێتە خەبەر، وەك باسکرا، بەڵام ئەگەر هەردوویان مەعریفە بوون ئەوە هەرکامێکیان دەتوانرێت بکرێتە موبتەدا و ئەوی تریان بکرێتە خەبەر، وەك: (الله إلهنا) (آدم أبونا) (محمد ﷺ نبينا).

دەگونجێت هەندێ جار خەبەر ڕستەیەکی ئیسمی بێت، وەك:(سعيد أبوه صائم)، یاخود فیعلی بێت،وەك:(زيد قام ابوه)، یاخود ڕستەیەکی شەرتی واتە مەرجی بێت، وەك:(سعيد إن جائني فاكرمه)، یان زەرفی بێت، وەك:(خالد خلفك)، (سعيد في الدار).

لەم کاتانەشدا بەلای زۆربەی زانایانەوە، زەرفەکە پەیوەستە، واتە:موتەعەلیقە بە ڕستەیەکەوە کە بریتیە لە:(استقرّ)، چونکە ئەو ڕستە وا تەقدیر کراوە کە عامیلە لە زەرفەکەدا[1]، ئەسڵ

---

[1] واتە: زەرفەکە دەبێتە مەفعول فیهی بۆ فیعلە تەقدیر کراوەکە .

فِي العَمَلِ الفِعْلُ ، فَقَوْلُكَ (سَعِيدٌ فِي الدّارِ) تَقْدِيرُهُ (سَعِيدٌ استَقَرَّ فِي الدّارِ).
وَلا بُدَّ مِنْ ضَمِيرٍ فِي الجُمْلَةِ لِيَعُودَ إلى المُبْتَدَأ ، كـ (الهَاءِ) فِي مَا مَرَّ ، وَيَجُوزُ حَذْفُهُ عِنْدَ وُجُودِ قَرِينَةٍ ، نَحْوُ (اَللَّبَنُ الأوْقِيَةُ بِدِرْهَمٍ ، وَالحِنْطَةُ الكِيْلُو بِثَلاثَةِ دَرَاهِمَ) ، أي مِنْهُ.
وَقَدْ يَتَقَدَّمُ الخَبَرُ عَلَى المُبتَدأ إنْ كَانَ ظَرْفاً ، نَحْوُ (فِي الدَّارِ حَمِيدٌ).
وَيَجُوزُ أنْ يُؤتَى لِلمُبْتَدأ الوَاحِدِ بِأخْبَارٍ كَثِيرَةٍ نَحْوُ (سَعِيدٌ فَاضِلٌ عَالِمٌ عَاقِلٌ).

---

لە عەمەلكردنیشدا فیعلە، كەواتە: كاتێك كە دەڵێیت:(سعيد في الدار) تەقدیرەكەی بریتیە لە:(سعيد استقرَ في الدار)[1].

هەروەها پێویستە لە ڕستە خەبەریەكەدا ضەمیرێك هەبێت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ موبتەداكە، وەك (هاء) لە ڕستەكانی پێشودا –ڕستەی:(سعيد قام ابوه) و هاوشێوەكانی – ئەم ضەمیرە دروستە لا ببرێت و حەزف بكرێت ئەگەر بەڵگەیەك، واتە:قەرینەیەك هەبێت لەسەری، وەك:(اللبن الأوقية بدرهم)،(الحنطة الكيلو بثلاثة دراهم)، واتە: (الأوقية منه) و (الكيلو منه)٢.

هەندێ جار خەبەر پێش دەكەوێت بەسەر موبتەدادا ئەگەر زەرف بوو، وەك:(في الدار حميد).
دروستیشە بۆ یەك موبتەدا چەند خەبەرێك بهێنینەوە، وەك:(سعيد فاضل عالم عاقل...).

---

١ ورووژاندنی ئەم مەسەلەیە لێرەدا لەبەر ئەوەیە كاتێك كە نوسەر باس لەوە دەكات كە دەگونجێت خەبەر ڕستەیەكی زەرفی بێت ، ئەو پرسیارەمان بۆ دروست دەبێت: كە چۆن دەگونجێت لە ڕستەكەماندا هیچ فیعلێك نەبێت لەكاتێكدا بڕیاربێت هەموو زەرفێكیش تەعەللوق ببەستێت بەفیعلێكەوە؟ نوسەریش لەوەڵامدا دەستنیشانی دەكات كە ئەو فیعلە پێویستە تەقدیر بكرێت .
٢ ئەم قەرینەیەی كە لێرەدایە شتێكی لەفزی نیە ، بەڵكو بە واتای ڕستەكەدا دەردەكەوێت ، ئەویش ئەوەیە كە ئەگەر كەسێك بڵێ:(گەنم كیلۆیەك بە دینارێكە) وەك ئەوە وایە بڵێ:(گەنم كیلۆیەكی بەدینارێكە) - ئەو (ی)ە لە زمانی كوردیدا بەرامبەرە لەگەڵ (هاء)ی ضەمیردا لەزمانی عەرەبیدا – تێگەیشتنی ئەو ضەمیرەیش بەبێ ئەوەی ناو ببرێت كارێكی سادەیە و هەموو كەس هەست بە بوونی دەكات لە زمانی كوردی و عەرەبیشدا.

واعْلَمْ أنَّ لِلنُّحَاةِ قِسْماً آخَرَ مِنَ المُبْتَدَإِ ، لَيْسَ بِمُسْنَدٍ إلَيه وَهُوَ صِفَةٌ وَقَعَتْ بَعْدَ حَرْفِ النفي ، نَحْوُ (مَا رَاجِعٌ سَعِيدٌ) ، أوْ بَعْدَ حَرْفِ الاسْتِفْهَامِ نَحْوُ (أقَادِمٌ خَالِدٌ؟ وَهَلْ قَائِمٌ زَيْدٌ؟) ، وَشَرْطُهُ أنْ تَرْفَعَ تِلْكَ الصِّفَةُ اسْماً ظَاهِراً بَعْدَهُ ، نَحْوُ (مَا صَائِمٌ الرَّجُلان ، وَأصَائِمٌ الرَّجُلانِ؟) بِخِلافِ (أصَائِمَانِ الرَّجُلانِ؟) ، فَإنَّ الوَصْفَ لَمْ يَرْفَعِ الاسْمَ الظَّاهِرَ بَعْدَهُ ، وَإلاّ لَمَا جَازَ تَثْنِيَتُهُ فـ(صَائِمَان) خَبَرٌ مُقَدَّمٌ وَ (الرَّجُلان) مُبْتَدَأٌ مُؤخَّرٌ.

**الخُلاصَةُ:**

المُبْتَدَأُ وَالخَبَرُ: اِسْمَانِ تَتَألَّفُ مِنْهُمَا جُمْلَةٌ مفِيدَةٌ وَلا تَدْخُلُ عَلَيْهِمَا العَوَامِلُ اللفْظِيَّةُ.

وَلا يُبْتَدَأُ بِالنَّكِرَةِ إلاّ إذا تَخَصَّصَتْ بِوَصْفٍ أوْ نَحْوِهِ.

---

ئەوەش بزانە کە نەحویەکان جۆرێکی تر لەموبتەدایان هەیە کە موسنەد ئیلەیهی نیە، کە ئەویش بریتیە لەو وەصفەی کە بە دوای حەرفی نەفی دا بێت، وەك:(ما راجع سعيد)، یا بەدوای حەرفی ئیستیفهامدا،وەك:(اقادم خالد؟)، (هل قائم زيد؟)[1]، مەرجەکەشی ئەوەیە کە ئەو وەصفە ئیسمێکی دیار،واتە: زاهیر لە دوای خۆیەوە مەرفوع بکات، وەك:(ما صائم الرجلان)، (اصائم الرجلان؟)، ئەمە بەپێچەوانەی:(اصائمان الرجلان؟)، چونکە لێرەدا وەصفەکە ئیسمە دیارەکەی مەرفوع نەکردووە، چونکە ئەگەر ئەو مەرفوعی بکردایە دروست نەبوو بیکەینە موسەننا[2]، کەواتە (صائمان) لێرەدا خەبەرە و پێش کەوتوە، و (الرجلان) موبتەدایەو دوا کەوتووە.

**پوختە**

موبتەدا وخەبەر دوو ئیسمن پێکەوە ڕستەیەك پێك دەهێنن و عامیلی لەفزی ناچێتە سەریان.

نەکیرە ناکرێتە موبتەدا تەنها کاتێك نەبێت تەخصیص کرابێت بەهۆی وەصفێکەوە یان شتێکی وەك وەصفەوە.

---

١ لەم ڕستانەدا (راجع، قادم، قائم) کە ئیسمی فاعیلن دەبنە موبتەدا، بەلام موسنەد ئیلەیهی نین، بەڵکو ئەو ئیسمەی دوایان (سعيد، خالد، زيد) موسنەد ئیلەیهین و فاعیلن بۆ پێشەوەی خۆیان، واتە موبتەداکە خەبەری نیە، و فاعیلی هەیە کە جێگای خەبەری بۆ گرتووەتەوە.

٢ هەروەك فیعل ئەگەر لە پێشەوە بوو دەڵێین: (ايصوم الرجلان) و ناڵێین: (ايصومان).

اَلخَبَرُ: مُفْرَدٌ وَجُملَةٌ، (اِسْمِيَةٌ ، فِعْلِيَّةٌ ، ظَرفِيةٌ ، شَرْطِيَّةٌ) وَلا بُدَّ في الخَبَرِ الجُمْلَةِ مِنْ ضَـمِيرٍ يَعُودُ عَلَى المُبْتَدأِ.

وَقَدْ يَتَعَدَّدُ الخَبَرُ لِمُبْتَدَإٍ وَاحِدٍ.

وَقَدْ يَكُونُ المُبْتَدَأُ صِفَةً وَاقِعَةً بَعْد النفي وَالاسْتِفْهامِ ، رَافِعاً اسْماً ظَاهِراً بَعْدَهُ.

**اسْئلَةٌ:**

١-عَرِّفْ كُلاً مِنَ المُبْتَدإِ وَالخَبرِ ، وَمَثِّلْ لَهُمَا.

٢-مَا هُوَ المُرادُ بِالعَوَامِلِ اَللَّفْظِيّةِ؟ اِشْرَحْ ذلِك.

٣-مَا هُوَ الأَصْلُ فِي المَبتَدَإِ وَالخَبرِ؟ بَيِّنْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٤-مَتى يَجُوزُ الابْتِداءُ بِالنَّكِرَةِ؟ بَيِّنْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٥-عَدِّدْ أنْوا عَ الخَبَرِ مَعَ أمْثِلَةٍ مفِيدَةٍ.

---

خەبەر دوو جۆرە:موفرەد و ڕستە، (ئیسمی، فیعلی، زەرفی، شەرتی). پێویستیشە لە ڕستەی خەبەردا ضەمیرێك هەبێت کە بگەڕێتەوە بۆ موبتەداکە.

دەگونجێت یەك موبتەدا چەند خەبەرێکی هەبێت.

دەکرێ موبتەدا صیفەتێك بێت بەدوای نەفی یان ئیستیفهام دا هاتبێت، و بەدوای خۆیدا ئیسمێکی زاهیر مەرفوع بکات.

**پرسیار:**

١.هەریەکە لە موبتەدا و خەبەر پێناسە بکە، پاشا نموونەیان بۆ بێنەوە.

٢. مەبەست چیە لە عاملە لەفزیەکان؟ ڕوونی بکەوە.

٣. یاسای بنەڕەتی لە موبتەدا و خەبەر دا چیە لە ڕووی تەعریف و تەنکیرەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

٤. موبتەدا لە چ کاتێکدا دروستە نەکیرە بێت؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

٥. جۆرەکانی خەبەر بژمێرە و نموونەی بەسودی بۆ بێنەوە.

٦-مَتَى يَلزَمُ الضَّمِيرُ العَائِدُ فِي الخَبَرِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٧-مَتى يَجُوزُ حَذْفُ الضَّمِيرِ العَائِدِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٨-مَتَى يَجُوزُ تَقْدِيمُ الخَبَرِ عَلَى المُبْتَدإ؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ إيْرَادِ أَمْثِلَةٍ.

٩-مَا هُوَ المُبتدأ الوَصْفي ومَا هِيَ شُرُوطُهُ؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ إيْرَادِ أَمْثِلَةٍ.

١٠-هَلْ يَتَعَدَّدُ الخَبَرُ لِمُبْتَدإٍ وَاحِدٍ أمْ لا؟ مَثِّل لذلِك.

---

٦. کەی پێویستە ضەمیرێك لە خەبەرەکەدا هەبێت و بگەڕێتەوە بۆ موبتەدا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٧. کەی دروستە ضەمیرە گەڕاوەکە حەزف بکرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٨. کەی دروستە خەبەر پێش بکەوێت بەسەر موبتەدا دا ؟ ئەمە ڕوون بکەوەو پاشان نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. موبتەدای وەصف چیە؟ مەرجەکانی چین؟ ئەمە ڕوون بکەوە بە نموونەوە.

١٠. ئایا دروستە بۆ موبتەدایەك چەند خەبەرێکمان هەبێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ- لەم ڕستانەدا موبتەدا و خەبەر جیا بکەوە و جۆری خەبەرەکەش دیاری بکە:

١-اَلظُّلْمُ مَرْتَعُهُ وَخِيمٌ.

٢-الْمُؤمِنُ بِشْرُهُ فِي وَجْهِهِ.

٣-قِرَاءَةُ القُرْآنِ تَزِيدُ الإيْمَانَ.

٤-اَلطَّامِعُ فِي وَثَاقِ الذُّلِّ.

٥-اَلإيْمَانُ مَعْرِفَةٌ بِالقَلْبِ وَإقْرارٌ بِاللِّسَانِ ، وَعَمَلٌ بِالأرْكَانِ.

٦-اَلطِّفلُ يَلْعَبُ فِي البَيْتِ.

ب-موبتەدا یان خەبەرێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-اَلكِتَابُ......

٢-...... جَدِيدٌ.

٣-سَعِيدٌ......

٤-الأُسْتَاذ......

٥-اَلدَّرْسُ......

٦-...... مَوْضُوْعُهُ مفيدٌ.

٧-...... بَشُوشٌ.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-اَلْقَنَاعَةُ كَنْزٌ لا يَنْفَدُ.

٢- قَالَ رَسُولُ اللّهِ -صلى الله عليه وسلم:« الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ.. »[1].

٣-نَفَسُ المَرْءِ خُطاهُ إلى أَجَلِهِ.

٤-فَقْدُ الأَحِبَّةِ غُرْبَةٌ.

٥- اَلدُّنْيَا تَغُرُّ وتَضُرُّ وتَمُرُّ.

---

[1] اخرجه الترمذي برقم(٢٩٠٣ ) وهو حسن لغيره

## الدرس العاشر

## بَقِيَةُ المَرفُوعَات

### القِسمُ الخَامِسُ: خَبَرُ إنَّ وَأخَواتِهَا

وَهِيَ: (أنَّ ، وَكَأَنَّ ، ولَيْتَ ، ولكِنَّ ، ولَعَلَّ) ، وتُسَمَّى الحُرُوفَ المُشَبَّهَةَ بِالفِعْلِ.

وَهذِهِ الحُرُوفُ تَدْخُلُ عَلَى المُبْتَدَأ وَالخَبَرِ ، تَنصِبُ المُبْتَدَأ فيَكُونُ اسْماً لَهَا، و تَرْفَعُ الخَبَرَ ويَكُونُ خَبَراً لَهَا ، نَحْوُ (إنَّ حَمِيداً قَائِمٌ).

وَحُكْمُ خَبَرِ (إنَّ) فِي كَوْنِهِ مُفْرَداً أوْ جُمْلَةً ، مَعْرِفَةً أوْ نَكِرَةً كَحُكْمِ خَبَرِ المُبْتَدَإِ ، وَلا يَجُوزُ تَقْدِيمُهُ عَلَى اسْمِهَا إلاّ إذا كَانَ ظَرْفاً نَحْوُ (إنَّ فِي الدّارِ سَعِيداً).

---

## وانەی دەیەم

## پاشماوەی مەرفوعەكان

### بەشی پێنجەم: خەبەری (إن) و خوشكەكانی

خوشكەكانیشی بریتین لە: (أنَّ، كأنَّ، لیت، لكنَّ، لعلَّ)، پێیشیان دەوترێت (حروف مشبهة بالفعل)، واتە: حەرفە لە فیعل چوەكان.

ئەم حەرفانە دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر ، یەكەمیان كە موبتەداكەیە مەنصوب دەكەن و دەبێتە ئیسمیان، دووەمیان كە خەبەرەكەیە مەرفوعی دەكەن و دەبێتە خەبەریان، وەك:(إنَّ حمیداً قائمٌ).

حوكمی خەبەری (إنَّ) لە ڕووی ئەوەوە كە موفرەد بێت یان جوملە، مەعریفە بێت یان نەكیرە وەك حوكمی موبتەدا وایە، هەروەها دروست نیە پێشی بخەین بەسەر ئیسمەكەیدا تەنها لە كاتێكدا نەبێت كە زەرف بێت، وەك:(إنَّ في الدار سعیداً).

## القِسْمُ السَّادِسُ: اسْمُ كَانَ وَأخَواتِهَا

وَهِيَ: صَارَ ، وأَصْبَحَ ، وأَمْسَى، وَأَضْحَى ، وظَلَّ ، وبَاتَ ، وآضَ ، وعَادَ ، وغَدا، ورَاحَ ، ومَا زالَ، ومَا فتِئَ ، ومَا انفَكَّ ، ومَا دَامَ ، ولَيْسَ ، ومَا بَرِحَ ، وتُسَمَّى الأفْعَالَ النَّاقِصَةَ.
وهذِهِ الأفعالُ النَّاقِصَةُ تَدْخُلُ عَلى المُبْتَدَأ و الخَبَرِ ، فَتَرْفَعُ المُبتدأ فِيكُون اسْماً لَهَا وَتَنْصِبُ الخَبَرَ ، وَيَكُونُ خَبَراً لَهَا ، نَحْوُ (كَانَ خَالِدٌ قائماً).

وَيَجُوزُ في الكُلِّ تَقْدِيمُ أخْبَارِهَا عَلَى أَسْمائِهَا ، نَحْوُ (كَانَ قَائِماً خَالِدٌ) ، كَمَا يَجُوزُ تَقَدُّمُ أَخْبَارِهَا عَلَى نَفْسِ الأفْعَالِ مِنْ (كَانَ) إلى (رَاحَ) ، نَحْوُ (قَائِماً كَانَ سَعِيدٌ) ، ولا يَجُوزُ ذلِك فيمَا أوَّلُهُ (مَا) [1] فَلا يُقَالُ (قَائِماً مَا زالَ سَعيدٌ). وفي (لَيْسَ) خِلافٌ. وَبَاقِي الكَلامِ في هذِهِ الأفْعَالِ يَأتي في القِسْمِ الثَّاني إنْ شَاءَ اللّٰهُ تَعَالى.

---

**بەشی شەشەم: ئیسمی (كان) و خوشكەكانی (ئیسمی كارە ناتەواوەكان)**

خوشكەكانیشی بریتین لە:(صار، اصبح، امسی، اضحی، ظلّ، بات، آض، عاد، غدا، راح، مازال، مافتئ، ماانفك، مادام، لیس، مابرح)، پێیشیان دەوترێت: (الأفعال الناقصة)، واتە: كارە ناتەواوەكان.

ئەم فیعلە ناقیصانە دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر، یەكەمیان كە موبتەداكەیە مەرفوع دەكەن و دەبێتە ئیسمیان، دووەمیان كە خەبەرەكەیە مەنصوب دەكەن و دەبێتە خەبەریان، وەك: (كان خالدٌ قائما).

لەهەموو ئەم فیعلە ناقیصانەدا دروستە خەبەرەكەیان پێش بخرێت بەسەر ئیسمەكەیاندا، وەك:(كان قائما خالدٌ)، هەروەك چۆن دروستیشە خەبەرەكانیان پێش بخرێن بەسەر خودی خۆیاندا، لە (كان)ەوە تا(راح)، وەك:(قائما كان سعیدٌ)، بەڵام ئەم پێشخستنە دروست نیە لەوانەدا كە سەرەتاكەیان (ما)ی پێوەیە، كەواتە ناوترێت: (قائما مازال سعیدٌ)، لە(لیس)ـەیشدا ڕای جیاواز هەیە.

پاشماوەی قسەكردن لەبارەی ئەم فیعلانەوە لەبەشی دووەمی ئەم كتێبەدا دێت بەیارمەتی خوا.

---

١ - المقصود من ( ما ) النافية ، لا المصدرية لأن ما في : مادام مصدرية زمانية .

## اَلقِسمُ السَّابِعُ: اسمُ (مَا ، ولا) المُشبَّهَتَينِ بـ (لَيسَ)

وَهُمَا تَدْخُلانِ عَلَى المُبْتَدَأِ وَالخَبَرِ ، وَتَعْمَلانِ عَمَلَ (لَيْس) نَحْوُ (مَا زَيْدٌ قَائِماً ، لا رَجُلٌ أَفْضَلَ مَنكَ). وَتَدْخُلُ (مَا) عَلَى المَعْرِفَةِ وَالنَّكِرَةِ ، وَتَخْتَصُّ (لا) بِالنَّكِراتِ خَاصَّةً.

## اَلقِسمُ الثَّامِنُ: خبَرُ (لا) النَّافِيَةِ لِلجِنْسِ

وهِيَ تَدُلُّ عَلَى نفي الخَبَرِ عَنْ الجِنْسِ الوَاقِعِ بَعْدَهَا عَلَى سَبِيلِ الاسْتِغراقِ، نَحْوُ (لا رَجُلَ قَائِمٌ).

## اَلخُلاصَةُ:

بَقِيَّةُ المَرْفُوعاتِ:

١-اِسْمُ كَانَ وَأَخَواتِهَا (اِسْمُ الأفْعَالِ النَّاقِصَةِ). ٢-خَبَرُ إنَّ وَأخَواتِها (خَبَرُ الحُرُوفِ المُشَبَّهَةِ بِالفِعْلِ). ٣-اِسْمُ (مَا) وَ (لا) المُشَبَّهَتَيْنِ بِـ (لَيْسَ). ٤-خَبَرُ (لا) اَلنَّافِيَةِ لِلْجِنْسِ.

---

## بەشی حەوتەم: ئیسمی (ما) و (لا)ی موشەببەهـ بە (لیس)

ئەم دوانە دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر، و هەمان کاری (لیس) دەکەن، وەك:(مازيدٌ قائما)و (لا رجلٌ افضل منك)، بزانە کە (ما) دەچێتە سەر ئیسمی نەکیرە و مەعریفە، بەڵام (لا) تایبەتە بە نەکیرەوە.

## بەشی هەشتەم: خەبەری (لا)ی نافیە للجنس

ئەم (لا)یە دەلالەت دەکاتە سەر نەفی کردنی خەبەرەکە لەو ئیسمە جنسەی کە لەدوایەوە دێت بە شێوەی ئیستیغراق، واتە: تەواو و گشتگیر. وەك:(لا رجلَ قائمٌ).

## پوختە

پاشماوەی مەرفوعەکان:

١. ئیسمی (کان) و خوشکەکانی، (ئیسمی فیعلە ناقیصەکان).

٢. خەبەری (إن) و خوشکەکانی، (خەبەری حەرفە لە فیعل چوەکان).

٣. ئیسمی (ما) و (لا)ی موشەببەهـ بە (لیس)

٤. خەبەری (لا)ی نافیە للجنس.

أَسْئِلَة :

١-مَا هُوَ عَمَلُ إنَّ وأَخَوَاتِها؟ أُذكُرْهُ واذكُرْ أَخَوَاتِ إنَّ ومَثِّلْ لِكُلِّ مِنْها بِمِثَالٍ.

٢-مَا هُوَ حُكْمُ خَبَرِ إنَّ وَأَخَواتِها؟ وَضِّحْ ذلِك بِأَمثِلَةٍ.

٣-هَلْ يَجُوزُ تَقْدِيمُ خَبَرِ (إنَّ) وَأخواتِها عَلَى اسْمِهَا؟ مَثِّلْ لِمَا تَقُولُ.

٤-عَدِّدِ الأفْعَالَ النَّاقِصَةَ ، وَاذكُرْ عَمَلَهَا مَعَ أَمْثِلَةٍ مفِيدَةٍ.

٥-بَيِّنِ الفَرْقَ بَيْنَ خَبَرِ " لا " الَّتِي لِنفيِ الجِنْسِ وَ " لا " المُشَبَّهَةِ بـ (لَيْسَ) ، اشْرَحْ ذلِك بِأَمثِلَةٍ مفِيدَةٍ.

٦-هَلْ يَجُوزُ تَقْدِيمُ خَبَرِ كَانَ وَأَخَوَاتِهَا عَلَى اسْمِهَا؟ وَضِّحْ ذلِك بِأَمثِلَةٍ.

٧-مَا هِيَ الأفْعَالُ النَّاقِصَةُ الَّتِي يَجُوزُ أنْ يَتَقَدَّمَ خَبَرُهَا عَلَيْهَا؟ أُذكُرْهَا مَعَ أَمثِلَةٍ لذلِك.

---

پرسیار:

١. عەمەلی (إن) و خوشکەکانی چیە؟ عەمەلەکەی بڵێ و خوشکەکانی بژمێرە بە نموونەی بەسودەوە.

٢. حوکمی خەبەری (إن)و خوشکەکانی چیە؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

٣. ئایا دروستە خەبەری (إن) و خوشکەکانی پێش بکەوێت بەسەر ئیسمەکەیدا؟ نموونە بهێنەوە.

٤. فیعلە ناقیصەکان بژمێرە، و کاریان بڵێ لەگەڵ نموونەی بەسود.

٥. جیاوازی نێوان خەبەری (لا)ی نافیە للجنس و (لا)ی موشەببەهـ بە(لیس) چیە؟ ئەمە بەنموونەوە ڕوون بکەوە.

٦. ئایا دروستە خەبەری (کان) و خوشکەکانی پێش بخرێت بەسەر ئیسمەکەیدا؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

٧. ئەو فیعلە ناقیصانە چین کە دروستە خەبەرەکەیان پێش بکەوێت بەسەریاندا؟ بیانژمێرە لەگەڵ هێنانەوەی نموونەدا.

## ڕاهێنان:

أ-ئیسمە مرفوعەكان لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە، و جۆرەكەیان دیاری بكە:

١-لا دَرْسَ صَعْبٌ.

٢-صَارَ العَجِينُ خُبْزاً.

٣- قال تعالى: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ...﴾ (آل عمران/١٩)

٤-هذا الطَّالِبُ ذكِيٌّ وَلكِنَّهُ لَعُوبٌ.

٥-لَيْتَ الجَاهِلَ يَعْلَمُ.

٦-مَا زالَ الطَّالِبُ مُجِدّاً.

٧-لَعَلَّ أَبَاكَ مَشْغُولٌ.

ب- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بكە:

١-لا فَقْرَ كَالجَهْلِ.

٢- قالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ-: « إِنَّ الجِهَادَ بَابٌ مِنْ أَبْوابِ الجَنَّةِ عَظِيمٌ »[1].

٣-مَا بَرِحَ الإِسْلامُ يَعْلُو وَلا يُعْلَى عَلَيْهِ [2].

٤-لا رجَلٌ عائِداً.

٥- قال تعالى:﴿... وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ (فصلت/٤٦)

---

١ - اخرجه احمد برقم(٢٣٣٦٧) مطولا وهو حديث حسن

٢ - سنن الدارقطنى برقم(٣٦٦٣ )عَن عائذ بن عَمْرٍو الْمُزَنِىِّ عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ . الإِسْلاَم يَعْلُو وَلاَ يُعْلَى . وهو صحيح لغيره.

## الدرس الحادي عشر

## اَلمَقْصَدُ الثَّـانِي: اَلأَسْمَاءُ المَنْصُوبَةُ

وَهِيَ اثْنَا عَشَرَ قِسْماً:

١-المَفْعُولُ المُطْلَقُ. ٢-المَفْعُولُ بِهِ. ٣-المَفْعُولُ فِيهِ.

٤-المَفْعُولُ لَهُ. ٥-المَفْعُولُ مَعَهُ. ٦-اَلحَـالُ.

٧-التَّـمْيِيزُ. ٨-المُسْتَثْنَى. ٩-خَبَرُ كَانَ وَ أَخَوَاتِهَا.

١٠-اِسْمُ إنَّ وَ أَخَوَاتِهَا. ١١-المَنْصُوبُ بِـ (لا) الَّتِي لِنَفْيِ الجِنْسِ. ١٢-خَبَـرُ (مـا) وَ (لا) المُشَبَّهَتَيْنِ بِـ (لَيْسَ).

---

## وانەی یازدەهەم

## مەقصەدی دووەم - ئیسمە مەنصوبەکان

ئەوانیش دەبنە دوازدە بەشەوە:

١. مەفعول موتڵەق[1] ٢ . مەفعول بیهی ٣. مەفعول فیهی

٤. مەفعول لەهو ٥. مەفعول مەعەهو ٦. حاڵ

٧. تەمییز ٨. موستەسنا ٩. خەبەری (کان) و خوشکەکانی

١٠. ئیسمی (إن) و خوشکەکانی ١١. مەنصوب بە (لا)ی نافیە للجنس ١٢. خەبەری (ما) و (لا)ی موشەببەهـ بە (لیس)

---

[1] مەبەست لە موتڵەق ئەوەیە کە هیچ قەیدێکی نییە وەك مەفعولەکانی تر کە قەیدی: ( بە، لە، فیە، معە)یان پێوەیە، واتە بڕیاربووە ئەم جۆرە تەنها پێی بوترێت (مەفعول) بەڵام پاش ئەوەی ووشەی موتڵەقی زۆر بۆ بەکار هاتووە ووشەکە بۆ ئەو بووەتە قەید.

## اَلقِسمُ الأوَّلُ: المَفعُولُ المُطلَقُ

وَهُوَ مَصْدَرٌ بِمَعْنى فِعْلٍ مَذْكُورٍ قَبْلَهُ ، وَيُذْكَرُ لِلتَأْكِيدِ ، نَحْوُ قوله تعالى:﴿..وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ (النساء/١٦٤) ، وَلِبَيَانِ النَّوعِ ، نَحْوُ قوله تعالى: ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾ ( الفجر/٢٠) ، ولِبَيَانِ العَدَدِ ، نَحْوُ (جَلَسْتُ جَلْسَةً أوْ جَلْسَتَيْنِ أوْ جَلَسَاتٍ).
وَقَدْ يَكُونُ مِنْ غَيْرِ لَفْظِ الفِعْلِ ، نَحْوُ (قَعَدْتُ جُلُوساً) ، وَقَدْ يُحْذَفُ فِعْلُهُ لِقِيَامِ قَرِينَةٍ جَوَازاً ، كَقَوْلِكَ لِلقَادِمِ: (خَيْرَ مَقْدَمٍ) ، أَي قَدِمْتَ قُدُوماً فـ (خَيْرَ) اسْمُ تَفْضِيلٍ ،

---

### بەشی یەکەم: مەفعول موتلەق[1]

بریتیە لەمەصدەرێك (چاوگ) كە بە واتای ئەو فیعلە دێت كە لەپێشیەوە ناوبراوە.
ئەم مەفعولە بەكار دەهێنرێت بۆ: تەئكید كردنەوە، -جەخت كردنەوە- وەك: ﴿وكلّم الله موسى تكليما ﴾، یان بۆ: بەیانكردنی نەوع، -بەیانكردنی جۆر- وەك ﴿وتحبون المال حبا جما﴾، یان بۆ: بەیانكردنی ژمارە، وەك:(جلست جلسة)، (جلست جلستين)، (جلست جلسات).
هەندێ جار مەفعول موتلەق هاوشێوەی زاراوەی فیعلەكە نیە، وەك:(قعدت جلوسا)، هەروەها دروستە هەندێ كات فیعلەكەی حەزف بكرێت ئەگەر بەڵگەیەك هەبێت لەسەری، وەك ئەوەی بەكەسێكی هاتوو دەڵێیت:(خير مقدم)، واتە: هاتیت هاتنێك كە (خيرمقدم)بێت، لێرەدا: (خير) كە ئیسمی تەفضیلە،

---

١ لە ڕێزمانی كوردیدا شتێكم لە بەرامبەریدا دەست نەكەوت، بەڵام وادیارە هەر یەك لە جۆرەكانی لە كوردیدا شیكردنەوەی تایبەتی خۆیان هەبێت، بۆ نموونە ئەوەی كە بۆ جەختكردنەوە یان بەیانكردنی نەوع بێت پێی دەوترێت هاوەڵكاری چۆنیەتی وەك: (لێمدا بە لێدان) كە بۆ هەردوو جۆرەكە دەشێت، و ئەوەی بۆ بەیانكردنی ژمارە بێت، چاوگە و نەناسراوە و تەواوكەری كردارە، وەك : كۆبوینەوە كۆبونەوەیەك، دیارە پێویستە مەبەستمان ئەوەبێت كە كۆبوونەوەكە یەك دانە بووە، نەك مەبەست چۆنیەتی بێت.

وَمَصْدَرِيَّتُهُ بِاعْتِبَارِ المَوصُوفِ أَوْ المُضَافِ إِلَيهِ ، وهُوَ " مَقْدَم " أَوْ " قُدُوماً ".

ووُجوباً ، وهُوَ سَمَاعِيٌّ نَحْوُ (شُكْرَاً ، وَسَقْيَاً).

**اَلقِسْمُ الثَّاني: المَفْعُولُ بِه**

وَهُوَ اسْمٌ يَقَعُ عَلَيهِ فِعْلُ الفَاعِلِ ، نَحْوُ (أَكْرَمْتُ زَيْداً) وَقَدْ يَتَقَدَّمُ عَلَى الفَاعِلِ ، نَحْوُ (نَصَرَ عَمْراً زَيْدٌ) ، وَقَدْ يُحْذَفُ فِعْلُهُ لِقِيَامِ قَرِينَةٍ عَلَيْهِ:

أ-جَوازاً ، كَقَوْلِهِ تَعَالى: (خَيْراً) فِي الآيَةِ الكَرِيْمَةِ: ﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَواْ مَاذا أنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُواْ...﴾ (النحل/٣٠) أيْ: أَنْزَلَ خَيْراً.

---

مەصدەربوونی خۆی -واتە: ئەوەی کە بووەتە مەفعول موتڵەق-، لە مەوصوفەکەیەوە وەردەگرێت کە (خیر)ە، یاخود لە موزاف ئیلەیهیەکەیەوە، کە بریتیە لە (مقدم)[1].

هەندێ جار حەزف کردنی فیعلەکە پێویستە و ناکرێ ناوببرێ، بەڵام ئەمە دەبێت لە عەرەبەوە بیسترابێت، وەك:(شکرا)،(سقیا).

**بەشی دووەم: مەفعول بیهی** (بەرکار)

ئەمیش ئەو ئیسمەیە کە فیعلی فاعیلەکەی بەسەردا دەکەوێت، وەك:(اکرمت زیدا)، دەکرێ هەندێ جار پێش بکەوێت بەسەر فاعیلەکەدا، وەك:(نصر عمرا زید)، هەروەها دەکرێ فیعلەکەی حەزف بکرێت ئەگەر بەڵگە هەبێت لەسەری، ئەمەش:

ا- بە جەواز[2]، وەك:(خیرا) لەم ئایەتە پیرۆزەدا:﴿ماذا أنزل ربکم؟ قالوا خیرا﴾، واتە:(انزل خیرا).

---

١ واباش بوو نوسەر لە مەتنەکەدا لەکاتی ڕوونکردنەوەی مەفعول موتڵەق بوونەکەیدا گوتبای:(قدمت قدوما خیر مقدم) نەك بە تەنها بڵێت (قدمت قدوما)، ئەو کات ئەم دوو دێڕەی دوایی ڕوونتر دەبوو، بەهەرحاڵ مەبەستی نوسەر ئەوەیە کە: ( خیر) کەوتوەتە نێوان دوو شتەوە، کە هەردوویان بۆ ئەوە دەشێن ببنە مەفعول موتڵەق، یەکەمیان: (قدوما) کە مەفعول موتڵەقێکی تەقدیرکراوە، و (خیر) دەبێتە صیفەتی، و کەسبی مەفعول موتڵەقبوونی لێوە دەکات، دووەمیان: (مقدم) کە موزاف ئیلەیهیە بۆ (خیر) و بۆ ئەوە دەشێت مەفعول موتڵەق بێت، بەڵام (خیر) کە موزافە کەسبی مەفعول موتڵەق بوونی لێوە دەکات. جا بەهەرکام لەم دوو تەقدیرە (خیر) ئیعراب بکەین هەر مەفعول موتڵەقە.

٢ واتە دروستە و دەتوانین حەزف بکەین یان نەیکەین.

ب–وجُوبَاً ، فِي أَرْبَعَةِ مَواضِعَ: أَوَّلُهَا سَمَاعِيٌّ ، وَالبَوَاقِي قِيَاسِيَّةٌ.

اَلأَوَّلُ:نَحْوُ (امْرَأً وَنَفْسَهُ)، أَيْ دَعْهُ وَنَفْسَهُ، وَ نحو قولِهِ تعالى:﴿انتَهُواْ خَيْرًا لَّكُمْ إِنَّمَا اللّـهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾(النساء/١٧١)،أَيْ انْتَهُوا عَنِ التَّثْلِيثِ، (وَوَحِّدُوا الإلهَ)وَاقْصِدُوا خَيْراً لَكُم. و (أَهْلاً وسَهْلاً) أَيْ أَتَيْتَ قَوْمَاً اَهْلاً، وَأَتَيْتَ مَكاناً سَهْلاً، وَنَحْوُها مِمَّا اشْتُهِرَ بِحَذْفِ الفِعْلِ.

---

ب- به وجوب[1]، ئەم حاڵەتە لە چوار شوێندایە: یەكەمیان سەماعیە واتە:بیستراوە، ئەوانی تریش قیاسین، -واتە:دروستە ئێمەش لەو شێوازانە دروست بكەین- كە ئەمانەن:

یەكەم: وەك:(إمرءا ونفسه) بەواتای:(دعه إمرءا ونفسه) [2]، یاخود وەك:﴿ انتهوا خیرا لكم﴾ واتە:(انتهوا عن التثلیث ووحدوا الإله واقصدوا خیرا لكم)[3]، یاخود وەك:(أهلا وسهلا)، واتە:(اتیت قوما اهلا واتیت مكانا سهلا)[4]، ئەم شوێنانەو چەند شوێنێكی هاوشێوەیان كە بەوە ناسراون فیعلەكەیان تێدا حەزف كراوە واتە ناونەبراوە.

---

١ واتە پێویست و واجبە حەزفی بكەین و ناتوانین بیڵێین.

٢ ئەم ڕستەیە وەك ئەوە وایە لەكوردیدا بە كەسێك بڵێین واز لە كەسێكی تر بهێنێت _بۆ نموونە ئازاری ئەدات- پێی بڵێین:(ئەو بۆ خۆی) واتە: واز بهێنە لە ئەو بۆ خۆی ، كە لێرەدا ووشەی (ئەو) لەبەرامبەر ووشەی (امرء)ی عەرەبیدا دادەنێین . جێگای ئاماژە پێكردنە كە نوسەر لە ڕوون كردنەوەی ئەمەدا نوسیویەتی:(دعه ونفسه) و ئەوەی جێی مەبەستەكەیە كە بریتیە لە:(امرء) لە ڕوون كردنەوەكەدا ئاماژەی پێ نەكردووە، ئەو دەبوو لەبری ئەوەدا بیوتایە:(دعه امرءا و نفسه)، چونكە ڕوون كردنەوەكەی ئەو وا لە قوتابی دەكات كە وابزانێت مەبەستەكە لە ووشەی (نفسه)دایە ، كە مەبەست نیە، بەڵكو لێرەدا دەبێتە مەفعول مەعەهو چونكە بە دوای (واو)ی مەعییەدا هاتووە .

٣واتە:واز لە(تثلیث) بهێنن و خوا بەتاك ڕابگرن و لێی تێپەڕمەبن باشترە بۆتان. ئەوەی لێرەدا جێگای پرسیارە ئەوەیە كە بۆچی ئەوتراوە(خیرا)دەبێتە مەفعول بیهی بۆ(انتهوا)؟ وەڵامەكەش ئەوەیە كە ئەم فیعلە خۆی لازیمە و ناتوانێت مەفعول بیهی هەبێت لەبەر ئەوە ناچارین فیعلێكی تری لە مێشكی خۆماندا بۆ دانێین و تەقدیری بكەین كە گونجاو بێت لەگەڵ سیاقی ئایەتەكەدا ، تكایە سەرنج بدە .

٤ واتە : بۆ ناو كەسانێك هاتی كە كەسی تۆن و لە جێیەك لاتداوە كە جێگای ئیسراحەتە.

اَلثَّانِي: التَّحْذِيرُ ، مِثْلُ: إِيَّاكَ وَ الأَسَدَ أَصْلُهُ: قِ نَفْسَكَ مِنَ الأَسَدِ ، أَوْ تكْرارُ الْمُحَذَّرِ مِنْهُ ، نَحْوُ (اَلطَّرِيقَ اَلطَّرِيقَ) " فَالعَامِلُ فِي بَابِ التَّحْذِير هُوَ الفِعْلُ الْمُقَدَّرُ ، مِثْلُ (تَـوَقَّ ، وَاحْـذَرْ ، وَتَجَنَّبْ... الخ).

اَلثَّالِثُ: اسْمٌ أُضْمِرَ عَامِلُهُ بِشَرْطِ تَفْسِيرِهِ بِفِعْلٍ يُذْكَرُ بَعْدَهُ ، يَشْتَغِلُ ذلِك الفِعْلُ عَنْ ذلِـك الاسْم بِضَمِيرِهِ ، بِحَيْثُ لَوْ سُلِّطَ عَلَيْهِ هو أو مُناسِبُهُ لَنَصَبَهُ ، نَحْـوُ (زَيْـداً أَكْرَمْتُـهُ) فَـإِنَّ (زَيْداً) مَنْصُوبٌ بِفِعْلٍ مَحْذُوفٍ ، وهُوَ (أَكْرَمْتُ) وَيُفَسِّـرُهُ الفِعْـلُ الْمَـذْكُورُ بَعْـدَهُ ، وَهُـوَ (أَكْرَمْتُهُ). وَلِهذا البَّابِ فُرُوعٌ كَثِيرَةٌ.

---

دووهەم: تەحزیر، واتە: لەکاتی هۆشداری پێداندا، وەك:(إياك والأسد)، واتە: تۆو شێرەکە، ئەمە لە بنەڕەتدا بریتیە لە:(قِ نفسك من الأسد) واتە: خۆت بپارێزە لە شێرەکە، یان وەك دووبارە کردنەوەی ئەو شتەی کە ئاگاداریەکەی لەبارەوە دەدەین، وەك:(الطريقَ الطريقَ)، ئەوەی کە دەبێتە عامیل واتە:کاریگەر لەسەر مەفعول بیهیەکە لەم بوارەدا کە بواری تەحزیرە بریتیە لەو فیعلەی کە لە مێشکی خۆماندا بۆی دادەنێین، و تەقدیری دەکەین، وەك:(توق، إحذر، تجنب......الخ).

سێیەم: ئەو ئیسمەیە کە عامیلەکەی شاردراوەتەوە بەومەرجەی بەدوایدا فیعلێك هاتبێت و ئەو عامیلە ڕوون بکاتەوە [1]، بەم هۆیەشەوە فیعلەکە مەشغوڵ و سەرقاڵ دەبێت بە ضەمیری ئیسمەکەوە و نایپەرژێتە سەر خودی ئیسمەکە، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر ئەو فیعلە یاخود هاوشێوەکەی بخەینە سەر خودی ئیسمەکە و بیکەینە عامیل بەسەریەوە ئەوە ئەو ئیسمە مەنصوب دەکات و دەیکاتە مەفعول بیهی، وەك:(زيدا اكرمته)، لێرەدا (زيدا) مەنصوبە بە فیعلێکی حەزف کراو کە بریتیە لە:(اكرمت)، ئەم فیعلەش ڕوون کراوەتەوە بە فیعلێکی تر کە لەپاشدا هاتووە کە بریتیە لە:(اكرمته)[2]. ئەم بابەش لق زۆری هەیە و لێرەدا جێگایان نیە.

---

١ ئەم حاڵەتە لە لای نەحویەکان بە (باب الإشتغال) ناسراوە .

٢ ئەم فیعلەی دووەمیان سەرقاڵ بووە بە ضەمیرێکەوە کە(هاء)ە و دەگەڕێتەوە بۆ(زيدا)، لەبەر ئەوە ناتوانێت کار بکاتە سەر خودی (زيدا) ، لەبەر ئەوە ناچارین بڵێین (زيدا) مەنصوبە بە فیعلێکی -

## اَلـخُلاصَةُ:

المَفْعُولُ المُطْلَقُ: مَصْدَرٌ يُذْكَرُ بَعْدَ فِعْلٍ مِنْ لَفْظِهِ ، أو مِنْ غَيْرِ لَفْظِهِ تَأْكِيداً لِمَعْنَاهُ ، أوْ بَيانـاً لِنَوْعِهِ اَوْ بَياناً لِعَدَدِهِ.

المَفعُول بِهِ: إسْمٌ وَقَعَ عَلَيْهِ فِعْلُ الفَاعِلِ ، إثْبَاتاً أوْ نفياً.

حَذْفُ الفِعْلِ: يَجُوزُ حَذْفُ الفِعْلِ لِقِيَامِ قَرِينَةٍ.

أ–جَوازاً.

ب–وُجُوباً في أَرْبَعَةِ مَوَاضِعَ ، أَوَّلُها سَمَاعِيٌّ ، وَالبَواقِي قِيَاسِيَّةٌ.

---

## پوختە

مەفعول موتڵەق: مەصدەرێکە بەدوای فیعلێکدا دێت کە لە هەمان لەفزە، یاخود لە لەفزێکی تری هاوشێوەیەتی لە واتادا، بۆ ئەوەی ماناکەی تەئکید بکاتەوە، یاخود بۆ ڕوون کردنەوەی نەوع، یان ژمارەکەی.

مەفعول بیهی: ئیسمێکە کە فیعلی فاعیلەکەی بەسەردا دەکەوێت بە بوون یان نەبوون.

هەندێ جار فیعل حەزف دەکرێت ئەگەر بەڵگە هەبێت لەسەری ئەویش:

أ-بەجەواز.

ب- بە واجیبی: ئەمەش لە چوار شوێندا، کەیەکەمیان سەماعیە و ئەوانی تریش قیاسین.

---

- نادیار کە هەمان مانای (اکرمت)ی هەیە ، خۆ ئەگەر ئەم ڕاناوە نەبوایە ئەوا دەوترا (زیداً) دەبێتە مەفعول بیهی پێشکەوتوو بۆ (اکرمت) بەڵام وەك دەبینین بوونەکەی بومتە هۆی سەرقاڵی فیعلەکە لەبەر ئەوە ناتوانێت کار لە (زید)دا بکات .

## أسئلةٌ:

١-عَرِّفِ المَفْعولَ المُطْلَقَ ، وَعَدِّدْ أَنْوَاعَهُ مَع إِيْرادِ أمْثِلَةٍ لَها.

٢-مَتَى يُحْذَفُ فِعْلُ المَفْعُولِ المُطْلَقِ ؟ اِشْرَحْ ذلِك مُفَصَّلاً مَع إِيْرادِ أَمْثِلَةٍ مُوَضِّحَةٍ.

٣-مَا هُوَ المَفْعُولُ بِهِ؟

٤-مَتَى يَتَقَدَّمُ المَفْعُولُ بِهِ عَلَى الفَاعِلِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٥-مَتَى يُحْذَفُ فِعْلُ المَفعُولِ؟ أُذكُرْ ذَلِك مَعَ أمْثِلَةٍ مفيدَةٍ.

٦-عَدِّدِ الأَسْمَاءَ المَنصُوبَةَ.

٧-مَا هُوَ التَّحْذِيرُ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٨-أُذكُرِ الاشْتِغالَ ، وَ وَضِّحْ ذلِك بِمِثَالٍ.

---

## پرسیار:

١. پێناسەی مەفعول موتڵەق بکە و جۆرەکانی بژمێرە، بەنموونەوە.

٢. چ کاتێك فیعلی مەفعول موتڵەق حەزف دەکرێت؟ ئەمە بە درێژی ڕوون بکەوە لەگەڵ هێنانەوەی نموونە.

٣. مەفعول بیهی چیە؟

٤. چ کاتێك مەفعول بیهی پێش دەکەوێت بەسەر فاعیلدا؟ ئەمە بە نموونە ڕوون بکەوە.

٥. چ کاتێك فیعلی مەفعول بیهی حەزف دەکرێت؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

٦. ئیسمە مەنصوبەکان بژمێرە.

٧. تەحزیر، واتە: ئاگادار کردنەوە کامەیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨. باسی ئیشتیغال بکە، و بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان:

أ-لەم ڕستانەی خوارەوەدا مەفعولەکان دیاری بکەو جۆرەکەی بڵێ:

١- قال تعالى:﴿أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا﴾ (المزمل/٤)

٢- قال تعالى: ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾ (الفجر/٢٠)

٣-تَعَلَّمَ الطِّفلُ الصّلاةَ.

٤-أَكْرَمَنِي أَخُوكَ.

٥-اَلنَّارَ النَّارَ.

٦-أَبَاكَ أَكْرَمْتُهُ.

ب-مەفعولێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە و جۆرەکەیشی ڕوون بکەوە:

١-قَرَأَ سَعِيدٌ......

٢-...... نَعْبُدُ.

٣-اِقْرَأْ......

٤-أَدَّبْتُ الوَلَدَ......

٥-كَتَبْتُ......

٦-وَقَفْتُ...... المَدْرَسَةِ.

٧-قَعَدْتُ......

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-أَكْرِمِ العُلَماءَ. ٢-أَدَّيْتُ واجِبِي أَداءً تَامًّا.

٣-اُكْتُبِ الدَّرْسَ. ٤-قَرَأْتُ كِتَابَ النَّحْوِ.

٥-قَعَدْتُ جُلُوساً. ٦-عِشْتُ فِي بَلْدَتِكَ عِيشَةً راضِيَةً.

## الدرس الثاني عشر

### الرَّابِعِ مِمَّا يُحذَفُ فِعلُهُ وُجُوباً : المُنَادَى

وهُوَ اسْمٌ مَدْعُوٌّ بإحْدَى حُرُوفِ النِّداءِ التَّالِيَةِ: (يَا ، وأَيَا ، وهَيَا ، وأَيْ ، والهَمْزَةِ المَفْتُوحَةِ) ، نَحْوُ (يا عَبْدَ اللهِ) ، أيْ أَدْعُو عَبْدَ اللهِ. وحَرْفُ النِّداءِ قَائِمٌ مَقَامَ (أَدْعُو ، وأَطْلُبُ). وَقَدْ يُحْذَفُ حَرْفُ النِّداءِ لَفْظاً ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا﴾ (يوسف/٢٩).

### أَقْسَامُ المُنَادَى

يَنْقَسِمُ المَنَادَى إلى الأقْسَامِ التَّالِيَةِ:

١-المفْرَدُ المَعْرِفَةُ ، وَيُبْنَى عَلَى عَلامَةِ الرَّفْعِ [1] ، كَالضَّمَّةِ نَحْوُ (يَا زَيْدُ) ، وَ الألِفِ نَحْوُ (يَازَيْدان) ، والوَاوِ نَحْوُ (يَازَيْدُونَ) وَيُخفَضُ بِلامِ الاسْتِغَاثَةِ ، نَحْوُ (يَا لَزَيْدٍ) ، وَيُفتَحُ بِإلْحاقِ أَلِفِهَا ، نَحْوُ (يا زَيْداه).

---

## وانەی دوانزەهەم

### چوارەمی ئەوانەی کە فیعلەکەیان بە واجیبی حەزف دەکرێت بریتیە لە : مونادا (بانگکراو)

**موندا: ئیسمێکە بە یەکێك لە حەرفەکانی بانگ کردن بانگی لێ دەکرێت. کە بریتین لە:(یا، ایا، هیا، ای، هەمزەی مەفتوح)، وەك: (یاعبدالله). لە بانگ کردندا حەرف نیدا لە بری (ادعو) یان (اطلب) دادەنیشێت. هەندێ جار حەرف نیدا بە لەفزی ناونابرێت، وەك ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت:﴿یوسف أعرض عن هذا ﴾**

### بەشەکانی موندا

**موناداکان دابەش دەبن بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە:**

**١.مونادای موفرەدی مەعریفە: ئەم جۆرەش مەبنی دەبێت لەسەر نیشانەی ڕەفع، وەك: ضەممە لە (یازیدُ)دا، و ئەلف لە (یازیدان)دا، و واو لە (یازیدون) دا. ئەگەریش موناداکەمان لامی ئیستیغاسەی پێوە بوو ئەوە مەجرور دەبێت بەو لامە، وەك: (یالزیدِ)، بەڵام ئەگەر الفی ئیستیغاسەی پێوەبوو ئەوە مەبنی دەبێت لەسەر فەتحە، وەك:(یازیداه).**

---

[1] - وكذلكَ النكرةُ المقصودة فإنّها تبنى على ما ترفعُ به . نحو : يا بنت ادرسي

والمنادَى المَعرِفَةُ إنْ كانَ مُعرَّفاً باللام فُصِلَ بَيْنَ حَرفِ النِّداءِ بـ(أَيُّها) للمُـذَكَّرِ و (أَيَّتُهـا) لِلمُؤَنَّثِ ، فَتَقُولُ: (يا أَيُّها الرّجلُ) [1] و (يا أَيَّتُها المَرأةُ).

٢-المُضَافُ ، وَيُنْصَبُ ، نَحْوُ (يا عَبْدَ اللهِ).

٣-المُشَابِهُ لِلمُضَافِ ، وَهُوَ أَنْ يَتَّصِلَ بِهِ شَيْءٌ لا يَتِمُّ المَعْنَى إلاّ بِهِ كَمَا لا يَـتِمُّ المُضَـافُ إلاّ بالمُضَافِ إِلَيْهِ ، وحُكْمُهُ النَّصبُ ، مِثْلُ (يا حَسَناً أَدَبُهُ ، يا طَالِعاً جَبَلاً).

٤-اَلنَّكِرَةُ غَيْرُ المَقْصُودَة ، وحُكمُه النَّصبُ أيضاً مِثْلُ قَوْلِ الأعمَى: (يا رَجُلاً خُذْ بِيَدِي).

---

پاشان مونادای مەعریفە ئەگەر مەعریفە بوونەکەی بە (ال)بوو، ئەوە پێویستە (ایها) بۆ موزەکەرو (ایتها) بۆ موئەنەس بخرێتە نێوان (ال)ەکە و مونادکەوە، ئەوکاتە دەڵێیت:(یاایها الرجل)، (یاایتها المراة).

٢. مونادای موزاف: ئەم جۆرەش مەنصوب دەبێت، وەك:(یاعبدالله).

٣.مونادای شیبهە موزاف: ئەمەش ئەو جۆرەیە کە شتێکی پێوە نوسابێت کە بەو شتە نەبێت ماناکەی تەواو نابێت ، هەروەك چۆن موزاف ماناکەی تەواو نابێت بە موزاف ئیلەیهی نەبێت. حوکمی ئەم جۆرەش بریتیە لە نەصب، وەك:(یا حسنا ادبه)، (یا طالعا جبلا).

٤. مونادای نەکیرەی غەیرە مەقصودە: حوکمی ئەم جۆرەش بریتیە لە نەصب، وەك:قسەی کوێرێك کە دەڵێت:(یارجلا خذ بیدي)[2].

---

١ - ايُّهَ ، ايُّ : منادىٰ ، نكرة مقصودة مبنى على الضم وها : حرف تنبيه لا محل له من الإعراب و ( الرجل ) و ( المرأة ) عطف بيان .

٢ وەك ئاماژەی پێکردووە ئەمە قسەی کەسێکی کوێرە چونکە کوێر کەسێك نابینێت تا بە تایبەتی بانگی لێ بکات ، لەبەر ئەوە دەڵێت:(کابرا دەستم بگرە) مەبەستیشی کەسێکی دیاری کراو نیە بەڵکو هەرکەسێك گوێی لێ بێت و بڕوات بە پیریەوە ئەوە مەبەستەکە دەیگرێتەوە . هەر بۆیە پێی دەڵێن:(غەیرە مەقصودە).

## تَرْخِيمُ الْمُنادَى

وَيَجُوزُ تَرْخِيمُ الْمُنَادَى ، وَهُوَ حَذْفٌ فِي آخِرِهِ لِلتَّخْفِيفِ بِشَرْطِ أنْ يَكُونَ عَلَماً غَيْرَ مُركَّبٍ بالإِضافةِ والإسْنَادِ ، وَزَائِداً عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ ، أو مَخْتُوماً بِتَاءِ التَّأنِيثِ ، كَمَا تَقُولُ فِي يا مَالِك: يَامَالِ، وَفِي يَامَنْصُورُ:يَامَنْصُ، وَفِي ياعُثْمَانُ يا عُثْمَ، وفِي يافاطِمَةَ: يا فاطِمَ. وَ يَجُوزُ فِي آخِرِ الْمُرَخَّمِ الضَّمَّةُ أو بَقَاءُ الحَرَكَةِ الأَصْلِيَّةِ كَما تَقُولُ فِي ياحَارِثُ:(يَا حَارِ،يا حَارُ).

## المَـنْدُوبُ

وَاعْلَمْ أنَّ(يا) مِنْ حُرُوفِ النِّداءِ، وَقَدْ تُسْتَعْمَلُ فِي المَنْـدُوبِ أيضـاً، وَ هُـوَ الْمُتَفَجَّـعُ عَلَيْـهِ بِـ(يا) أوْ(وا)، وَيُقالُ (يَازَيْداه ، وَوازَيْداه) فَـ(وا) تَخْتَصُّ بِالْمَنْدُوبِ وَ (يـا) مُشْـتَرَكَةٌ بَـيْنَ النِّداءِ وَ الْمَنْدُوبِ.

---

## تەرخیم کردنی مونادا [1]

ئەوەش بریتیە لە نەووتنی چەند حەرفێك لە کۆتایی موناداوە لەبەر سوکی لەسەر زمان. دیارە ئەم جۆرە تەرخیم کردنە دروستە بەمەرجێ موناداکە عەلەم بێت، تەرکیب نەکرابێت بە ئیزافە یان بە ئیسناد، هەروەها زیاتر لە سێ حەرف بێت، یان کۆتایی بە تای تەئنیس هاتبێت، وەك ئەوەی کە لە: (یامالك)دا دەڵێیت:(یامالِ)، و لە (یامنصور)دا دەڵێیت (یامنصُ)، و لە (یا عثمان)دا دەڵێیت (یاعثمَ)، و لە (یافاطمة)دا (یافاطمَ). پاشان لە کۆتایی ئەو ئیسمەدا کە تەرخیم کراوە دروستە ضەممە دابنێین یاخود حەرەکەکەی خۆی بۆ بهێڵینەوە، وەك لە (یاحارث)دا دەڵێین (یاحارِ، یاحارُ).

## مەندوب[2] ( شین بۆکراو )

بزانە کە (یا) یەکێکە لە حەرفەکانی نیدا، بەڵام هەندێ جار بەکاردێت بۆ مەندوب. ئەویش ئەو کەسەیە شینی بۆدەکرێت بە(یا) یان(وا). بەم جۆرە دەوترێت (یازیداه) و (وازیداه)، وەك دیارە (وا) حەرفێکی تایبەتە بە مەندوبەوە، بەڵام (یا) لەنێوان هەردوویاندا هاوبەشە.

---

[1] لە ڕێزمانی کوردیدا ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی ناوی تایبەتی بچوککراوە.

[2] لە کوردیدا لە ڕیزی ناوی بانگکراودایە.

## اَلخُلاصَةُ:

اَلمَنادَى: اِسْمٌ مَدْعُوٌّ بِحَرْفِ النِّداءِ، وأَحْرُفُ النِّداء هِيَ( أ، أيْ، يَا، آ، أيَا، هَيَا، وَا ).

أَقْسَامُ المُنَادَى: ١-المُفْرَدُ المَعرِفَةُ ، وَيُبْنَى عَلَى عَلامَةِ الرَّفْعِ. ٢-المُضَافُ.

٣-المُشَابِهُ لِلمُضَافِ. ٤-اَلنَّكِرةُ غَيْرُ المَقْصُودَةِ.

وَيُنصَبُ المُنَادَى فِي الأَقْسَامِ: (٢ ، ٣ ، ٤).

تَرْخِيمُ المُنَادَى: يُرَخَّمُ المُنَادَى بِحَذْفٍ فِي آخِرِهِ لِلتَّخْفِيفِ إذا كَانَ عَلَماً غَيْرَ مُرَكَّبٍ تَرْكِيبَ إضافَةٍ اَوْ إسْنادٍ ، زَائِداً عَلَى ثَلاثَةِ أحْرُفٍ ، أَوْ مُؤَنَّثاً مَخْتُوماً بِتَاءِ التَّأنِيثِ.

اَلمَنْدُوبُ : وَهُوَ المُتَفَجَّعُ عَلَيْهِ بِـ (يا) أوْ (وا)، و (يا) مُشْتَرَكَةٌ بَيْنَ النِّدَاءِ وَ المَنْدُوبِ ، وَ (وا) مُخْتَصَّةٌ بِالمَنْدُوبِ.

---

## پوختە

موونادا: ئیسمێکە بە یەکێك لە حەرفەکانی نیدا بانگ دەکرێت.

حەرفەکانی نیدا یش بریتین لە: (أ، أي، يا، آ، أيا، هيا، وا [1]).

بەشەکانی موونادا:

١.موفرەدی مەعریفە، ئەمەش مەبنی دەبێت لەسەر نیشانەی ڕەفع. ٢.موزاف.

٣.شیبهە موزاف. ٤. نەکیرەی غەیرە مەقصودە.

بەشەکانی (٢،٣،٤) مەنصوب دەبن.

تەرخیم کردنی موونادا: موونادا بەهۆی لابردنی چەند حەرفێکی کۆتایەکەیەوە تەرخیم دەکرێت، ئەمەش لەبەر سوکبوونی لەسەر زمان، ئەگەر عەلەمێکی نامورەکەب بوو بە ئیزافە یان ئیسناد، و زیاتر بوو لە سێ حەرف، یاخود موئەنەسێك بوو کۆتایی بە (ة)هاتبوو.

مەندوب: ئەو کەسەیە کە شینی لەسەر دەکرێت بە(يا) یان (وا)، حەرفی (يا) هاوبەشە لە نێوان نیدا و مەندوبدا، بەڵام (وا) تایبەتە بە مەندوب.

---

١ لەباسی مەندوبدا نوسەر ئاماژەی بەوە دا کە( وا ) تایبەتە بە مەندوبەوە و حەرفی نیدا نیە، کەواتە باسکردنی لێرەدا نادروستە. هەروەها حەرفی (آ) کە لێرەدا هاتووە لە سەرەتای باسی نیدادا نەیهێناوە.

## أسئلة:

١-عَرِّفِ المُنادَى.

٢-مَا هِيَ حُرُوفُ النِّداءِ؟

٣-مَا هِيَ أَقْسَامُ المُنَادى؟ وَضِّحْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٤-مَتَى يُنصَبُ المُنادَى وعَلامَ يُبْنَى؟

٥-مَتَى يُنصَبُ المُنادَى؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٦-مَا هُوَ التَّرْخيمُ؟ وَمَتَى يُرَخَّمُ المُنادى؟

٧-اُذكُرِ المَنْدُوبَ ، وَمَثِّلْ لَهُ.

٨-مَا هُوَ الحَرْفُ المُخْتَصُّ بِالمَنْدُوبِ ، وَمَا هُوَ المُشْتَرَكُ بَيْنَ المَنْدُوبِ وَالنِّداءِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٩-مَا هُوَ تَقْدِيرُ المُنَادَى؟ وَكَيْفَ يُعْرَبُ فِي الأَصْلِ؟

---

## پرسیار:

١. پێناسەی مونادا بکە.

٢. حەرفەکانی نیدا بژمێرە.

٣. بەشەکانی مونادا کامانەن؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

٤. مونادا چ کاتێك مەبنی دەبێت، و لەسەر چی مەبنی دەبێت؟

٥. مونادا چ کاتێك مەنصوب دەبێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. تەرخیم چیە؟ مونادا چ کاتێك تەرخیم دەکرێت؟

٧. مەندوب چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨.حەرفی تایبەت بەمەندوب کامە؟ ئەی هاوبەشی مەندوب وموندادا کامە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. تەقدیرکردنی مونادا چیە[١]؟ و لە بنەڕەتدا چۆن ئیعراب دەکرێت؟

---

١ ئەم پرسیارە زۆر ڕوون نیە ، بەڵام وادیارە مەبەستی ئەوەیە کە حەرفی نیدا لە جێگەی چ فیعلێکدا دانراوە ، ئەگەریش ئەو فیعلەی بخەینە سەر، موناداکەمان دەبێتە چی؟ هەرچۆن بێت، دەبوایە ئەم پرسیارە بەم شێوە بوایە:(ماهو تقدیر حرف النداء؟ وکیف یعرب المنادی في الأصل؟) تکایە سەرنج بدە.

## ڕاهێنان:

أـئەم ناوانەی خوارەوە بانگ بکە:

أ–أَبٌ ، رَجُلٌ ، أخي ، المرْأةُ ، أَمِيْرُ المُؤمِنِينَ ، رَبُّ العَالَمِينَ ، الإنسان.

ب- مونادا و مەندوب لەمانەدا دیاری بکە و، جۆرەکەی، و نیشانەی بیناکەی بڵێ:

١–يَا خَيْرَ الرَّازِقِينَ ويا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ وَ يا إلهَ العالَمِينَ.

٢– قال تعالى: ﴿.. يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ..﴾ (الصافات/١٠٢)

٣–يَا رَجُلاً خُذْ بِيَدِي.

٤–واكرباهُ[1].

٥–يَا حَارِ.

٦–يَا أَبَتاه.

٧– قال تعالى:﴿ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً (٢٨)﴾ (الفجر/٢٧، ٢٨).

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١–يا غِيَاثَ الْمُسْتَغِيثِينَ.

٢– يا أَبَا عَبْدِ اللهِ اقبلْ.

٣– وا إسلاماهُ.

٤– قال تعالى: ﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ (الأنبياء/٦٩)

٥–سَعِيْدُ تَـعالَ.

---

١ - حديث صحيح مسند احمد برقم(١٢٧٦٩)عن انس قال لمّا قالت فاطمة ذلك يعنى لمّا وجد رسول اللهِ -صلى الله عليه وسلم- من كرب الموت ما وجد قالت فاطمة واكرباه. قال رسول اللهِ -صلى الله عليه وسلم- . يا بنيّة إنّه قد حضر بأبيك ما ليس اللهُ بتارك منه احدا لموافاة يوم القيامة ..

## الدرس الثالث عشر

### القِسْمُ الثَّالِثُ ، المَفْعُولُ فِيهِ

المَفْعُولُ فِيهِ: هُوَ الاسْمُ الَّذِي يَقَعُ فِيهِ مِنَ الزَّمانِ وَالمَكَانِ ، وَيُسَمَّى ظَرْفاً.

وَظَرْفُ الزَّمانِ عَلَى قِسْمَيْنِ:

١-مُبْهَمٌ ، وَهُوَ مَا لا يَكُونُ لَهُ حَدٌّ مُعَيَّنٌ نَحْوُ (دَهْرٌ ، حِيْنٌ).

٢-مَحْدُودٌ ، وَهُوَ مَا يَكُونُ لَهُ حَدٌّ نَحْوُ (يَوْمٌ ، وشَهْرٌ ، وسَنَةٌ).

وَكُلُّهَا مَنْصُوبَةٌ عَلَى الظَّرْفِيَّةِ وَتَتَضَمَّنُ مَعْنَى (فِي) تَقُولُ (صُمْتُ دَهْراً وَسَافَرْتُ شَهْراً) أَيْ : فِي دَهْرٍ ، وَفِي شَهْرٍ.

وَظَرفُ المَكانِ-كذلِك-مُبْهَمٌ، وَهُوَ مَنْصُوبٌ-أيْضاً- مِثْلُ:(جَلَسْتُ خَلْفَكَ وَأَمامَكَ).

وَمَحْدُودٌ ، وَهُوَ مَا لا يَكُونُ مَنصُوباً بِتَقْدِيرِ (فِي) ، بَلْ لا بُدَّ مِنْ ذِكرِ (فِي) مِثْلُ (جَلَسَتُ فِي الدّارِ ، وَفِي السُّوقِ ، وفِي المَسْجِدِ).

---

## وانەی سیانزەهەم

### بەشی سێیەم: مەفعول فیهی (هاوەڵکاری کاتیی)

ئەو ئیسمەیە کە فیعلەکە تیایدا ڕوودەدات کات بێت یان شوێن پێیشی دەوترێت زەرف.

زەرفی زەمان دوو جۆرە:

١.موبهەم -دیاری نەکراو-: کە بریتیە لەوەی ئەندازەیەکی دیاریکراوی نەبێت. وەك:(دهرٌ، حينٌ)

٢.مەحدود -دیاری کراو-: ئەوەیە کە ئەندازەیەکی دیاریکراوی هەبێت. وەك:(يومٌ، شهرٌ، سنةٌ).

هەردوو بەشەکەش مەنصوب دەبن لەسەر زەرفیەت، لە ناوەڕۆکیشیاندا هەمیشە مانای (في) هەیە، دەڵێیت: (صمت دهرا)، (سافرت شهراً)، واتە: (في دهرٍ)، (في شهرٍ).

زەرفی مەکانیش بەهەمان شێوە موبهەمی هەیە، کە مەنصوبە، وەك:(جلست خلفك و امامك).

و مەحدودی -سنوردار- هەیە، کە بە تەقدیرکردنی (في) مەنصوب نابێت، بەڵکو پێویستە (في)ەکە بە لەفزی بوترێت، وەك:(جلست في الدار، وفي السوق، وفي المسجد).

## اَلقِسْمُ الرَّابِعُ ، المَفْعُولُ لَهُ.

المَفْعُولُ لَهُ ، وَهُوَ اسْمٌ لأَجْلِهِ يَقَعُ الفِعْلُ المَذْكُورُ قَبْلَهُ ، وَيُنْصَبُ بِتَقْدِيرِ اللامِ ، نَحْوُ (ضَرَبْتُهُ تَأْدِيباً) أَيْ لِلتَّأدِيبِ ، وَ (قَعَدَ المُتخاذِلُ عَنِ الحَربِ جُبْناً) أَيْ لِلجُبْنِ.

## اَلقِسْمُ الخَامِسُ ، المَفْعُولُ مَعَهُ

المَفْعُولُ مَعَهُ ، مَا يُذْكَرُ بَعْدَ (وَاو) بِمَعْنى (مَعَ) لِمُصاحَبَتِهِ مَعْمُولَ فِعْلٍ ، نَحْوُ (جَاءَ البَرْدُ والمِعطفَ ، وَجِئْتُ أَنَا وَسَعِيداً) أَيْ مَعَ المِعطَفِ ، وَمَعَ سَعِيدٍ.

فَإِنْ كَانَ الفِعْلُ لَفْظاً، وَجَازَ العطف يَجُوزُ فِيهِ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ، نَحْوُ (جِئْتُ أَنَا وَزَيْدٌ وَزَيْداً) وَإِنْ لَمْ يَجُزِ العطفُ تَعَيَّنَ النَّصْبُ ، نَحْوُ (جِئْتُ وَزَيْداً) .

---

### بەشی چوارەم: مەفعول لەهو (هاوەڵکاری هۆیی)

ئیسمێکە کە فیعلە ناوبراوەکە لەپێناویدا دێتە کردن.

ئەم مەفعولەش مەنصوب دەبێت بەتەقدیرکردنی(لام) وەك: (ضربته تأديبا)، واتە: (للتأديب)، هەروەها وەك:(قعد المتخاذل عن الحرب جبنا)، واتە:(للجبن).

### بەشی پێنجەم: مەفعول مەعەهو

ئەوەیە بەدوای (واو)[1]ێکدا دێت کە بەمانای (مع)یە، بۆ ئەوەی بکرێتە هاوەڵ بۆ مەعمولی فیعلێك، وەك:(جاء البرد و المعطف)، (جئت انا و سعيدا)[2] واتە:(مع المعطف)، (مع سعيد).

ئەگەر فیعلەکە بە لەفزی دەگوترا، و عەتفیش لەسەر مەعمولەکە دروست بوو، ئەوە نەصب و ڕەفع تێیدا دروستە[3]، وەك:(جئت انا و زيد) یان(و زيدا)، بەڵام ئەگەر عەتف دروست نەبوو ئەوە پێویستە مەنصوبی بکەین، وەك:(جئت وزيدا).

---

١ ئەم واوە لەکوردیدا جۆرێکە لەئامرازی لێکدەرو سەربەخۆ نیەو حوکمی مەعتوف عەلەیهی هەیە.

٢ لەم نموونانەدا ویستراوە (معطف) بکرێتە هاوەڵ بۆ (البرد) ، هەروەها (سعيد) بکرێتە هاوەڵ بۆ (انا).

٣ واتە ڕەفع لەسەر ئەوەی کە زید عەتف کراوە و واوەکە واوی عەتفە، یاخود نەصب لەسەر ئەوەی کە واوەکە مەعیەیە و زید مەفعول مەعەهوە .

وَإنْ كَانَ الفِعْلُ مَعْنيً،وَجَازَ العطف تُعَيَّنَ العطفُ ،نَحْوُ (مَا لِسَعِيدٍ وَخالدٍ؟ وإن لم يجز العطف تعين النصب ، نحو (مالَكَ وسعيداً) و (ما شأنُكَ وعمراً) لأنّ المعنى ، ما تُصنعُ؟

**اَلخُلاصَةُ:**

المَفْعُولُ فِيهِ: اِسْمٌ يُذْكَرُ لِبَيَانِ زَمَانِ وُقُوعِ الفِعْلِ أَوْ مَكَانِهِ ، وَيُسَمَّى ظَرْفاً ، وَالظَّرْفُ – سَواءٌ كَانَ زَمَاناً أوْ مَكَاناً – عَلَى قِسْمَيْن:

مُبْهَمٍ وَمَحْدودٍ.

المفْعُولُ لَهُ: اِسْمٌ يُذْكَرُ بَعْدَ الفِعْلِ لِبَيَانِ سَبَبِ وُقُوعِهِ.

المفْعُولُ مَعَهُ: اِسْمٌ يُذْكَرُ بَعْدَ (وَاوِ) المَعِيَّةِ ـ لِيَدُلَّ عَلَى المصَاحَبَةِ.

---

ئەگەریش فیعلەکە مانا بوو و بە لەفزی نەدەگوترا، و عەتف دروست بوو، ئەوە تەنها دەبێت عەتف بکرێت و نەصب دروست نیە، وەك:(مالسعیدِ وخالدِ؟) بەڵام ئەگەر عەتف دروست نەبوو ئەوە پێویستە منصوب بکرێت، وەك:(مالك و سعیدا)،(ماشأنك و عمَرا)، چونکە لەم حاڵەتەدا ماناکەی بریتی دەبێت لە:(ماتصنع وعمرا؟)[1].

**پوختە**

مەفعول فیهی: ئیسمێکە بۆ ڕوون کردنەوەی کات یان شوێنی ڕوودانی فیعلەکە دەگوترێت، پێیشی دەوترێت زەرف، جا چ بۆ کات بێت یان شوێن دەکرێتە دوو بەشەوە: موبهەم و مەحدود

مەفعول لەهو: ئیسمێکە لە دوای فیعلەوە دەگوترێت بۆ ڕوون کردنەوەی هۆی ڕوودانی.

مەفعول مەعەهو: ئیسمێکە لە دوای (واو)ی مەعیەوە دەگوترێت، بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر هاوەڵێتی.

---

١ پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە لە ڕستەی:(جئت و زیدا) یان(مالك وسعیدا) دا عەتف دروست نیە چونکە لە عەرەبیدا ناتوانرێت ناوێکی زاهیر -دیار- لەسەر ضەمیری موتتەصیل عەتف بکرێت تاوەکو تەئکید نەکرێتەوە بە ضەمیرێکی مونفەصیل.

## أسئلة:

١-عَرِّفِ المَفْعُولَ فِيهِ.

٢-مَا هُوَ إعْرابُ المَفْعُولِ فِيهِ؟ مَاذا يُقَدَّرُ فِيهِ؟

٣-كَمْ قِسْماً يَنقَسِمُ الظَّرْفُ؟ عَدِّدْ أَقْسَامَهُ مَعَ أَمْثِلَةٍ.

٤-مَا هُوَ الظَّرفُ المُبْهَمُ؟ وَمَا هُوَ المَحدُودُ؟

٥-مَا هِيَ ظُرُوفُ المَكانِ الَّتِي يَجِبُ ذِكْرُ حَرْفِ (فِي) قَبْلَهَا؟

٦-عَرِّفِ المَفْعُولَ لَهُ.

٧-مَاذا يُقَدَّرُ فِي المَفْعُولِ لَهُ؟

٨-مَا هُوَ المَفْعُولُ مَعَهُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٩-مَتى يَتعَيَّنُ النَّصْبُ فِي اَلْمَفعُولِ مَعَهُ؟ وَمَتَى يَجُوزُ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ؟

---

## پرسیار:

١. پێناسەی مەفعول فیهی بکە.

٢.چۆن مەفعول فیهی ئیعراب دەکرێت؟ چی تێدا تەقدیر دەکرێت؟

٣.زەرف دەبێتە چەند جۆر؟ جۆرەکانی بژمێرە لەگەڵ نموونەدا.

٤.زەرفی موبهەم چیە؟ ئەی مەحدود؟

٥. ئەو زەرفی مەکانە کامەیە کە پێویستە لە پێشیەوە (فی) بگوترێت؟

٦. پێناسەی مەفعول مەعەهو بکە.

٧. لە مەفعول لەهو دا چی تەقدیر دەکرێت؟

٨. مەفعول مەعەهو چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. چ کاتێك تەنها نەصب دروستە لە مەفعول مەعەهو دا؟ ئەی چ کاتێك ڕەفع و نەصب دروستە؟

## ڕاهێنان:

أ- لەم ڕستانەدا مەفعولەكان دەربهێنە و جۆرەكەيان بڵێ:

١-جِئْتُ يَومَ الجُمُعَةِ.

٢-وَقَفَ المُدَرِّسُ أَمَامَ الطُّلابِ.

٣-يَلْعَبُ الطُّلابُ فِي سَاحَةِ المَدْرَسَةِ.

٤-وَضَعْتُ الكُرْسِيَّ فَوْقَ المِنْضَدَةِ.

٥-وَقَفْتُ احْتِراماً لأَبِي.

٦-أَعْطَيتُ الفَقِيرَ رَأْفَةً بِهِ.

٧-كَيْفَ حَالُك وَالحَوادِثَ.

٨-جِئْتُ أَنَا وَخَالِداً.

٩-دَرَسْتُ وَخَالِداً.

١٠-وَقَفْتُ وَراءَ المَنَصَّةِ.

ب-لەم ڕستانەى خوارەوەدا واوى مەعيە و واوى عەتف لەيەكدى جيا بكەرەوە و سەرو ژێرى ڕستەكانيش ديارى بكە:

١-لا تَأْكُلِ البِطِّيخَ وَالعَسَلَ.

٢-ذَهَبَ الوَلَدُ وَأَبُوهُ.

٣-اُكْتُبْ وَأَخَاكَ.

ج- مەفعولێكى گونجاو بخەرە ئەم بۆشاييانەى خوارەوە:

١-أَكْرَمْتُ...... لِكِبَرِهِ.

٢-خَرَجْتُ وَ......

٣-وَقَفْتُ...... البَابِ.

٤-رَأَيْتُ أبي......

٥-قُمْتُ...... لِلمُعَلِّمِ.

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-صُمْتُ قُرْبَةً إلى اللهِ.

٢-تَصَدَّقْ يَوْمَ الجُمُعَةِ.

٣-صَلَّيْتُ فِي المَسْجِدِ.

٤-اِتَّقُوا مَعَاصِيَ اللهِ فِي الخَلَوات.

٥- قال تعالى:﴿إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا..﴾ (الحديد/١٨)

## الدرس الرابع عشر

## اَلقسمُ السَّادسُ – اَلحَالُ

اَلحَالُ: لَفظٌ يَدُلُّ عَلَى بَيَانِ هَيْئَةِ الفَاعِلِ، أوِ المَفْعُولِ بِهِ، أوْ كِلَيْهِمَا، مِثْلُ (جَاءَني حَمِيدٌ رَاكِباً وَاسْتَقْبَلْتُ سَعِيداً فَارِساً ، وَلَقِيْتُ حَمِيداً رَاكِبَيْنِ) ، وَالعَامِلُ فِي الحَالِ هُوَ فِعْلٌ لَفْظاً ، مِثْلُ (رَأَيْتُ سَعِيداً راكِباً) ،أوْ مَعْنىً ، مِثْلُ (زِيدٌ فِي الدّار قَائِماً) فَإِنَّ مَعْنَاهُ أُنَبِّهُ وَأُشِيرُ إلى زَيْدٍ حَالَ كَوْنِهِ قَائِماً.

وَقَدْ يُحْذَفُ العَامِلُ لِقَرِينَةٍ كَمَا تَقُولُ لِلمُسَافِرِ: (سَالِماً غَانِماً) ، أَيْ تَرْجِعُ سَالِماً غَانِماً.

---

## وانەی چواردەهەم

## بەشی شەشەم: حالْ ( هاوەڵکاری چۆنیەتی )

حالْ: ووشەیەکە دەلالەت دەکاتە سەر ڕونکردنەوەی هەیئەتی فاعیلەکە یان مەفعول بیهیەکە یان هەردووکیان[1]. وەك: (جاءني حميد راكبا) (استقبلت سعيدا فارسا) (لقيت حميدا راكبين).

پاشان عامیل لە حاڵدا بریتیە لە فیعلێکی لەفزی واتە گوتراو، وەك:(رايت سعيدا راكبا)، یان مانا فیعلێك، وەك:(زيدٌ في الدار قائما)[2]،(هذا زيدٌ قائما)، بەمانای: (انبه واشير الى زيد حال كونه قائما) ، واتە: هۆشداری دەدەم و ئاماژە دەکەم بۆ زەید لە حاڵێکدا کە بە پێوەیە.

هەندێ جار دەکرێت عامیلەکە حەزف بکەین ئەگەر قەرینە، واتە:بەڵگە هەبێت لەسەری، وەك ئەوەی بە کۆچکەرێك دەڵێیت:(سالما غانما)، مەبەستت ئەوەیە کە بڵێیت:(ترجع سالما غانما)[3].

---

١ نوسەر بەم شێوەیە پێناسەی حاڵی کردووە ، بەڵام لە ڕاستیدا حاڵ خۆی شێوەی فاعیل یان مەفعول بیهی، یان هەردوکیان ڕوون دەکاتەوە ، نەك دەلالەت دەکاتە سەر ڕوون کردنەوەکە، باشتر وابوو هەروەك لە کورتەکەدا ووتویەتی - بیوتایە:(لفظ يبين هيئة الفاعل.... الخ). تکایە سەرنج بدە .

٢ ئەم نموونەیەیان مانای فیعلەکە لە حەرفی جەرەکەوە وەردەگرین ، کە تەعەللوق دەبەستێت بە فیعلێکەوە بە مانای (إستقر) یان ناوێکی موشتەقەوە وەك:(مستقر) .

٣ لە زمانی عەرەبیدا لەبری ئەوەی پێی بڵێیت:(بەسەلامەتی و دەسکەوتەوە بگەڕێیەوە)، پێی دەڵێیت: (بەسەلامەتی و دەسکەوتەوە) بەم شێوەیە فیعلەکە لادەبەیت ، کە ئەویش بریتیە لە:(بگەڕێیەوە) .

وَالحَال نَكِرَةٌ أَبَداً ، وَذوُ الحَالِ مَعْرِفَةٌ غَالِباً ، كَمَا رَأَيْتَ فِي الأَمْثِلَةِ ، فَإنْ كَانَ ذو الحَالِ نَكِرَةً وَجَبَ تَقْدِيمُ الحَالِ عَلَيْهِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي رَاكِباً رَجُلٌ) ، لِئَلاّ يَلْتَبِسَ بِالصِّفةِ فِي حَالَةِ النَّصْبِ فِي قَوْلِكَ (رَأَيْتُ رَجُلاً رَاكِباً).

وَقَدْ يَكُونُ الحَالُ جُمْلَةً خَبَرِيَّةً، نَحْوُ(جَاءَنِي زَيْدٌ وَغُلامُهُ رَاكِبٌ) و(رَأَيتُ سَعِيداً يَركَبُ فَرَسَهُ).

**الخُلاصَةُ:**

اَلحَالُ: لَفْظٌ يُبَيِّنُ هَيْئَةَ الفَاعِلِ ، أَوِ المَفْعُولِ ، أوْ كِلَيْهِمَا.

عَامِلُ الحَالِ: لابُدَّ لِلحَالِ مِنْ عَامِلٍ ، وَهُوَ إمَّا فِعْلٌ لَفْظاً ، أوْ مَعْنًى، وَقَدْ يُحْذَفُ العَامِلُ لِوُجُودِ قَرِيْنَةٍ. وَالحَالُ نَكِرَةٌ دائِماً ، وَذو الحَالِ مَعْرِفَةٌ غَالِباً.

---

حاڵ هەمیشە نەكیرەیە، خاوەن حاڵیش –ذوالحال- زۆربەی جار مەعریفەیە، وەك لە نموونەكاندا بینیت، جا ئەگەر خاوەن حاڵ نەكیرە بوو، ئەوە پێویستە حاڵەكە پێش بخرێت بەسەریدا، وەك:(جاءني راكبا رجل)، ئەمەش بۆ ئەوەیە كە تێكەڵ نەبێت لەگەڵ صیفەت دا لە كاتی نەصب دا، وەك: (رايت رجلاً راكبا).

دەكرێ هەندێ جار حاڵەكەمان ڕستەیەكی خەبەری بێت، وەك: (جاءني زيد وغلامه راكب)، (رايت سعيداً يركب فرسه).

**پوختە**

حاڵ: ووشەیەكە شێوەی فاعیل یان مەفعول یان هەردوویان ڕوون دەكاتەوە.

عامیل لە حاڵدا: پێویستە حاڵ عامیلێكی هەبێت، ئەویش دەبێت یان فیعلێكی بەلەفز گوتراو بێت، یان مانا فیعلێك بێت. هەندێ جاریش عامیل حەزف دەكرێت ئەگەر بەڵگەمان هەبوو لەسەری. حاڵیش هەمیشە نەكیرەیە، و خاوەن حاڵیش زۆربەی جار مەعریفەیە.

## أسئلة:

١-عَرِّفِ الحَالَ ، وَمَثِّلْ لَهُ.

٢-مَا هُوَ العَامِلُ فِي الحَالِ؟ اُذكُرْ أنْواعَهُ مَعَ إيْرادِ أَمْثِلَةٍ.

٣-كَيْفَ تَكُونُ الحَالُ أَبَداً ، وَذُو الحَالِ غَالِباً؟

٤-مَتى يَجِبُ تَقْدِيمُ الحالِ عَلى صاحِبِ الحالِ؟

٥-هَاتِ جُملَةً فِيهَا الحَالُ جُمْلَةٌ.

٦-مَتَى يُحْذَفُ العَامِلُ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثَال.

---

## پرسیار:

١. پێناسەی حاڵ بکەو نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. عامیل لە حاڵدا چیە؟ جۆرەکانی بڵێ بە نموونەوە.

٣. حاڵ دەبێت هەمیشە چۆن بێت، و خاوەن حاڵ زۆربەی جار دەبێت چۆن بێت؟

٤. چ کاتێك پێویستە حاڵ پێش بخرێت بەسەر خاوەن حاڵدا؟

٥. ڕستەیەك بهێنەوە کە حاڵ تێیدا ڕستە بێت.

٦. چ کاتێك عامیل حەزف دەکرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

## ڕاهێنان:

أ- حاڵ، و خاوەن حاڵ، و عامیل لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیاری بکە:

١-وَقَفَ المُذْنِبُ خَائِفاً.

٢-تَكَلَّمَ خَالِدٌ فِي دَائِرَتِهِ جَالِساً.

٣-هذا محمودٌ واعِظاً.

٤-جَاءَ الأبُ والابْنُ رَاكِبَيْنِ سَيَّارَةً.

٥-خَرجَ المُعَلِّمُ راضِياً عَنِ الطّلاّبِ.

٦–جَاءَ الطَّالِبُ وَكِتَابُهُ مَفْقُودٌ.

٧–رَأَيْتُ النَّاسَ وَهُمْ يَرْكُضُونَ.

**ب-وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە:**

**١-سێ ڕستە بهێنەوە کە عامیلی حاڵەکە تێیاندا لەفزێکی دیار بێت.**

**٢-سێ ڕستە بهێنەوە کە عامیلی حاڵەکە تێیاندا مانا فیعل بێت.**

**٣-سێ رستە بهێنەوە کە حاڵەکە تێیاندا ڕستە بێت.**

**ج- حاڵێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:**

١–جَاءَ أَبِي......

٢–رَأَيْتُ الأُسْتَاذ......

٣–وَجَدْتُ القَوْمَ......

٤–هذا سَعِيدٌ......

٥–هَلْ جَاءَكَ...... رَجُلٌ.

**د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:**

١– قال تعالى:﴿.. وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ (المائدة/٥٥).

٢–ذَهَبْتُ وَسَعِيداً مَاشِيَيْنِ.

٣–جَاءَ سَعِيدٌ فَرِحاً.

٤–هذا سَعِيدٌ قَارِئاً.

٥–رَأَيْتُ الأَصْدِقَاءَ مُسْتَبْشِرِينَ.

٦–جاءَ التِلْمِيذُ مُسْرِعاً إلى الصّفِ.

## الدرس الخامس عشر

## اَلقسمُ السَّابعُ – التَّمييزُ

اَلتَّمْيِيزُ: اِسْمٌ نَكِرَةٌ يُذْكَرُ بَعْدَ مِقْدارٍ أَوْ كَيْلٍ أَوْ وَزْنٍ أَوْ مِسَاحَةٍ أَوْ غَيْرَ ذلِك مِمَّا فِيهِ إِبْهامٌ ، لِيَرْفَعَ ذلِك الإِبْهَامَ ، مِثْلُ (عِنْدِي عِشْرُون كتاباً ، وَقَفِيزان بُرّاً ، وَمَنَوَان سَمْناً ، وَجَرِيبَان قُطْناً ، وَمَا فِي السَّمَاءِ قَدَرُ رَاحَةٍ سَحَاباً ، وعَلَى التَّمْرَةِ مِثْلُهَا زُبْداً).

وَقَدْ يَكُونُ مِنْ غَيْرِ مِقْدارٍ ، نَحْوُ (عِنْدِي سِوارٌ ذَهَباً ، وَهذا خاتَمٌ حَدِيداً) ، وَالخَفْضُ فِيهِ أَكْثَرُ ، مِثْلُ (خَاتَمُ حَدِيدٍ). وَقَدْ يَقَعُ التَّمْيِيزُ بَعْدَ الجُمْلَةِ ، لِيَرْفَعَ الإِبْهَامَ عَنْ نِسْبَتِها نَحْوُ (طَابَ زَيْدٌ عِلْماً ، أَوْ أَباً ، أَوْ خُلُقاً).

### اَلخُلاصَةُ:

اَلتَّمْيِيزُ: اِسْمٌ نَكِرَةٌ يُرْفَعُ بِهِ الإِبْهَامُ عَنِ المُفْرَدِ أَوِ النِّسْبَةِ.

---

## وانەی پانزەهەم:

## بەشی حەوتەم: تەمییز[1] ( جیاکەرەوە )

تەمییز: ئیسمێکی نەکیرەیە پاش ئەندازە یان ژمارە یان کێشانە یان پێوانە یان ڕووبەر یان شتانێکی هاوشێوەی ئەمانە کە ناڕوونیەکیان تێدایە، دەگوترێت بۆ ئەوەی ئەو ناڕوونیە لاببات. وەك: (عندي عشرون كتابا، وقفيزان برا، ومنوان سمنا، وجريبان قطنا)، (مافي السماء قدر راحة سحابا)، (على التمرة مثلها زبدا).

دەگونجێت تەمییز شتێکی تر ڕوون بکاتەوە کە ئەندازە نەبێت، وەك:(عندي سوار ذهبا)، (هذا خاتمٌ حديدا)، بەڵام لەم شوێنانەدا زیاتر مەجرور دەکرێت، و دەگوترێت:(خاتمُ حديدٍ).

هەندێ جار تەمییز لە پاش ڕستەوە دێت، بۆ ئەوەی ئەو ناڕوونیەی کە لە نیسبەتەکەیدایە لای ببات، وەك:(طاب زيدٌ علما، او ابا، او خلقا).

### پوختە

تەمییز: ئیسمێکی نەکیرەیە ناڕوونی لادەبات لەسەر موفرەد یان نیسبەت.

---

[1] لە ڕێزمانی کوردیدا جۆرێکە لە ناوی دەستنیشانکراو بە ناوەڵناو.

## أسئلة:

١-عَرِّفِ التَّمْيِيزَ ، وَمَثِّلْ لَهُ.
٢-بَعْدَ مَاذا يُذْكَرُ التَّمْيِيزُ؟
٣-هَلْ يَأتِي التَّمْيِيزُ بَعْدَ جُمْلَةٍ؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ أَمْثِلَةٍ.
٤-عدِّدِ المُبهَماتِ أو المُمَيِّزاتِ ومَثِّلْ لَهَا.

---

## پرسیار:

١. پێناسەی تەمییز بکە، و نموونەی بۆ بێنەوە.
٢. تەمییز بۆچی دەگوترێت؟
٣. ئایا تەمییز لەپاش ڕستەوە دێت؟ ئەمە ڕوون بکەوە بەنموونەوە.
٤. نارِوونەکان یان ئەوانەی تەمییزیان پێویستە بژمێرە، و نموونەیان بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ- لەم ڕستانەی خوارەوەدا تەمییزەکان و مومەییەزەکان، واتە:ڕوون کراوەکان دیاری بکە:

١-اِشْتَرَيْتُ خَاتَمَ فِضَّةٍ.
٢-لَدَيَّ قَلَمُ حِبْرٍ.
٣-زَارَنِي عِشْرُونَ صَدِيقاً.
٤-وَجَدْتُ أَحَدَ عَشَرَ كِتَاباً مُفِيداً.
٥-عِنْدِي مَنَوان [١] عَسَلاً.
٦-هذا سَلِيمٌ نَفْساً.

---

١ - المن الكَيْلُ أو الميزانُ الذي يُوزَنُ به بفتح الميم مقصور يكتب بالألف والمكيال الذي يكيلون به السمن وغيره وقد يكون من الحديد أوزاناً وتثنيته منَوانِ " لسان العرب - (ج ١٥ / ص ٢٩٢)

ب- پێنج ڕستەی بەسود بێنەوە کە تێیاندا تەمییزەکە بۆ یەکێك لەم ئەندازانە بێت: ١. وەزن ٢.قیاس ٣.عەدەد ٤. مەساحە ٥.کەیل

ج- دوو ڕستە بێنەوە کە تێیاندا تەمییزەکە بۆ ڕوونکردنەوەی نیسبەت بێت.

د- تەمییزێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-جَاءَ خَمْسُونْ......

٢-إني رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ......

٣-طَابَ محمَّدٌ......

٤-عِنْدِي سِوارٌ مِنْ......

٥-اِشْتَرَيْتُ سِتِّينَ......

هـ- مومەییەزێکی (ڕوونکراوە) گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-لَدَيَّ...... مِنْ ذهَبٍ.

٢-اِشْتَرَيْتُ...... شَعِيراً.

٣-...... خُلُقاً.

٤-عِنْدِي...... أَرُزّاً.

٥-اِستَعَرْتُ...... كِتَاباً مِنْ أَخِي.

و-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-سَعِيدٌ طَيِّبٌ عَشِيرَةً.

٢-عِنْدِي ثلاثُونَ دفْتَراً.

٣-هذا سِوارٌ ذهَباً.

٤-لَدَيَّ خَاتَمٌ مِنْ فِضَّةٍ.

٥-كَرُمَ عَلِيٌّ أَدَباً.

## الدرس السادس عشر

## اَلقِسمُ الثَّامِنُ – المُستَثنى

المُستَثنى ، لَفظٌ يُذكَرُ بَعدَ (إلاّ) وَأَخَوَاتِهَا ، لِيُعلَمَ أَنَّهُ لا يُنسَبُ إلَيهِ مَا يُنسَبُ إلى مَا قَبلَهَا.

وَالمُستَثنَى عَلَى قِسمَينِ:

١–مُتَّصِلٌ: وَهُوَ مَا كَانَ مِنْ جِنسِ المُستَثنَى مِنهُ . مِثلُ (جَاءَني القَومُ إلاّ زَيداً).

٢–مُنقَطِعٌ: وَهُوَ مَا لا يَكُونُ المُستَثنى مِنْ جِنسِ المُستَثنى مِنهُ. مِثلُ (جَاءَ المُسافِرُونَ إلاّ أَمتِعَتَهُمْ).

إعرابُ المُستَثنى: إعْرابُ المُستَثنَى عَلَى أنواعٍ:

أ–اَلنَّصبُ ، وَيَكُونُ فِي أَربَعَةِ مَواضِعَ كَمَا يَلِي:

---

## وانەی شانزەهەم

## بەشی هەشتەم: موستەسنا[1]

موستەسنا: لەفزێکە بەدوای (إلا)و خوشکەکانیدا دێت، بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئەوەی نیسبەت دراوەتە پاڵ پێشەوەی نیسبەت نادرێتە پاڵ ئەم. موستەسناش دووجۆرە:

١.موتتەصیل -پەیوەست-: ئەوەیە کە موستەسناکە لە جینسی موستەسنا مینهو بێتە وەك:(جائني القوم إلا زيداً).

٢-مونقەطیع - پچڕاو-:ئەوەیە کە موستەسناکە لە جینسی موستەسنا مینهو نەبێت، وەك:(جاء المسافرون إلا أمتعتهم)[2].

ئیعرابی موستەسنا: موستەسنا چەند جۆرێك ئیعرابی هەیە:

أ-نەصب: ئەمەش لە چوار شوێندایە بەم شێوەیە:

---

١ لە ڕێزمانی کوردیدا ئەداتی ئیستیسنا جۆرێکە لەئامرازی لێکدەرو موستەسناکەش حوکمی موستەسنا مینهوەکەی هەیە، واتە ئەگەر ئەو فاعیل بوو ئەمیش فاعیلە و ئەگەر مەفعول بوو ئەمیش مەفعولە و .. هتد

٢ لەو دوو نموونەیەدا (زيد) لە جینسی قەومەکەیە و کەلوپەلەکان لە جینسی موسافیرەکان نین.

١-المُسْتَثْنَى المُتَّصِلُ التَّامُّ المُوجَبُ (بِأَنْ لا يَكُونَ فِي الكَلامِ نَفْيٌ ، ولا نَهْيٌ ، وَلا اسْتِفْهَامٌ) وَيَكُونُ المُسْتَثْنَى مِنْهُ مَذْكُوراً مِثْلُ (جَاءَ القَوْمُ إلاّ سَعِيداً).

٢-المُسْتَثْنَى المُنْقَطِعُ ، مِثْلُ (رَأَيْتُ المُسَافِرِيْنَ إلاّ أمْتِعَتَهُمْ).

٣-المُسْتَثْنَى المُتَقَدِّمُ عَلَى المُسْتَثْنَى مِنْهُ ، مِثْلُ (مَا جَاءَنِي إلاّ أَخَاكَ أَحَدٌ).

٤-المُسْتَثْنَى بِـ (عَدَا ، وَخَلاَ) عَلَى الأَكْثَرِ وَ بِـ (مَا خَلا ، ومَا عَدا ، وَلَيْس ، وَلا يَكُوْنُ) مِثْلُ (كَتَبَ الطّلاّبُ الدَّرْسَ عَدَا حامِداً ، وَمَا خَلا حامِداً).

ب-جَوازُ النَصْب وَالإِتْبَاعِ عَلى البَدَلِيَّة.

وَذلِك إذا كَانَ المُسْتَثْنَى فِي كَلامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ ، وَالمُسْتَثْنى مِنْهُ مَذْكُوراً ، مَثَلُ (مَا جَاءَ أحدٌ إلاّ سَعِيداً ، وَإلاّ سَعِيدٌ) فَيَجُوزُ فِيهِ النَّصْبُ عَلَى الاسْتِثْنَاءِ والإتْبَاعُ عَلَى البَدَلِيَّةِ.

---

١. موستەسنای موتتەصیلی تامی موجەب -واتە: ئەو موستەسنایەی کە پەیوەست و تەواو و موجەبە- واتە: لە ڕستەکەدا (نهي) و(نفي) و(استفهام) نەبێت، پاشانیش موستەسنا مینهو ناوبرابێت، وەك: (جاء القوم إلا سعيدا).

٢. موستەسنای مونقەتیع، -واتە: پچڕاو-: وەك:(رايت المسافرين إلا امتعتهم).

٣.موستەسنایەك کە پێش کەوتبێت بەسەر موستەسنا مینهوەکەدا، وەك:(ماجائني إلا أخاك احدٌ).

٤.موستەسنا بە (عدا) و (خلا) بە زۆری و بە (ماخلا) و (ماعدا) و (ليس) و (لايكون)، وەك:(كتب الطلاب الدرس عدا خالدا، وماخلا خالدا).

ب- جەوازی نەصب و ئیتباع لەسەر بەدەلیەت: -واتە: دروستی مەنصوب کردنی یان کردنی بە تابیعێکی وەك بەدەل-.

ئەمەش ئەگەر موستەسناکە لە قسەیەکدا بێت موجەب نەبێت، و موستەسنا مینهوەکەش ناوبرا بێت، وەك:(ماجاء أحد إلا سعيداً، و إلاّ سعيدٌ)، کە مەنصوب کردنی لەسەر ئیستیسنا دروستە، یاخود کردنی بە بەدەل و شوێنکەوتەی پێش خۆی.

ج-اَلإعْرابُ حَسْبَ العَوامِلِ.

وذلِك إذا كَانَ الُمسْتَثْنَى مُفرَّغاً ، بأَنْ يَكُونَ بَعْدَ (إلاّ) فِي كَلامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ ، والُمسْتَثْنَى مِنهُ غَيْرَ مَذْكورٍ ، تَقُولُ: (مَا جَاءَنِي إلاّ سَعِيدٌ ، وَمَا رَأيتُ إلاّ سَعِيداً ، وَمَا مَرَرْتُ إلاّ بِسَعِيدٍ).

وَإنْ كَانَ الُمسْتَثْنَى بَعْدَ (غَيْر ، وَسِوى ، وَسَواء ، وَحَاشَا) كَانَ مَجْرُوراً عِنْدَ الجَمِيعِ فِي (غَيْر وسِوى وَسَواء) وفِي (حَاشَا) عِنْدَ الأكْثَرِ نَحْوُ جَاءَنِي القَوْمُ غَيْرَ مَجِيدٍ ، وَسِوى مَجِيدٍ وَحَاشَا مَجِيدٍ.

**إعْرابُ لَفْظ (غَيْر):**

يُعْرَبُ (غَير) إعْرابَ الُمسْتَثْنَى بِـ(إلاّ) تَقُولُ: (جَاءَنِي القَومُ غَيْرَ زَيْدٍ ، وَغَيْرَ حِمَارٍ ، وَمَا جَاءَنِي أحَدٌ غَيْرَ سَعِيدٍ ، وَمَا رَأَيْتُ غَيْرَ سَعِيدٍ ، وَمَا مَرَرْتُ بِغَيْرِ (سَعِيدٍ).

---

**ج- ئیعرابکردنی بەپێی عەوامیل -واتە: ئیعراب کردنی بە پێی ئەو عاملەی کە پێشی کەوتوە-:**

ئەمەش ئەگەر موستەسناکەمان موفەرەغ بێت، بەو شێوەیەی کە لەپاش (الا)وە بێت و لە ڕستەیەکدا بێت کە موجەب نەبێت، و موستەسنا مینهوەکەش ناونەبرابێت، وەك: (ماجاءني الا سعيدٌ)، (مارايت الا سعيداً)، (مامررت الا بسعيدٍ).

بەلاَم ئەگەر موستەسناکە لەپاش (غير، سوى، سواء، حاشا)وە بێت ئەوە بەلای هەموو زمانناسەکانەوە مەجرور دەبێت لە (غير، سوى، سواء)دا، و بەلای زۆربەیانەوە لە (حاشا)دا، وەك:(جاءني القوم غير مجيدٍ، سوى مجيدٍ، حاشا مجيدٍ).

**ئیعرابی ووشەی (غير):**

ووشەی (غير)خۆی ئیعرابی موستەسنا بە(الا) دەکرێت، دەڵێین:(جاءني القوم غيرَ زيدٍ وغيرَ جملٍ) (ماجاءني احد غيرَ سعيدٍ)،(مارايت غيرَ سعيدٍ) (مامررت بغيرِ سعيدٍ).

وَلَفْظُ (غَيْر) مُوْضُوعٌ لِلصِّفَةِ ، وَقَدْ يُسْتَعْمَلُ لِلاسْتِثْنَاءِ ، كَمَا أنَّ لَفْظَةَ (إلاّ) مُوْضُوعَةٌ لِلاسْتِثْنَاءِ ، وَقَد تُستَعْمَلُ لِلصِّفَةِ ، كَمَا فِي قَوْلِهِ تَعَالى:﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إلاّ اللّهُ لَفَسَدَتَا..﴾ (الأنبياء/٢٢) ،أيْ غَيْرُ اللهِ ، كذلِك قَوْلُكَ: (لا إله إلاّ اللهُ).

## الخُلاصَةُ:

الاسْتِثْنَاءُ: هُوَ إخْراجُ مَا بَعْدَ (إلاّ) أوْ إحْدى أخَواتِهَا مِنْ حُكْمِ مَا قَبْلَهَا ، وَالْمُخرَجُ يُسَمَّى (مُستَثنَى) وَالْمُخرَجُ مِنْهُ (مُستَثنَى مِنْهُ).

الاسْتِثنَاءُ: مُتَّصِلٌ وَمُنْقَطِعٌ.

إعْرابُ الْمُستَثنَى عَلَى أنواعٍ:

أ-النَّصْبُ ، وَيَكُونُ فِي أرْبَعَةِ مَواضِعَ:

---

ووشەی (غیر) خۆی بۆ صیفەت دانراوە، بەڵام بۆ ئیستیسنا بەکاردێت، هەروەك چۆن ووشەی (الا) بۆ ئیستیسنا دانراوە و بەڵام بۆ صیفەت بەکاردێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لو كان فيهما آلهة إلا الله لفسدتا ﴾، واتە: (غيرُ الله)، هەروەها وەك:(لا إله إلا الله)[1].

## پوختە

ئیستیسنا بریتیە لە: دەرهێنانی ئەوەی دەکەوێتە پاش (الا)، یان یەکێك لە خوشکەکانیەوە لە حوکمی پێشەوەی، ئەوەش کە دەرهێنراوە پێی دەڵێین:موستەسنا، ئەوەش کە لێیەوە دەرهێنراوە پێی دەوترێت:موستەسنا مینهو.

ئیستیسنایش دووجۆرە: موتتەصیل و مونقەتیع

ئیعرابی موستەسناش چەند جۆرێکە:

أ. نەصب:ئەمەش لە چوار شوێندا دەبێت:

---

١ مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە دەبێت:ئەگەر لە ئاسمانەکان و زەویدا چەند خوایەکیان تێدا بوایە کە صیفەتیان وابوایە غەیری خوا بونایە ئەوا تێك دەچوون . هەروەها مانای: (لاإله إلا الله) بریتیە لە: هیچ خوایەك نیە کە صیفەتی وابێت غەیری الله بێت .

١-الُمسْتَثْنَى الُمتَّصِلُ فِي الكَلامِ الُموجَبِ التَّامِّ.

٢-الُمسْتَثْنَى الُمنْقَطِعُ.

٣-الُمسْتَثْنَى الُمتَقَدِّمُ عَلىَ الُمسْتَثْنَى مِنْهُ.

٤-الُمسْتَثْنَى بـ (عدا وخلا).

ب-جَوازُ النَّصْبِ وَالتَّبَعِيَّةِ.

ج-اَلإعْرَابُ حَسْبَ العَوَامِلِ.

وَيُخْفَضُ الُمسْتَثْنَى إذا كَانَ الاسْتِثْنَاءُ بِـ (غَيْر وَسِوَى وَسَوَاء وَحَاشَا) ، وَخَفْضُهُ فِـي حَاشَـا عِنْدَ الأكْثَرِ.

وَكَلِمَةُ (غَيْر) تُعْرَبُ بِإعْرابِ الُمسْتَثْنَى بِـ (إلاّ).

---

١. موستەسنای موتتەصیل لە ڕستەیەکی موجەبی تەواودا.

٢. موستەسنای مونقەتیع.

٣. موستەسنای پێشکەوتوو بەسەر موستەسنا مینهومکەدا.

٤. موستەسنا بە (عدا) و (خلا).

ب. جەوازی نەصب و شوێنکەوتنی بۆ پێش خۆی.

ج. ئیعراب بەپێی عامیلەکان.

پاشان موستەسنا مەجرور دەبێت ئەگەر ئیستیسناکە بە (غیر، سوی، سواء، حاشا) بێت، مەجرور کردنیشی لە حاشادا بەلای زۆربەی زانایانەوەیە.

ووشەی(غیر) بە ئیعرابی موستەسنا بە (الا) ئیعراب دەکرێت.

## أسئلة

١-مَا هُوَ الْمُستَثنَى؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-إلى كَمْ قِسْمٍ يَنقَسِمُ الْمُستَثنَى؟

٣-عَدِّدْ أنْواعَ إعْرابِ الْمُستَثنَى ، مُوَضِّحاً ذِلك بِأمْثِلَةٍ.

٤-مَا هُوَ الاسْتِثنَاءُ الْمُفَرَّغُ؟ أُذكُرْهُ مَعَ أمْثِلَةٍ.

٥-مَا هُوَ مَعْنَى (التَّامِّ الْمُوجَبِ) وَ (غَيْرِ الْمُوجَبِ)؟

٦-مَا هُوَ إعْرابُ لَفْظِ (غَيْر)؟ اِشْرَحْ ذِلك مَعَ أمْثِلَةٍ.

٧-مَا هُوَ الفَرْقُ بَيْنَ (إلاّ) وَ (غَيْر)؟ بَيِّنْ ذِلك بِأمْثِلَةٍ.

٨-مَا إعْرَابُ الْمُستَثنَى بـ(عَدَا ، وَخَلا ، وَحَاشَا ، وَسِوى)؟ مَثِّلْ لذِلك.

٩-مَتَى يَجُوزُ إعْرابُ الْمُستَثنَى عَلَىَ الْبَدَلِيَّةِ؟ مَثِّلْ لذِلك.

١٠-مَتَى يَتَعَيَّنُ النَّصبُ فِي الْمُستَثنَى؟

---

## پرسیار:

١. موستەسنا چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. چەند جۆر موستەسنامان هەیە؟

٣. جۆرەکانی ئیعرابی موستەسنا بڵێ، و بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

٤. ئیستیسنای موفەڕەغ کامەیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. مەبەست لە (التام الموجب) و (غير الموجب) چیە؟

٦. ووشەی (غير) چۆن ئیعراب دەکرێت؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

٧. جیاوازی چیە لەنێوان (إلا)و (غير) دا؟ بەنموونە ڕوونی بکەوە.

٨. ئیعرابی موستەسنا بە (عدا، خلا، حاشا، وسوى) چۆنە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. چ کاتێك دروستە موستەسنا ئیعراب بکرێت لەسەر بەدەلیەت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٠. چ کاتێك تەنها نەصب دروستە لە موستەسنا؟

## ڕاهێنان:

أ.لەم ڕستانەی خوارەوەدا موستەسنا و موستەسنا مینهو دەستنیشان بکە، و ئیعرابی موستەسناکەش ڕوون بکەوە:

١-مَا جَاءَ إلاّ سَلِيمٌ.

٢-جَاءَ المُسافِرونَ عَدَا سَمِيراً.

٣-مَا مَرَرْتُ إلاّ بِالأحْسَنِ أخلاقاً.

٤-مَا جَاءَ الطّلاّبُ سِوَى مُعَلِّمِهِمْ.

٥-لا يَقُمْ إلاّ حَمِيدٌ.

ب- موستەسنایەکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-مَا رَأيْتُ غَيْرَ......

٢-جَاءَ التّلامِيذُ إلاّ......

٣-مَا قَدِمَ المُسَافِرُونَ سِوى......

٤-كَتَبْتُ الدُّرُوسَ عَدا......

٥-أعْطَيْتُ الفُقَراءَ مِنْحَةً خَلا......

ج-موستەسنا مینهویەکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-جَاءَنِي...... إلاّ سَعِيداً.

٢-ذَهَبَ...... غَيْرَ رجُلٍ.

٣-وَجَدْتُ...... إلاّ وَرَقَةً.

٤-قَرأتُ...... سِوَى مَجَلّةِ العُلُومِ.

٥-تَحَدّيتُ...... خَلاَ العُلَمَاءَ مِنْهُمْ.

د-ئەداتێکی گونجاوی ئیستیسنا بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-مَا جَاءَ...... حُذَيفَةُ.

٢-مَا قَرَأتُ...... دَرْسٍ واحِدٍ.

٣-جَاءَ الطّلاّبُ...... أمْتِعَتَهُمْ.

٤-ذَهَبَ المُسَافِرُونَ...... يَوْماً.

هـ-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-رَأَيْتُ الطّلاّبَ سِوَى حامِدٍ.

٢- قال الشاعر:

لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ يُسْتَطَبُّ بِهِ... إلاَّ الحَمَاقَةَ أَعْيَتْ مَنْ يُدَاوِيهَا

٣- قال تعالى: ﴿.. مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاء رِضْوَانِ اللَّهِ ..﴾ (الحديد/٢٧)

٤- قال تعالى: ﴿.. أَن لاَّ يِقُولُواْ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقَّ...﴾ (الأعراف/ ١٦٩).

٥-هَلْ يَنْتَصِرُ إلاَّ المُؤْمِنُ؟

٦- قال تعالى:﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ (٨٨) إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ (٨٩) (الشعراء/٨٨، ٨٩)

## الدرس السابع عشر

### اَلقِسمُ التَّاسِعُ: خَبَرُ (كَانَ) وَاَخَواتِها

وحُكْمُهُ كَحُكْمِ خَبَرِ المُبْتَدأ، نَحْوُ(كَانَ سَعِيدٌ مُنطَلِقاً) إلاّ أنَّهُ يَجُوزُ تَقْدِيمُهُ عَلَى اسْمِهَا مَعَ كَوْنِهِ مَعْرِفَةً بِخِلافِ خَبَرَ المُبْتَدأ،نَحْوُ قوله تعالى:﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾(الروم /٤٧).

### اَلقِسمُ العَاشِرُ: اسْمُ (إنَّ) وَاَخَواتِها

وَهُوَ الَمسْنَدُ إليه بَعْدَ دُخُولِها ، نَحْوُ: (إنَّ زَيْداً جَالِسٌ).

### اَلقِسمُ الحَادِي عَشَرَ: المَنصُوبُ بِـ (لا) الَّتِي لِنَفْيِ الجِنْسِ

وَهُوَ الُمسْنَدُ إلَيْهِ بَعْدَ دُخُولِهَا. و تَلِيْهَا نَكِرَةٌ مُضَافَةٌ نَحْوُ: لا غُلامَ رَجُلٍ فِي الدَّارِ أَوْ مُشَابِهٌ بِالُمضَافِ نَحْوُ: (لا عِشْرِينَ دِرْهَمَاً فِي الكِيْسِ).

---

## وانەی حەڤدەهەم

### بەشی نۆیەم: خەبەری (کان) و خوشکەکانی (تەواوکەری کاری ناتەواو)[1]

حوکمی ئەم بەشە وەك حوکمی موبتەدا وایە، وەك:(کان سعیدٌ منطلقا)، بەلاّم ئەوە هەیە کە دروستە پێش بخرێت بەسەر ئیسمەکەیدا هەرچەندە ئیسمەکەش مەعریفە بێت، بەپێچەوانەی خەبەری موبتەداوە[2]، وەك:﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾

### بەشی دەیەم: ئیسمی (إنّ) و خوشکەکانی[3]

ئەمەش پاش ئەوەی کە(إن) دەچێتە سەری دەبێتە موسنەد ئیلەیهی، وەك:(ان زیداً جالسٌ).

### بەشی یانزەهەم: مەنصوب بەهۆی (لا)ی نافیەی جنسەوە

ئەمەش دەبێتە موسنەد ئیلەیهی،پاش ڕۆشتنەسەری، و پێویستە بەدوای(لا)کەدا بێت ، و ئیسمێکی نەکیرەی موزاف بێت، وەك:(لاغلام رجلٍ في الدار)، یاخود شتێك کە وەك موزاف بێت ـشیبهە موزافـ، وەك:(لاعشرین درهما في الکیس).

---

١ لەکوردیدا بە تەواوکەرەکە و کارە ناتەواوەکە پێکەوە دەگوترێت گوزارە ، نەك تەواوکەرەکە بەتەنها.

٢ کە پێش ناکەوێت گەر نەکیرە بێت و موبتەداکە مەعریفە بێت، مەگەر زەرف یا جارومەجرور بێت.

٣ لە کوردیدا هەریەکە لەم ئامرازانە ناوو شوێنی خۆی هەیە لە ڕستەداو یەك جۆر نین لەبەر ئەوە ئیسمەکە لە هەریەکەیاندا حوکمی خۆی هەیە.

وَإنْ كَانَ مَا بَعدَ (لا) نَكِرَةً مُفْرَدَةً يُبْنى عَلَى الفَتْحِ نَحْوُ (لا رَجُلَ فِي الدّارِ) وَإنْ كَانَ مُفْرَداً مَعْرِفَةً أوْ نَكِرَةً مَفْصُولاً بَيْنَهُ وَبَيْنَ (لا) كَانَ مَرْفُوعاً لأنّها تُلْغى عَنِ العَمَلِ ، وَيَجِبُ حِينَئِذٍ تَكْرِيرُ (لا) مَعَ الاسْمِ الآخَرِ ، تَقُولَ ، (لا حَمِيدٌ في الدارِ ولا مَجِيدٌ) وَ(لا فِيهَا رَجُلٌ ولا امْرأةٌ).

وَإذا تَكَرَّرَتْ(لا) عَلى سَبِيلِ العطف، وَجَاءَ بَعْدَهَا نَكِرةٌ مُفْرَدَةٌ بِلا فصْلٍ، مِثْلَ (لاحَولَ ولا قُوَّةَ إلاّ باللّهِ) يَجُوزُ فِيهَا خَمْسَةُ أَوْجُهٍ:

فَتحُهُما[1] و رَفْعُهُمَا[2]، وَفَتْحُ الأوّلِ ونَصْبُ الثّاني[3]،

---

بەڵام ئەگەر ئەوەی بەدوای ئەم (لا)یەدا دێت نەکیرە و موفرەد بوو، ئەوە مەبنی دەبێت لەسەر فەتحە، وەك:(لا رجلَ في الدار)، ئەگەریش مەعریفە و موفرەد بوو، یاخود نەکیرەیەك بوو کە شتێك کەوتبووە نێوانی و نێوان (لا)کەوە، ئەوە پێویستە مەرفوع بێت، چونکە لەم حاڵەتەدا لە عەمەل دەکەوێت، و پێویستیش دەبێت کە (لا)کە لەگەڵ ئیسمەکەی تردا دووبارە بکرێتەوە، وەك:(لاحميد في الدار ولا مجيد)[4]، (لا فيها رجل ولا امرأة)[5].

هەرکاتێکیش بەم شێوەیە (لا) دووبارە بوویەوە بەهۆی عەتفەوە، و ئیسمێکی نەکیرەی موفرەد بەدوایدا هات بەبێ ئەوەی هیچ کەوتبێتە نێوانیانەوە، وەك:(لاحول ولا قوة إلا بالله)، ئەوە پێنج وەجهی -واتە شێواز- تێدا دروستە:

فەتحەدار کردنیان، مەرفوع کردنیان، فەتحەدارکردنی یەکەم و مەنصوب کردنی دووەم،

---

١ - على أنَّ ( لا ) الأولى والثانيةِ نافيتانِ للجنسِ والكلمتينِ المفتحتينِ بعدَهما اسماهما .

٢ -على أنَّ ( لا ) الأولى والثانيةَ مِنَ المشبهاتِ بـ ( ليسَ ) والكلمتينِ المرفوعتينِ بعدَهما اسماهما .

٣ - أيْ فتحُ ( حولَ ) على أنَّ ( لا ) نافيةٌ للجنسِ ، ونصبُ ( قوّة ) على أنّها المعطوفةُ على محلِّ اسم ( لا) الأولى ، فتكونُ ( لا ) الثانيةُ زائدةً لتأكيدِ النفي وهذا أضعفُ الوجوهِ .

٤ حميد مەعریفەیە و موفرەدە.

٥ لێرەدا رجل نەکیرەیە بەڵام فاصیلە کەوتوەتە نێوان (لا) و ئیسمەکەیەوە بە (في).

وَ فَتحُ الأوَّلِ وَ رَفْعُ الثَّاني [1] ، ورَفْعُ الأوَّلِ وفَتحُ الثَّاني [2].

وَقَدْ يُحْذَفُ اسْمُ (لا) لِقَرينَةٍ ، نَحْوُ (لا عَلَيْكَ) أيْ لا بَأسَ عَلَيْكَ.

**اَلقِسمُ الثَّاني عَشَرَ: خبرُ (مَا) و (لا) المُشْبَهَتينِ بِـ (لَيسَ)**

وهُوَ المُسْنَدُ بَعْدَ دُخُولِهِما ، نَحْوُ (مَا سَعِيدٌ جَالِساً) و (لا رَجُلٌ حَاضِراً).

وتُلْغَيانِ عَنِ العَمَلِ فِي المَواضِعِ التَّالِيَةِ:

١-إذا وَقَعَ الخَبَرُ بَعْدَ (إلاَّ) نَحْوُ (مَا زَيدٌ إلاَّ قائِمٌ).

---

فەتحەداركردنی یەكەم و مەرفوع كردنی دووەم، مەرفوع كردنی یەكەم و فەتحەداركردنی دووەم [3].

هەندێ جار ئیسمی (لا) لاونابرێت ئەگەر قەرینە -واتە بەڵگە- هەبوو لەسەری، وەك:(لا علیك)[4]، واتە:(لا بأس علیك).

**بەشی دوانزەهەم: خەبەری (ما)و(لا)ی موشەبیەهـ بە(لیس):**

ئەم خەبەرەش دەبێتە موسنەد پاش ئەوەی كە ئەم دوانە دەچنەسەری[5]، وەك:(ماسعیدٌ جالساً)،(لا رجلٌ حاضراً).

ئەم دوانە لە عەمەل دەكەون لەم شوێنانەدا:

١. ئەگەر خەبەرەكە لەپاش (إلاّ)وە بێت، وەك:(ما زیدٌ إلاّ قائمٌ).

---

١ - أيْ فتحُ ( حَولَ ) على أنَّ ( لا ) الأولى نَافيةٌ للجنسِ ، ورَفعُ ( قوّة ) على أنَّ ( لا ) الثانيةَ من المشبَّهاتِ بـ ( ليسَ ) .

٢ - أيْ عكسُ الوَجهِ الرّابعِ .

٣ پێویستە لێرەدا جیاوازی بكەین لەنێوان فەتحەداركردن و مەنصوب كردندا ، كە مەبەست لە فەتحەداركردن ئەوەیە ناوەكە مەبنی دەبێت لەسەر فەتحە ، بەڵام كاتێك كەدەڵێین مەنصوب دەبێت مەبەستمان ئەوەیە كە موعرەبە .

٤ ئەمە وەك ئەوە وایە كە لەزمانی كوردیدا كەسێك توشی ئازارێك دەبێت پێی دەڵێین: هیچ نیە، مەبەستیشمان ئەوەیە:هیچ شتێكی خراپ نیە .

٥ پێشتریش هەر موسنەد بووە.

٢-إذا تَقَدَّمَ الخَبَرُ نَحْوُ (مَا قَائِمٌ زَيدٌ).

٣-إذا زِيدَتْ (إنْ) بَعْدَ (مَا) نَحْوُ (مَا إنْ خالِدٌ نَازِلٌ).

هذِهِ لُغَةُ الحِجازِيِّينَ ، و دَلِيلُهُمْ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ مَا هَذَا بَشَرًا ﴾(يوسف/٣١).

و أمَّا بَنُو تَمِيْمٍ فَلا يُعْمِلُونَهَا أصْلاً كَقَوْلِ الشَّاعِرِ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ:

وَمُهَفْهَفٍ كَالبَدْرِ قُلتُ لَهُ انْتَسِبْ     فَأجابَ مَا قَتْلُ المُحِبِّ على المُحِبِّ حَرَامُ [١]

بِرَفْعِ (حَرَامُ)

أسْئلَة:

١-مَا هُوَ حُكْمُ خَبَرِ (كَانَ)؟ مَثِّلْ لذلِك.

٢-مَا هُوَ عملُ (إنَّ) وَأخواتِها؟ اِئتِ بِمِثَالٍ عَلى ذلِك.

٣-مَا هُوَ الفَرْقُ بَيْنَ (لا) النَّافِيَةِ لِلْجِنسِ و (لا) المُشَبَّهةِ بـ (لَيْسَ) ، أُذْكُرْ ذلِك مَعَ أمْثِلَةٍ.

---

٢. ئەگەر خەبەرەکە پێش کەوتبێت، وەك:(ما قائمٌ زيدٌ).

٣. ئەگەر (إن)ی زیادە بەدوای (ما)دا بێت، وەك:(ما إن خالدٌ نازلٌ).

کارکردنی (ما) لوغەتی حیجازیەکانە، بەڵگەشیان بریتیە لە فەرموودەی خوا:﴿ماهذا بشراً﴾.

بەڵام بەنی تەمیم بەهیچ جۆرێك کاری پێ ناکەن، وەك شاعیری تەمیمیەکان دەڵێت:

ومهفهف کالبدر قلت له انتسب     فأجاب ماقتل المحبّ على المحبّ حرامُ

کە تێیدا(حرام) مەرفوع دەکات.

پرسیار:

١. حوکمی خەبەری (کان) چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. (إن) و خوشکەکانی چ کارێك دەکەن؟ نموونەیەك بۆ ئەمە بێنەوە.

٣. جیاوازی (لا)ی نافیەی جنس و (لا)ی موشەببەهـ بە(لیس) چیە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

---

١ - لمْ يُسَمَّ قائلُهُ ، الواوُ بمعنى ( رُبَّ ) ، والمُهفهَفُ بالفاءينِ اسمُ مفعولٍ ، يُقالُ : جاريةٌ مُهفهَفَةٌ ، أي ضَامِرَةُ البَطْنِ دَقِيقَةُ الخَصْرِ. نفح الطيب من غصن الأندلس الرطيب - (ج ٥ / ص ٢٣٧)

٤-أُذْكُرِ الأوْجُهَ الّتِي تَجُوزُ فِي مِثْلِ (لا حَوْلَ ولا قُوَّةَ إلاّ بِاللّهِ).

٥-مَا هُوَ دَلِيلُ أَهْلِ الحِجَازِ فِي إعْمَالِ (مَا) وَ (لا) الْمُشَبَّهَتَيْنِ بِـ(لَيْسَ) ، ومَا دَلِيلُ إهْمَالِهِمَا عِنْدَ التَّمِيمِيِّينَ؟

٦-مَتَى يُلغَى عَمَلُ (مَا) و (لا) الْمُشَبَّهَتَيْنِ بِـ(لَيْسَ) مَثِّلْ لِذلِك.

---

٤. ئەو شێوازانە بڵێ کە لە (لاحول ولا قوە إلا بالله)و هاوشێوەکانیدا دروستن.

٥. بەڵگەی حیجازیەکان چیە لە کارپێکردنی (ما)و (لا)ی موشەببەھ بە(لیس)دا؟ ئەی بەڵگەی کارپێ نەکردنی لەلایەن تەمیمیەکانەوە چیە ؟

٦. چ کاتێك (ما)و(لا) ی موشەببەھ بە(لیس) لە عەمەل دەکەون؟ بە نموونەوە باسی بکە.

## ڕاهێنان:

أ- ئیسمە مەنصوبەکان لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیاری بکەو جۆرەکەیان و عامیلەکەیان بڵێ:

١- قال رسولُ الله صلى الله عليه وسلم:« لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَـهُ وَلاَ دِيـنَ لِمَـنْ لاَ عَهْدَ لَهُ »[1].

٢-لا طِفْلَ نَائِمٌ.

٣-كَأَنَّ اللاّعِبَ أَسَدٌ.

٤-إنَّ الوَضْعَ جَيِّدٌ.

٥-كَأَنَّ الهِرَّ نَمِرٌ.

٦-مَا زالَ الأسْتَاذُ مُنتَظِراً الجَوابَ.

٧- قال تعالى: ﴿ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾(الشورى/١٧).

---

١- اخرجه احمد برقم( ١٢٣٧٨) وهو صحيح

ب-کام لە: (إن) و خوشکەکانی، یان (کان)و خوشکەکانی، یان (ما)و(لا)ی موشەببەهـ بە (لیس) گونجاوە بیخە سەر ئەم ڕستانەی خوارەوە، پاشان سەروژێری ووشەکان دیاری بکە:

١-اَلولَدُ يَلْعَبُ فِي البَيْتِ.  ٢-فِي الدَّارِ رَجُلٌ.  ٣-اَلطَّالِبُ نَاجِحٌ.  ٤-مُحْسِنٌ رَابِحٌ.
٥-فِي البِيْتِ بَلْبُلٌ.  ٦- هذا عَالِمٌ.  ٧-اَلأسْتَاذُ واقِفُ.

ج- ئیسمێکی گونجاوی مەنصوب بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-إنَّ......... يَلْعَبُ في الحَدِيقَةِ.

٢-كَانَ الطَّالِبُ..........

٣-لَعَلَّ........... قَادِمٌ.

٤-مَا بَرِحَ الطَّالِبُ........... .

٥-مَا هذا........... .

٦-لا رَجُلٌ........... .

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-لا خَيْرَ فِي القَوْلِ بِالجَهْلِ.

٢-كُنْ سَمْحاً ، ولا تَكُنْ مُبَذِّراً.

٣- قال تعالى: ﴿ إنَّ الصَّلاَةَ تَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ ﴾(العنكبوت / ٤٥)

٤-لا طَالِبٌ حَاضِراً.

٥-مَا أنا عاصِياً أمرَ اللّهِ.

## الدرس الثامن عشر

## اَلمَقصَدُ الثَّالِثُ- فِي المَجْرُوراتِ

اَلأسْمَاءُ المَجْروراتُ عَلى قِسْمَينِ:

١-المَجْرُورُ بحَرْفِ الجَرِّ ، وهُوَ كُلُّ اسْمٍ نُسِبَ إليهِ شَيءٌ بواسِطَةِ حَرفِ الجَرِّ لَفْظاً ، نَحْوُ (مَرَرْتُ بزَيدٍ) ، و يُعَبَّرُ عَنْ هذا التَّرْكِيبِ فِي الاصْطِلاحِ بـ (الجَارِّ والمَجْرُورِ).

٢-المضَافُ إليهِ ، نَحْوُ (غُلامُ زَيدٍ) فَإنَّهُ مَجْرُورٌ بحَرْفِ جَرٍّ مُقَدَّرٍ ، ويُعَبَّرُ عَنهُ فِي الاصْطِلاحِ بِأنَّهُ مُضَافٌ وَمُضَافٌ إليهِ. وَيَجِبُ تَجْرِيدُ المُضَافِ عَنْ التَّنوِينِ ، ومَا يَقُومُ مَقَامَهُ ، نَحْوُ كِتَابِ سَعِيدٍ وَكِتَابَيْ حَمِيدٍ ، وَمُسْلِمِي مِصْرَ.

و اَلإضَافَةُ عَلى قِسْمَيْنِ:

---

## وانەی هەژدەیەم

## مەقصەدی سێیەم: لەبارەی مەجرورەکانەوە

ئیسمە مەجرورەکان دەبنە دوو بەشەوە:

١. مەجرور بە حەرفی جەڕ: ئەو ئیسمەیە کە شتێك نیسبەت درابێتە پاڵی بەهۆی یەکێك لە حەرفە جەڕەکانەوە بە لەفزی -واتە-حەرفە جەڕەکە بە زمان بگوترێت- وەك: (مررت بزید)، ئەم پێکهاتەیش پێی دەگوترێت (الجار والمجرور).

٢.موزاف ئیلەیهی: ئەمەیش وەك:(غلام زید)، لێرەدا (زید) مەجرورە بە حەرفێکی جەڕی تەقدیرکراو، ئەم پێکهاتەیش لە بەکارهێنانی زانایاندا پێی دەوترێت موزاف و موزاف ئیلەیهی. پێویستە موزاف تەنوین و ئەوەی لە جێگای تەنویندا دادەنرێت[1] پێوەی لابرێت، وەك: (کِتابِ سَعیدٍ) و (کتابَیْ حَمیدٍ) ، و (مُسْلمي مِصرَ).

ئیزافەیش دوو بەشە:

---

[1] مەبەست لە (ئەوەی لەجێگای تەنویندا دادەنرێت) بریتیە لەو نونانەی کە نیشانەی ڕەفعن وەك: نونی موسەنا و جەمعی موزەکەری سالم.

١-مَعْنَوِيَّةٌ ، وَهِيَ أنْ لا يَكُونَ الْمُضَافُ صِفَةً [1] مُضَافَةً إلى مَعْمُولِهَا ، وهِيَ إمَّا بِمَعْنَى (اللام) نَحْوُ (صَلاةُ اللَّيْلِ).

وَفَائِدَةُ هذِهِ الإضَافَةِ تَعْرِيفُ الْمُضَافِ إنْ أُضِيفَ إلى مَعْرِفَةٍ – كَمَا مَرَّ – وتَخْصِيصُهُ إنْ أُضِيفَ إلى نَكِرَةٍ ، نَحْوُ (غُلامُ رَجُلٍ).

---

١.مەعنەوی(واتایی): ئەوەیە کە موزافەکە صیفەتێك نەبێت کە ئیزافەکرابێت بۆ لای مەعمولەکەی خۆی.

ئەم جۆرەیش یان بە واتای(لام)ە، وەك:(غلام زید)، یاخود بە واتای(من)ە، وەك:(خاتم فضة)، یاخود بە واتای (في)ـە وەك:(صلاة اللیل) [2].

ئەم جۆرە ئیزافە کردنە سودەکەی بریتیە لە: مەعریفەکردنی موزافەکە ئەگەر ئیزافە کردنەکەی بۆ لای مەعریفە بوو، وەك لە نموونەکانی پێشوودا دەرکەوت. یان سودەکەی بریتیە لە: تەخصیص کردنی موزافەکە ئەگەر ئیزافەکردنەکەی بۆ لای نەکیرە بوو، وەك:(غلام رجل)[3].

---

١ - کاسم الفاعل واسم المفعول والصفة المشبهة وصیغة المبالغة واسم التفضیل .

٢ (غلام زید) واتە: غولامەکەی زەید کە ماناکەی دەبێتە (غلام لزید) واتە: غولامێك کە هی زەیدە ، (خاتم فضة) واتە: ئەنگوستیلەی زیو کە ماناکەی دەبێتە:(خاتم من فضة) واتە: ئەنگوستیلەیەك لە زیو ، (صلاة اللیل) واتە: نوێژی شەو کە ماناکەی دەبێتە:(صلاة في اللیل) واتە: نوێژێك لەشەودا . لەبەر ئەوەی مانای حەرفە جەرەکان ڕوونە و بە کەمترین بیرکردنەوە دەردەکەوێت لە ڕستەکاندا ، پێویستی نەکردووە بە لەفزی بووترێن ، مەگەر هۆکارێك ناچارمان بکات .

٣ ئەگەر موزاف ئیلەیهی مەعریفە بوو، وەك:(غلام زید) ئەوە بە هۆیەوە موزافەکە دەبێتە مەعریفە وەك (غلام) کە بە هۆی ئیزافەکەوە دەناسرێت کە هی زەیدە ، بەڵام ئەگەر موزاف ئیلەیهی نەکیرە بوو وەك:(غلام رجل) ئەوە بە هۆیەوە موزافەکە تەخصیص -تایبەت- دەبێت بەوەی کە غولامەکە هی پیاوێکە و هی ئافرەت نیە ، یاخود هی یەك پیاوە و هی دوو پیاو نیە –بەپێی ئەوەی کە مەبەستی قسەکەرەکەیە- .

٢-لَفْظِيَّةٌ: وَهِيَ أنْ يَكُونَ الْمُضافُ صِفَةً مُضافَةً إلى مَعْمُولِهَا وَهِيَ فِي تَقْدِيرِ الانْفِصَالِ فِي اللَّفْظِ ، نَحْوُ (زَائِرُ سَعِيدٍ) – فَكَأنَّ الْمُضافَ مُنْفَصِلٌ عَنِ الْمُضَافِ إلَيهِ ، وَفَائِدَتُهَا تَخْفِيفٌ فِي اللَّفْظِ فَقَطْ.

وإذا أُضِيفَ الاسْمُ الصَّحِيحُ ، أوِ الجَارِي مَجرَى الصَّحِيحِ إلى (يَاءِ) الْمُتَكَلِّمِ، كُسِرَ آخِرُهُ ، وأُسْكِنَتِ اليَاءُ ، أوْ فُتِحَتْ ، مِثْلُ (غُلامِي وَ دَلْوِي ، وَظَبْيِي) وَإنْ كَانَ آخِرُ الاسْمِ يَاءً مَكْسُوراً مَا قَبْلَهَا أُدْغِمَتِ اليَاءُ فِي اليَاءِ وفُتِحَتِ اليَاءُ الثَّانِيَةُ لِئَلاَّ يَلْتَقِيَ السَّاكِنَانِ ، كَمَا تَقُولُ فِي القَاضِي (قَاضِيَّ) وفِي الرَّامِي (رَامِيَّ).

---

٢.لەفزیی (زارەکیی): ئەوەیە کە موزافەکە صیفەتێکی[1] ئیزافەکراو بێت بۆ لای مەعمولەکەی خۆی. ئەم جۆرەیان لە ئاست و تەقدیری دوو لەفزی لەیەك جوداداان، وەك:(زائر سعیدٍ) —وەك ئەوە وایە کە موزافەکە جودا بێت لە موزاف ئیلەیهیەکە — سودی ئەم جۆرە ئیزافەیەش تەنها بریتیە لە سوك کردنی ووشەکە لەسەر زمان[2].

ئەگەر ئیسمێکی صەحیح یان جاری مەجرای صەحیح ئیزافە کرا بۆ لای (یاء)ی موتەکەلیم، ئەوا کۆتاییەکەی مەکسور دەکەین و پاشان (یاء)ەکە ساکین یان مەفتوح دەکەین، وەك: (غلامي)و (دلوي)و (ظبيي)، ئەگەر کۆتایی ئیسمەکە (یاء)ێك بوو کە پێشەوەی مەکسور بوو، ئەوا هەردوو (یاء)ەکە لە یەکتردا دەغم دەکەین، پاشان (یاء)ی دووهەمیان مەفتوح دەکەین بۆ ئەوەی دوو حەرفی ساکین بەیەك نەگەن، وەك ئەوەی کە لە (قاضي) دا دەڵێین:(قاضيَّ)، و لە (رامي) دا دەڵێین:(راميَّ).

---

١ مەبەست لە صیفەت لێرەدا بریتیە لەو ئیسمە موشتەقانەی کە وەك فیعل توانای کارکردنیان هەیە ، وەك:ئیسمی فاعیل، ئیسمی مەفعول، صیفەی موشەببەهە...هتد.

٢ ئەم ڕستەیە لە جێگای ئەوەدا دانیشتوە کە بڵێین: (هو زائرٌ سعیداً) ، بەڵام بۆ ئەوەی ڕستەکە کورت بکەینەوە و ئاسانتریش بێت لەسەر زمان دەڵێین: (زائرُ سعیدٍ).

وإنْ كَانَتْ فِي آخِرِهِ (واوٌ) مُضمُومٌ مَا قَبلَهَا قَلَبْتَهَـا (يَـاءً) ، وَعَمِلْـتَ كَمَـا مَـرَّ، تَقـولُ ، (جَاءَنِي مُعَلِّميَّ).

وَتَقولُ فِي الأسْماءِ السِّتَةِ ، (أبِي و أخِي ، وَحَمِي ، وهَنِي) و (فِيَّ) عِنْـدَ قَـومٍ وَ(ذو) لا يُضَافُ إلى مُضمَرٍ اصْلاً وَقَوْلُ الشَّاعِرِ:

إنَّمَا يَعْرِفُ ذا الفَضْلِ ، مِنَ النَّاسِ ذَوُوْهُ

شَاذٌّ.

وإذا قُطِعَتْ هذِهِ الأسماءُ عَنِ الإضافَةِ قُلْتَ ، (أَخٌ ، وأَبٌ ، وَحَمٌ ، وَهَنٌ ، وَفَمٌ) ، وتَجُـوزُ الحَرَكَاتُ الثَّلاثُ ، و (ذو) لا يُقطَعُ عَنِ الإضَافَةِ أَصْلاً.

هذا كُلُّهُ فِي المَجْرُورِ بِتَقْدِيرِ حَرْفِ الجَرِّ ، امَّا مَا يُذْكَرُ فِيهِ حَرْفُ الجَرِّ لَفْظاً فَسَـيَأْتِيكَ فِـي القِسْمِ الثَّالِثِ إنْ شَاءَ اللّهُ تَعَالَى.

---

ئەگەر كۆتایی ئیسمەكە (واو)ێك بوو كە پێشەوەی مەضموم بوو، ئەوە (واو)ەكە دەكەیتە(یاء)، و هەروەك كارەكەی پێشەوە ئەنجام دەدەیت، دەڵێیت:(جاءني معلميَّ).

لە ئەسمائی سیتتەیشدا دەڵێیت:(ابي، اخي، حمي، هني) هەروەها بەلای هەندێكیشەوە دەڵێیت:(فيَّ)، بەڵام (ذو) بەهیچ شێوەیەك ئیزافە ناكرێت بۆ لای موزمەر، بەڵام گوتەی شاعیر كە دەڵێت: إنما يعرفُ ذا الفضلِ من الناس ذووهُ

ئەوە شازە و لایداوە لە یاسای صرف.

ئەگەر ئەم ئیسمانە لە ئیزافە دابڕێن دەڵێین:(اخٌ، ابٌ، حمٌ، هنٌ، فمٌ)، لەم كاتەشدا هەرسێ حەرەكەكە وەردەگرن [1]، بەڵام (ذو) هەرگیز لە ئیزافە دانابڕێت.

ئەم باسانە هەموویان لەبارەی ئیسمێكەوە بوون كە مەجرور بووبێت بە تەقدیر كردنی حەرفی جەر، بەڵام ئەو ئیسمانەی كە بە لەفزی مەجرور دەبن بە حەرفی جەر ئەوە لە بەشی سێیەمدا بەیارمەتی خوا باسیان لێوە دەكەین.

---

١ واتە: ڕەفعیان بەضەممە دەبێت و نەصبیان بە فەتحە و جەڕیان بە كەسرە .

## اَلخُلاصَةُ

اَلاسْمُ المَجْرُورُ نَوْعَانِ:

١-المجْرُورُ بِحَرْفِ الجَرِّ.

٢-المجْرُورُ بالإِضَافَةْ.

اَلإِضَافَةُ قِسْمَانِ:

١-مَعْنَوِيَّةٌ ، وَهِيَ تَفِيْدُ تَعْرِيفَ المُضَافِ أو تَخصِيصَهُ.

٢- لَفْظِيَّةٌ ، وَهِيَ لا تَفِيدُ تَعْرِيفَ المُضَافِ وَلا تَخصِيصَهُ ، و فَائِدَتُهَا تَخفِيفُ اللَّفْظِ فَقَطْ.

والاسْمُ الصَّحِيحُ و شِبْهُهُ إذا أُضِيفَا إلى يَاءِ المُتَكَلِّمِ يُكْسَرُ آخِرُهُمَا وتُسَكَّنُ اليَاءُ أَوْ تُفْتَحُ.

وَإنْ كَانَتْ فِي آخِرِ الاسْمِ (واوٌ) مُضْمُومٌ مَا قَبْلَهَا قُلِبَتِ الـوَاوُ يَـاءً وَكُسِـرَ مَـا قَبْلَهَـا و أُدْغِمَتِ اليَاءُ فِي اليَاءِ.

---

## پوخته

ئیسمی مەجرور دوو بەشە:

١.مەجرور بە حەرفی جەڕ.

٢.مەجرور بە ئیزافە.

ئیزافەش دوو بەشە:

١. مەعنەوی: ئەم جورە دەبێتە هۆی مەعریفە کردنی موزافەکە یاخود تەخصیص کردنی.

٢.لەفزی: ئەم جۆرەیان مەعریفەکردن و تەخصیص کردن ناگەیەنێت، بەڵکو تەنها سودەکەی ئەوەیە کە لەفزەکە لەسەر زمان سوك دەکات.

ئیسمی صەحیح و ئەوەش کە لە صەحیح دەچێت، ئەگەر ئیزافە بکرێن بۆ لای (یاء)ی موتەکەلیم ئەوە کۆتاییەکەیان مەکسور دەکەین و (یاء)ەکەش ساکین یان مەفتوح دەکەین.

ئەگەر لە کۆتایی ئیسمەوە (واو)ێکمان هەبوو کە پێشەوەی مەضموم بوو ئەوە دەیکەینە (یاء) و پێشەوەی مەکسوردەکەین و پاشان هەردوو (یاء)ەکە دەغم دەکەین.

## أسئلة:

١-مَا هِيَ أَقْسامُ الاسْمِ المَجْرُورِ؟

٢-مَا هُوَ المُضَافُ إِلَيهِ؟ أذكُرْ سَبَبَ الجرِّ فِيهِ مَعَ مِثَالٍ.

٣-أُذكُرْ أَقْسَامَ الإضافَةِ ، و مثِّلْ لَها.

٤-مَا هِيَ الإضافَةُ المَعْنَوِيَّةُ؟ و كَيْفَ تَكُونُ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٥-مَا هِيَ الإضَافَةُ اللَفْظِيَّةُ؟ ومَا فَائِدَتُهَا؟

٦-مَا هُوَ حُكْمُ الاسْمِ الصَّحِيح أَوِ الجَارِي مَجْرِي الصَّحِيحِ إذا أُضِيفَ إلى يَاءِ المُتَكَلِّمِ؟ وَضِّحْ ذلِكَ بِأمْثِلَةٍ.

٧- ماذا يَجرِي عَلى ياءِ الاسمِ المَنقُوصِ إذا أُضِيفَ إلى ياءِ المُتَكَلِّمِ؟

٨- مَاذا تَعْمَلُ إذا أَضَفْتَ اسْماً آخِرُهُ (وَاوٌ) مُضمُومٌ مَا قَبْلَهَا إلى يَاءِ المُتَكَلِّمِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٩-أيْ الأسْمَاءِ السِّتَّةِ لا يُضَافُ إلي الضَّمِيرِ؟

---

## پرسیار:

١. بەشەكانی ئیسمی مەجرور كامانەن؟

٢. موزاف ئیلەیهی چیە؟ هۆی مەجرور بوونەكەی بڵێ بە نموونەوە.

٣. بەشەكانی ئیزافە بڵێ، و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٤. ئیزافەی مەعنەوی چیە؟ و چۆن دەبێت؟ ئەمە بە نموونەی بەسودەوە ڕوون بكەوە.

٥. ئیزافەی لەفزی چیە؟ ئەی سوودی چیە؟

٦. حوكمی ئیسمی صەحیح و جاری مەجرای صەحیح چیە لەكاتێكدا ئیزافە بكرێن بۆ لای (یاء)ی موتەكەلیم؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.

٧. چی بەسەر(یاء)ی ئیسمی مەنقوصدا دێت كاتێك ئیزافە دەكرێت بۆ لای(یاء)ی موتەكەلیم؟

٨. ئەگەر ئیسمێكت هەبوو، كۆتاییەكەی (واو)ێك بوو كە پێشەوەی مەضموم بوو، چی لێ دەكەی ئەگەر ئیزافەت كرد بۆ لای (یاء)ی موتەكەلیم؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. كام لە ئەسمانی سیتتە ئیزافە ناكرێت بۆ لای ضەمیر؟

## ڕاهێنان:

أ- جۆری ئیزافه لەم نموونانەی خوارەوەدا دەستنیشان بکە:

١-جَاءَ حَاصِدُ الزَّرْعِ الآنَ.

٢- قال تعالى: ﴿ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ﴾(البقرة/١٢٤).

٣-مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم ) وَأبو بكرٍ خليفتُهُ منْ بعدِهِ.

٤-جَاءَ أَبِي مِنَ المَتجَرِ.

٥-مَنْ هُوَ فَاتِحُ الأندلسِ؟

ب-موزاف ئیلەیهی گونجاو بخە ئەم بۆشاییانەوە، و حەرەکەی ووشەکان دیاری بکە:

١-جاءَ عَمُّ......... وجَلَس إلى جَانِبِ..........

٢-كِتابُ......... مَوْجُودٌ.

٣-خَاتَمُ......... مَفقُودٌ.

٤-بَابُ......... كَبِيرٌ.

٥-مُدِيرُ......... حَازِمٌ.

٦-لَيْلُ.........  قصِيرٌ ، وَلَيْلُ...... طوِيْلٌ.

٧-سَاحَةُ......... وَاسِعَةٌ.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-اَلقَلْبُ مُصْحَفُ البَصَرِ.

٢-التُّقى رَئِيسُ الأخلاقِ.

٣-حَقُّ الوالِدِ عَلَى الوَلَدِ أنْ يُطِيعَهُ.

٤-هذا سِوَارُ ذَهَبٍ.

٥-أَكْرِمْ عالِمَ البَلَدِ.

## الدرس التاسع عشر

## اَلخاتِمةُ: في التَّوَابِعِ

اِعْلَمْ انَّ الأسْمَاءَ المُعْرَبَةَ الَّتِي مَرَّ ذِكْرُهَا كَانَ إعْرَابُها بالأصَالَةِ ، بِأنْ دَخَلَتْهـا العَوَامِـلُ ، فَأوْجَبَتْ فِيها الرَّفْعَ ، والنَّصبَ ، وَالجَرَّ بِلا واسِطَةٍ ، وقَدْ يَكُونُ إعْرابُ الاسْمِ بِتَبَعِيَّـةِ مَـا قَبْلَهُ ، و يُسَمَّى (التَّابِعَ) لأنَّهُ يَتْبَعُ مَا قَبْلَهُ فِي الإعْرَابِ.

فَالتّابِعُ ، كَلُّ ثانٍ مُعْرَبٍ بِإعْرَابِ سَابِقِهِ مِنْ جهةٍ واحِدَةٍ [1] ، وَالتَّوَابِعُ خَمْسَةٌ:

١-النَّعْتُ.

---

## وانەی نۆزدەیەم

## خاتیمە: سەبارەت بە تابیعەکان (شوێنکەوتەکان)

بزانە کە ئەو ئیسمە موعرەبانەی کە پێشتر باسمان لێوە کردن هەموویان ئیعرابەکەیان بە ئەصالەیە، چونکە عامیلەکان، چوونەتە سەریان و بوونەتە هۆی ڕەفع یان نەصب یان جەڕ تێیاندا ڕاستەوخۆو بەبێ بوونی هیچ واسیتەیەك، بەڵام هەندێك جار دەگونجێت ئیعرابی ئیسم بەهۆی ئەوەوە بێت کە بووەتە تابیع و شوێنکەوتەی پێش خۆی، ئەوکاتەش بەئیسمەکە دەوترێت تابیع، چونکە شوێنی پێش خۆی دەکەوێت لە ئیعرابدا.

تابیع: هەموو ئیسمێکی دووهەمە کە ئیعراب بکرێت بە ئیعرابی ئەو ئیسمەی کە لە پێشیەوەیە، ئیعرابەکەشی تەنها لەیەك ڕووەوەیە[2].

تابیعەکان پێنجن:

١. نەعت

---

١ - بخلاف المتبوع ، فإنه يرفع بسبب الفاعلية أو الابتدائية أو الخبرية وغيرها وينصب ويجر كذلك وبأسباب مختلفة ، اما التابع فإعرابه سبب واحد وهو التبعية .

٢ بە پێچەوانەی مەتبوعەکە، کە مەرفوع دەبێت بەهۆی فاعیلیەتەوە یان ئیبتیداوە یان خەبەریەت و شتانی ترەوە و لەهەمان کاتدا مەنصوب و مەجرور دەبێت بە هۆکاری تریش، بەڵام تابیع ئیعرابەکەی هەر دەبێت لە یەك ڕووەوە بێت ئەویش تەبەعیەتە. (علی بن نایف)

٢-اَلعطف بِالحُرُوفِ.

٣-اَلتَّأكِيدُ.

٤-عطف البَيَان.

٥-اَلبَدَلُ.

### اَلقسمُ الأوّلُ: النَّعتُ (الصِّفة)

اَلنَّعْتُ ، تَابِعٌ يَدُلُّ عَلَى مَعْنىً فِي مَتْبُوعِهِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي رَجُلٌ عَالِمٌ) وَيُسَمَّى النَّعْتَ الحَقِيقِيَّ ، أوْ فِي مُتَعَلِّقٍ بِمَتْبُوعِهِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي رَجُلٌ عَالِمٌ أَبُوهُ) وَيُسَمَّى النَّعْتَ السَّبَبِيَّ.
وَالنَّعتُ الحَقِيقِيُّ إنَّمَا يَتْبَعُ مَتْبُوعَهُ فِي أَربَعَةٍ مِنْ عَشَرَةِ أُمورٍ.
الأوَّلُ والثَّانِي وَالثَّالِثُ: فِي حالات الإعْرَابِ الثَّلاثِ ، الرَّفْعِ وَالنَّصْبِ وَالجَرِّ.

---

٢. عەتف بە هۆی حەرفەوە

٣. تەئكيد

٤. عەتفی بەيان

٥. بەدەل

### بەشی يەكەم: نەعت -واتە صيفەت-(هاوەڵناوی چۆنيەتی)

نەعت تابيعێكە كە ئاماژە بە مانايەك دەكات كە لە مەتبوعەكەيدايە، وەك: (جاءني رجل عالم)، ئەمەش پێيدەوترێت نەعتی حەقيقی واتە صيفەتی ڕاستەقينە، ياخود ئاماژە بەمانايەك دەكات كە لە شتێكدايە كە موتەعەلەقی مەتبوعەكەيە، وەك: (جاءني رجل عالم ابوه)، ئەمەشيان پێی دەوترێت نەعتی سەبەبی[1].

نەعتی حەقيقی لە چوار شت لە دە شتدا شوێنی پێشوەكەی دەكەوێت:

يەكەم و دووەم و سێيەم: لە سێ حاڵەتە ئيعرابيەكەدا واتە: ڕەفع و نەصب و جەڕ.

---

[1] چونكە نەعتەكە لە ڕاستيدا هی مەنعوتەكە نيە، بەڵكو هی كەسێكە كە بە جۆرێك لە جۆرەكان پەيوەستە بە مەنعوتەكەوە.

الرّابعُ والخامِسُ: فِي التَّعْرِيفِ ، والتَّنْكِيرِ.

السّادِسُ وَالسّابِعُ وَالثّامِنُ: فِي الإفْرادِ ، وَالتَّثْنِيَةِ ، وَالجَمْعِ.

التّاسِعُ والعاشِرُ: فِي التَّذْكِيرِ والتّأنِيثِ.

نَحْوُ (جاءَنِي رَجُلٌ عالِمٌ ، وَامْرَأةٌ عالِمَةٌ وَرَجُلانِ عالِمانِ ، وَ امْرَأتانِ عَالِمَتَانِ ، وَ رِجَالٌ عُلَمَاءُ ، وَنِسَاءٌ عَالِمَاتٌ ، وَزَيْدٌ العَالِمُ ، وَالزَّيْدانِ العَالِمانِ وَالزَّيْدُونَ العَالِمُونَ ، وَ رَأَيْتُ رَجُلاً عَالِماً)، وَكَذا البَوَاقِي.

وَالنَّعْتُ السَّبَبِيُّ إنّما يَتْبَعُ مَتْبُوعَهُ فِي الخَمْسَةِ الأُوَلِ ، أَعْنِي حالاتِ الإعْرابِ الثَّلاثِ ، والتَّعْرِيفَ ، والتَّنْكِيرَ ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعالى:﴿ أخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا﴾(النساء/٧٥).

وَفَائِدَةُ النَّعْتِ تَخْصِيْصُ المَنْعُوتِ إنْ كَانَا نَكِرَتَيْنِ ، مِثْلُ (جَاءَنِي رَجُلٌ عَالِمٌ) ، وَتَوْضِيْحُ مَنْعُوتِهِ إنْ كَانَا مَعْرِفَتَينِ: مِثْلُ (جَاءَنِي زَيْدٌ الفَاضِلُ).

---

چوارەم وپێنجەم: لە تەعریف و تەنکیر دا.

شەشەم و حەوتەم و هەشتەم: لە ئیفراد و تەسنیە و جەمع دا.

نۆیەم و دەیەم: لە تەزکیر و تەئنیس دا.

وەك:(جاءني رجل عالم، وامرأة عالمة، ورجلان عالمان، وامرأتان عالمتان، ورجال علماء، ونساء عالمات، وزيد العالم، والزيدان العالمان،والزيدون العالمون،ورأيت رجلا عالما) ئەوانی دیش هەروەها.

نەعتی سەبەبیش تەنها لە پێنجەکەی سەرەتادا شوێن مەتبوعەکەی دەکەوێت، واتە: لە سێ حاڵەتە ئیعرابیەکە و تەعریف و تەنکیردا. وەك فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ أخرجنا من هذه القرية الظالم أهلها ﴾.

سودی نەعت: سودی نەعت بریتیە لە: تەخصیص کردنی مەنعوت، ئەوەش لە کاتێکدا کە هەردووکیان نەکیرە بن، وەك: (جاءني رجل عالم)، بەڵام ئەگەر هەردووکیان مەعریفە بوون ئەوە وەصفکراوەکە ڕوون دەکاتەوە، وەك:(جاءني زيد الفاضل).

وَقَدْ يَكُونُ لِلثَّنَاءِ وَالمَدْحِ ، نَحْوُ ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ ﴾ ، وَقَدْ يَكُونُ لِلتَّأْكِيدِ ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ ﴾(الحاقة/١٣). وَقَدْ يَكُونُ لِلذَّمِّ نَحْوُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ.

و النَّكِرَةُ تُوصَفُ بِالجُمْلَةِ الخَبَرِيَّةِ ، نَحْوُ (مَرَرْتُ بِرَجُلٍ أَبُوهُ قَائِمٌ ، أوْ قَامَ أَبُوهُ).

وَالضَّمِيرُ لا يُوصَفُ ، و لا يُوصَفُ بِهِ.

**الخُلاصَةُ:**

اَلتَّابِعُ ،اِسْمٌ يُعْرَبُ تَبَعاً لإعْرابِ مَا قَبْلَهُ.

اَلتَّوابِعُ خَمْسَةُ أَقْسامٍ: اَلنَّعْتُ، اَلعطف بِالحُرُوفِ، عطف البَيان، اَلتَّأْكِيدُ، اَلبَدَلُ.

اَلنَّعْتُ: ويُسَمَّى الصِّفَةَ أَيْضاً، هُوَ مَا يُذْكَرُ بَعْدَ اسْمٍ، لِيُبَيِّنَ بَعْضَ أَحْوَالِهِ أَوْ أَحْوَالِ مُتَعَلِّقِهِ.

والنَّعْتُ إنْ كَانَ صِفَةً لِنَفْسِ اَلْمَنعُوتِ يَجِبُ أَنْ يُطَابِقَهُ فِي الإعْرَابِ، والتَّعْرِيفِ، والتَّنْكِيرِ ،

---

هەندێ جار نەعت بۆ پیاهەڵدان و ستایشکردن بەکار دەهێنرێت، وەك: (بسم الله الرحمن الرحيم)، هەندێ جاریش بۆ تەئکید، وەك فەرموودەی خوای گەورە ﴿ نفخة واحدة ﴾، هەندێ جاریش بۆ زەمکردن بەکاردێت، وەك: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

دەبێت ئەوەش بزانین کە ئیسمی نەکیرە دەشێت وەصف بکرێت بە ڕستەیەکی خەبەری، وەك: (مررت برجل ابوه قائم) یان (قائم ابوه).

هەروەها ضەمیر نە وەصف دەکرێت و نە وەصفیشی پێ دەکرێت.

**پوختە**

تابیع: ئیسمێکە بە ئیعرابی مەتبوعەکەی ئیعراب دەکرێت.

تابیعەکان پێنجن: (نەعت، عەتف بە حەرف، عەتفی بەیان، تەئکید، بەدەل).

نەعت کە پێیشی دەوترێت صیفەت، ئەوەیە کە بە دوای ئیسمێکدا دێت، بۆ ئەوەی کە حاڵەتەکانی ئیسمەکە یان شتێکی پەیوەست بەئیسمەکەوە ڕوون بکاتەوە.

ئەگەر نەعت صیفەت بوو بۆ خودی مەتبوعەکەی ئەوە پێویستە وەك ئەو بێت لە: ئیعراب، و تەعریف و تەنکیر،

والإفْرَادِ ، والتَّثْنِيَةِ ، والجَمْعِ ، و التَّذْكِيرِ ، والتَّأْنِيثِ.

وَإنْ كَانَ صِفَةً لِمُتَعَلِّقٍ بالَمتْبُوعِ يَجِبُ أنْ يُطَابِقَهُ فِي الإعْرَابِ ، والتَّعْرِيفِ ، والتَّنْكِيرِ فَقَطْ.

وَفَائِدَةُ النَّعْتِ ، تَخْصِيصُ المَنعوتِ إذا كَانَا نَكِرَتِينِ ، وَتَوْضِيحُهُ إذا كَانَا مَعْرِفَتَينِ.

أسْئِلَةٌ:

١-مَا هُوَ التَّابِعُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-عَدِّدْ أقْسَامَ التَّوَابِعِ.

٣-عَرِّفِ النَّعْتَ الحَقِيقِيَّ وَالسَّبَبِيَّ و بَيِّنْ الفَرْقَ بَيْنَهُما.

٤-هَلْ يَجُوزُ النَّعْتُ بِالجُمْلَةِ وَكَيْفَ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٥-فِيمَ يَتْبَعُ النَّعْتُ المَتْبُوعَ إذا كَانَ صِفَةً لِنَفْسِ المَنْعُوتِ؟ وَفِيمَ يَتْبَعُهُ إذا كَانَ صِفَةً لِمُتَعَلِّقِ المَتْبُوعِ؟ مَثِّلْ لَهُمَا

---

ئیفراد و تەسنیە و جەمع، تەزکیر و تەئنیس دا.

ئەگەریش صیفەتی موتەعەلەقی پێشوەکەی بوو: ئەوە پێویستە تەنها لە: ئیعراب و تەعریف و تەنکیردا وەك ئەو بێت.

سودی نەعت بریتیە لە: تایبەت کردنی مەنعوت، ئەگەر هەردووکیان نەکیرە بوون، هەروەها ڕونکردنەوەی مەنعوت ئەگەر هەردووکیان مەعریفە بوون.

پرسیار:

١.تابیع چیە؟ نموونەی بۆ بهێنەرەوە.

٢. تابیعەکان چەند بەشن بیانژمێرە.

٣. پێناسەی نەعتی ڕاستەقینە و سەبەبی بکە و جیاوازی نێوانیان ڕوون بکەوە.

٤. ئایا دروستە نەعت ڕستە بێت، چۆن؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٥. نەعت لە چیدا شوێن مەتبوعەکەی دەکەوێت ئەگەر صیفەت بوو بۆ هەمان مەنعوت؟ ئەی ئەگەر صیفەت بوو بۆ موتەعەلەقی مەنعوتەکە لە چیدا شوێنی دەکەوێت؟ نموونەیان بۆ بهێنەوە.

٦-عَدِّدْ فَوائِدَ النَّعْتِ مَعَ إيْرادِ أمثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٧-هَلْ يَقَعُ الضَّمِيرُ صِفَةً أو مَوْصُوفاً؟

٦. سودەکانی نەعت بژمێرە بە نموونەی دروستەوە.

٧. ئایا ضەمیر دەبێتە صیفەت، یاخود مەوصوف؟

## ڕاهێنان:

أ. لەم ڕستانەی خوارەوەدا نەعتەکان دیاری بکە:

١-هذا رَجُلٌ عَالِمٌ.

٢-اَلطِّفْلُ الصَّغِيرُ مَحْبُوبٌ.

٣-اَلعَامِلُ المُجِدُّ مَمْدُوحٌ.

٤-(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ).

٥-أَبُوكَ عَالِمٌ مُحْتَرَمٌ.

٦-الجُنْدِيُّ الجَبانُ مَذْمُومٌ.

٧-سَمِيحٌ طالِبٌ مُوَفَّقٌ.

ب- نەعتێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-جَاءَ الوَلَدُ............

٢-اَلأَطْفَالُ............ يَرْكُضُونَ فِي الشَّارِعِ.

٣-أَخُوكَ رَجُلٌ.............. .

٤-اَلصَّبِيُّ............ يَحْتَرِمُ الكِبَارَ.

٥- اَلطَّالِبُ............ لا يَتَكَلَّمُ أثناءَ الدَّرْسِ.

ج-ئەم صیفەتانەی خوارەوە لە ڕستەی بەسوددا بەکار بهێنە:

قَصِير ، مَحْبوب ، مُوَفَّق ، مَنْصُور ، مُؤْمِن ، كَافِر ، مُنَافِق.

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى:﴿ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(القصص/٢١).

٢- قال تعالى: ﴿ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴾(النمل/٢٦).

٣-اَلْحِلْمُ غِطَاءٌ سَاتِرٌ.

٤-الْمُؤْمِنُ العامِلُ يَنْتَصِرُ.

٥-اَلإِسْلامُ دِيْنٌ كَامِلٌ.

٦-جَاءَتْ فاطِمَةُ الكَرِيمُ أَبُوهَا.

## الدرس العشرون

### اَلقِسمُ الثَّاني - اَلعطف بِالحُرُوف

اَلمَعْطُوفُ بِالحُرُوفِ ، تَابِعٌ يُنْسَبُ إِلَيهِ مَا نُسِبَ إِلى مَتْبُوعِهِ ، وكِلاَهُمَا مَقْصُودَانِ بِتِلْكَ النِّسْبَةِ ويُسَمَّى (عطف النَّسَقِ) أَيْضاً ، وشَرْطُهُ أَنْ يَتَوَسَّطَ بَيْنَهُ وبَيْنَ مَتْبُوعِهِ أَحَدُ حُرُوفِ العطف مِثْلُ (قَامَ سَعدٌ وخَالِدٌ) ، ومِنْ حُرُوفِ العطف (الوَاو والفَاء و ثُمَّ و أَوْ) وسَيَأْتِي ذِكْرُهَا فِي القِسْمِ الثَّالِثِ ، إِنْ شاءَ اللّهُ تَعالى.

وَإِذا عُطِفَ عَلَى ضَمِيرٍ مَرْفُوعٍ مُتَّصِلٍ يَجِبُ تَأْكِيدُهُ بِضَمِيرٍ مُنْفَصِلٍ ، نَحْوُ (جَلَسْتُ أَنـا وَسَعِيدٌ) إلاّ إذا فُصِلَ ، نَحْوُ (كَتَبْتُ اليَومَ و خَالِدٌ).

وإِذا عُطِفَ عَلَى الضَّمِيرِ المَجْرُورِ المُتَّصِلِ يَجِبُ إعادَةُ حَرْفِ الجَرِّ فِي المَعْطُوفِ ، نَحْوُ (مَرَرْتُ بِكَ وَبِسَعِيدٍ)

---

## وانەی بیستەم

### بەشی دووهەم: عەتف بەهۆی حەرفەکانەوە ( لێکدان بەهۆی ئامرازەوە )

عەتفکراو بە هۆی حەرفەوە: تابیعێکە ئەوەی کە نیسبەت دراوەتە پاڵ مەعتوفەکەی نیسبەت دەدرێتە پاڵ ئەمیش، و هەردووکیشیان مەبەستن لەو نیسبەتدانەدا، پێیشی دەوترێت عەتفی نەسەق، مەرجەکەیشی ئەوەیە کە لە نێوان ئەم مەعتوفە و مەتبوعەکەیدا یەکێك لە حەرفەکانی عەتف هەبێت، وەك: (قام سعیدٌ وخالدٌ)، کە ئەمانەش هەندێکن لەو حەرفانەی عەتف: (واو، فاء، ثمّ، أو) بە یارمەتی خوا لە بەشی سێیەمدا باسیان لێوە دەکەین.

ئەگەر شتێکمان عەتف کردە سەر ضەمیری موتتەصیل -جێناوی- لکاو ئەوە پێویستە تەئکیدی بکەینەوە بە ضەمیرێکی مونفەصیل - سەربەخۆ-، وەك: (جلست انا وسعیدٌ)، ئەمەش کارێکی پێویستە تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە شتێك کەوتبێتە نێوانیانەوە، وەك: (کتبت الیوم و خالدٌ).

ئەگەر شتێکمان عەتفکردە سەر ضەمیری مەجروری موتتەصیل، ئەوە پێویستە حەرفە جەڕەکە بە مەعتوفەکەوە دووبارە بکەینەوە، وەك:(مررت بك و بسعید).

والمَعْطُوفُ فِي حُكْمِ المَعْطُوفِ عَلَيهِ ، أَيْ إذا كَانَ الأَوَّلُ صِفَةً ، أَوْ خَبَراً ، أَوْ صِلَةً ، أَوْ حالاً، فالثَّاني كَذلِك ، وَالضَابِطَةُ فِيهِ أنَّهُ إذا جَازَ أنْ يَقُومَ المَعْطُوفُ مَقَامَ المَعْطُوفِ عَلَيْهِ ، جَازَ العطف، وإلاّ فَلا.

والعطف عَلَى مَعْمُولَيْ عَامِلَيْنِ مُخْتَلِفَيْنِ جَائِزٌ إذا كَانَ المَعْطُوفُ عَلَيْهِ مَجْرُوراً و مُقَدَّماً عَلَى المَرْفُوعِ. والمَعْطُوفُ كذلِك ، أَيْ مَجْرُورٌ ، نَحْوُ (فِي الدَّار زَيْدٌ والحُجْرَةِ عَمْرٌو).

**الخُلاصَةُ:**

المَعْطُوفُ بِالحُرُوفِ ، هُوَ تَابِعٌ يَتَوَسَّطُ بَيْنَهُ و بَيْنَ مَتْبُوعِهِ أَحَدُ حُرُوفِ العطف ، و يُسَمَّى (عطف النَّسَقِ) أَيْضاً.

---

حوكمی مەعتوف هەمیشە وەك مەعتوف عەلەیهی وایە، -واتە: ئەو شتەی کە ئەم عەتف کراوەتە سەری-، واتە ئەگەر یەکەم صیفەت بوو، یان خەبەر، یان صیلە، یان حاڵ، ئەوە دووهەمیش وەهایە، یاسای عەتفیش بریتیە لەوەی: ئەگەر دروست بوو مەعتوفەکە لە جێگای مەعتوف عەلەیهیەکەدا دابنێن ئەوە عەتفەکەمان دروستە، ئەگەر نا ئەوە دروست نیە.

دروستە عەتف بکەینە سەر مەعمولی دوو عامیلی جیاواز، ئەگەر مەعتوف عەلەیهیەکە مەجرور و پێشکەوتوو بوو بەسەر مەرفوعەکەدا و مەعتوفەکەش بە هەمان شێوە بوو، واتە مەجرور بوو، وەك: (في الدار زيدٌ و الحجرة عمرٌو) [1].

**پوختە**

مەعتوف بە حەرف: تابیعێکە حەرفێك لە حەرفەکانی عەتف ئەکەوێتە نێوانیەوە و نێوان مەتبوعەکەیەوە، پێیشی ئەوترێت عەتفی نەسەق.

---

١ لەم نموونەیەدا (الحجرة) عەتف کراوەتە سەر (الدار) ، هەروەها (عمرٌو) عەتفکراوەتە سەر (زيدٌ) بە هۆی یەك حەرفەوە کە (واو)ـە ، ئەمەش تەنها لەم حاڵەتەدا دروستە کە هەردوو ڕستەکە پێك هاتوون لە موبتەدا و خەبەر ، و خەبەرەکانیان جار و مەجرورن ، و پێش کەوتوون بەسەر دوو موبتەداکەدا .

و حُكْمُ المَعْطُوفِ هُوَ حُكْمُ المَعْطُوفِ عَلَيْهِ فِي جَمِيعِ الأَحْكَامِ ، ومَتَى عطف عَلَى ضَمِيرٍ مَرْفُوعٍ مُتَّصِلٍ يَجِبُ تَأْكِيدُهُ بِضَمِيرٍ مُنْفَصِلٍ ، أَوْ يُفْصَلُ بَيْنَهُمَا بِفَاصِلٍ.

و يَجِبُ إِعَادَةُ حَرْفِ الجَرِّ فِي المَعْطُوفِ عَلَى الضَّمِيرِ المَجْرُورِ المُتَّصِلِ.

و يَجُوزُ العطف عَلَى مَعْمُولَيْ عَامِلَيْنِ مُخْتَلِفَيْنِ ، إذا كَانَ المَعْطُوفُ عَلَيْهِ مَجْرُوراً ، وَ مُقَدَّماً عَلَى المَرْفُوعِ ، والمَعْطُوفُ مَجْرُوراً و مُقَدَّماً عَلَى المَرْفُوعِ أَيْضاً.

---

حوكمی مەعتوف هەمان حوكمی مەعتوف عەلەیهیەكەیەتی لە هەموو حوكمەكاندا، هەركاتێكیش شتێك عەتفكرایە سەر ضەمیری مەرفوعی موتتەصیل ئەوە پێویستە تەئكیدی بكەینەوە بە ضەمیرێكی مونفەصیل، یان پێویستە شتێكی تر كەوتبێتە نێوانیانەوە.

پێویستە حەرفی جەڕ دووبارە بكەینەوە لەگەڵ مەعتوفەكەدا ئەگەر لەسەر ضەمیری مەجروری موتتەصیل عەتفكرابوویەوە.

دروستە عەتفكردن لەسەر دوو مەعمولی عامیلی جیاواز، ئەگەر مەعتوف عەلەیهیەكە مەجرور بوو و پێشكەوتبوو بەسەر مەرفوعەكەدا و مەعتوفەكەش بە هەمان شێوە مەجرور و پێشكەوتەبوو بەسەر مەرفوعەكەدا.

**أسئلة:**

١-عَرِّفْ عطف النَّسَقِ ، و مَثِّلْ لَهُ.

٢- عَدِّدْ بَعْضَ حُرُوفِ العطف.

٣-مَاذا يَجِبُ إذا عطفتَ عَلَى ضَميرٍ مُتَّصِلٍ؟ مثّلْ لذلِكَ.

٤-هَلْ يَجِبُ إعَادَةُ حَرْفِ الجَرِّ إذا عطفتَ عَلَى الضَّميرِ المَجْرُورِ المُتَّصِلِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٥-هَلْ يُعْرَبُ المُعْطُوفُ إعْرَابَ المَعْطُوفِ عَلَيْهِ؟ اُذكُرْ ذلِك مَعَ إيرادِ مِثالٍ.

---

**پرسیار:**

١. عەتفی نەسەق پێناسە بکەو نموونەی بۆ بهێنەوە.

٢. هەندێ لە حەرفەکانی عەتف بژمێرە.

٣. ئەگەر عەتفت کردە سەر ضەمیری موتتەصیل پێویستە چی بکەیت؟ نموونەی بۆ بهێنەوە.

٤. ئایا پێویستە حەرفی جەڕ دووبارە بکەیتەوە لەگەڵ مەعتوفەکەدا ئەگەر عەتفت کردە سەر ضەمیری مەجروری موتتەصیل؟ نموونەی بۆ بهێنەوە.

٥. ئایا مەعتوف بە هەمان ئیعرابی مەعتوف عەلەیهی ئیعراب دەکرێ؟ باسی لێوە بکە لەگەڵ هێنانەوەی نموونەدا.

## ڕاهێنان:

**لەمەعتوفێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:**

١-جَاءَتْ سَلمى و......... مِنَ السُّوقِ.

٢-ذَهَبَ سَعِيدٌ ثُمَّ......... إلى المَدْرَسَةِ.

٣-رَأَيْتُ أنا و......... الهِلالَ.

٤-سَافَرَ خَالِدٌ و......... بِالقِطَارِ.

٥-سَلَّمتُ عَلى أبِيكَ و عَلى..........

٦-مَرَرْتُ بِكَ و ..........

ب- حەرفێکی عەتفی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-قَرَأْتُ المَجَلَّةَ أنا......... أخِي.

٢-مَرَرْتُ بِأخِي......... بِعَمِّي.

٣-سَافَرْتُ أنا......... خالي.

٤-دَخَلَ خَالِدٌ......... سَعِيدٌ.

٥-أَكَلَ الطِّفْلُ......... الصَّبِيُّ.

ج-وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١- دوو ڕستە بهێنەوە کە مەعتوف عەلەیهیەکە تێیاندا پێویست بێت تەئکید بکرێتەوە بە ضەمیری مونفەصیل.

٢- دوو ڕستە بهێنەوە کە تێیاندا مەعتوف عەلەیهیەکە ضەمیری مەجرور بێت.

د-لەم ڕستانەی خوارەوەدا مەعتوفەکە دەربهێنە:

١-خُذْ هذا لَكَ وَ لأبِيكَ.

٢-خَرَجْتُ أنا و سَعِيدٌ مِنَ الدَّارِ.

٣-كَتَبَ الدَّرسَ خَالِدٌ وَ سَعِيدٌ.

٤-أَيَّدَ الشَّاهِدَ هذا وَ أَبُوهُ.

٥-اَلشِّتَاءُ بَارِدٌ ، وَالصَّيْفُ حَارٌّ.

هـ-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى:﴿اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ ﴾(البقرة/٣٥).

٢-اُنْصُرِ المَظْلُومَ ، و اضْرِبْ عَلى يَدِ الظَّالِمِ.

٣- قال تعالى:﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ﴾(الزخرف/٧٠).

٤-خَيْرُ الكَلامِ مَا قَلَّ وَ دَلَّ.

٥-أَرَدْتُ لَكَ وَ لأخِيكَ خَيْراً.

## الدرس الحادي والعشرون

## القِسْمُ الثَّالثُ: التَّاكيدُ

اَلتَّاكِيدُ ، هـُوَ تَابِعٌ يَدُلُّ عَلَى تَقْرِيرِ المَتْبُوعِ فِيمَا نُسِبَ إِلَيْهِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي زَيْدٌ نَفْسُـهُ) أَوْ يَدُلُّ عَلى شُمُولِ الحُكْمِ لِكُلِّ أَفْرَادِ المَتْبُوعِ ، مِثْلُ قوله تعـالى: ﴿فَسَـجَدَ الْمَلاَئِكَـةُ كُلُّهُـمْ أَجْمَعُونَ﴾(الحج/ر/٣٠).

والتَّأْكِيدُ عَلى قِسْمَيْنِ:

أ–لَفْظِيٌّ ، وهُوَ تَكْرِيرُ اللَّفْظِ الأوَّلِ بِعَيْنِهِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي زَيْدٌ زَيْدٌ ، جَاءَنِي جَاءَنِي زَيْدٌ ، قامَ قامَ زَيْدٌ) ، وَيَجُوزُ فِي الحُرُوفِ أَيْضاً نَحْوُ (إِنَّ إِنَّ زَيْداً قَائِمٌ).

ب–مَعْنَوِيٌّ: وهُوَ بِأَلفَاظٍ مَعْدُودَةٍ ، وهِيَ كِمَا يَلِي:

١–(النَّفْسُ وَ العَيْنُ)وهُمَا لِلوَاحِدِ، والمُثَنَّى، والمَجْمُوعِ بِاخْتِلافِ الصِّيغَةِ وَالضَّمِيرِ، مِثْلُ:

---

## وانەی بیست و یەکەم

## بەشی سێیەم: تەئکید (جەخت کردنەوە)

تەئکید: ئەو تابیعەیە کە جەخت لەسەر ئەوشتە دەکاتەوە کە نیسبەت دراوەتە پاڵ مەتبوعەکە، وەك:(جائني زيدٌ نفسه) یان دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی کە حوکمەکە هەموو تاکەکانی مەتبوعەکە دەگرێتەوە، وەك: ﴿ فسجد الملائكة كلّهم اجعون﴾.

تەئکیدیش دوو بەشە:

أ. لەفزی -زارەکی-: ئەمەش بریتیە لە دووبارەکردنەوەی خودی ووشەیەك، وەك: (جائني زيدٌ زيدٌ، جائني جائني زيد، قام قام زيدٌ) هەروەها تەئکیدکردنەوە لە حەرفیشدا دەبێت، وەك: (إنّ إنّ زيداً قائمٌ).

ب. مەعنەوی -واتایی-:ئەمەش بە چەند ووشەیەکی دیاریکراو دەبێت، وەك ئەمانە:

١. (النفس) و (العين) ئەم دووانەش بۆ موفرەد و بۆ موسەنا و بۆ جەمعیش دەبن، بەپێی جیاوازی ڕستەکەو ضەمیرەکە وەك:

(جاءَنِي زَيْدٌ نَفْسُهُ، والزَّيْدانِ أنْفُسُهُما، أَوْ نَفْساهُما وَالزَّيْدُونَ أَنْفُسُهُمْ) وكذلِك (عَيْنُهُ ، و أَعْيُنُهُما ، أوْ عِيْنَاهُمَا ، وأَعْيُنُهُمْ) ولِلمُؤَنَّثِ نَحْوُ (جَاءَتْنِي هِنْدٌ نَفْسُها ، والهِنْدَانِ أَنْفُسُهُمَا أوْ نَفْسَاهُمَا ، والهِنْداتُ أَنْفُسُهُنَّ) ، وكَذا (عَيْنُها ، و أَعْيُنُهُما ، أوْ عَيْناهُمَا ، و أَعْيُنُهُنَّ).

٢-(كِلاَ وَكِلْتا)وهُمَا لِلمُثَنَّى خَاصَّةً، نَحْوُ (قَامَ الرَّجُلانِ كِلاَهُمَا، وقَامَتِ المَرْأَتَانِ كِلْتاهُمَا).

٣- (كُلٌّ ، و أَجْمَعُ ، و أَكْتَعُ ، وأَبْتَعُ ، وأبْصَعُ) وهِيَ لِغَيْرِ المُثَنَّى بِاخْتِلافِ الضَّمِيرِ فِي (كُلّ)، تَقُولُ: (اِشْتَرَيْتُ البُسْتَانَ كُلَّهُ ، و جَاءَنِي القَوْمُ كُلُّهُمْ ، واشْتَرَيْتُ الحَدِيقَةَ كُلَّها ، و جَاءَتِ النِّسَاءُ كُلُّهُنَّ) وبِاخْتِلافِ الصِّيغَةِ فِي البِواقِي ، وهِيَ (أَجْمَعُ.... إلخ)

---

(جاءني زيدٌ نفسهُ) و (الزيدان انفسهما) یان (نفساهما) و (الزيدون انفسهم) هەروەها (عينه) و (اعينهما) یان (عيناهما) و (اعينهم). هەروەها بۆ مونەنەسیش بەم شێوەیە دەوترێت: (جائتني هندٌ نفسها) و (الهندان انفسهما) یان (نفساهما) و (الهندات انفسهن) هەروەها: (عينها) و (اعينهما) یان (عيناهما) و (اعينهن).

٢. (كلا) و (كلتا)، ئەم دووانەش تایبەتن بۆ موسەنا، وەك: (قام الرجلان كلاهما) و (قامت المراتان كلتاهما).

٣. (كل) و (اجمع) و (اكتع) و (ابتع) و (ابصع)، ئەمانەش تەنها بۆ موسەنا بەكار ناهێنرێن، ئیتر بۆموفرەد و جەمع بەكار دەهێنرێن، لە (كل) دا بە هۆی گۆڕانی ضەمیرەكەیەوە جیا دەكرێتەوە كە بۆ چی دەبێت، وەك: (اشتريت البستان كله، جائني القوم كلهم، اشتريت الحديقة كلها، جاءت النساء كلهن)[1]، هەروەها بە هۆی گۆڕانكاری لە صیغەی ووشەكەوە لەوانی تردا ، كە بریتین لە (اجمع و.....هتد)

---

[1] نموونەی یەكەمیان بۆ موفرەدی موزەكەر دەبێت و دووهەمیان بۆجەمعی موزەكەر و سێیەمیان بۆ موفرەدی مونەنەس و چوارەمیان بۆجەمعی مونەنەس .

تَقُولُ: (اِشْتَرَيْتُ البُسْتَانَ كُلَّهُ أَجْمَعَ أَكْتَعَ أَبْتَعَ أَبْصَعَ ، و جَاءَنِي القَوْمُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ أَكْتَعُونَ أَبْتَعُونَ أَبْصَعُونَ ، واشْتَرَيْتُ الحَدِيقَةَ كُلَّها جَمْعَاءَ كَتْعَاءَ بَتْعَاءَ بِصْعَاءَ ، وقَامَتِ النِّساءُ كُلُّهُنَّ جُمَعُ كُتَعُ بُتَعُ بُصَعُ).

وَإذا أَرَدْتَ تَأْكِيدَ الضَّمِيرِ (المَرْفُوعِ) المُتَّصِلِ بِـ (النَّفْسِ و العَيْنِ) يَجِبُ تَأكِيدُهُ بِضَمِيرٍ مَرْفُوعٍ مُنْفَصِلٍ ، تَقُولُ ، (ضَرَبْتَ أَنْتَ نَفْسُكَ).

وَلاَ يُؤَكِّدُ بِـ (كُلّ و أَجْمَعَ) إلاّ مَا لَهُ أَجْزاءٌ وَ أَبْعاضٌ يَصِحُّ افْتِراقُها حِسّاً نَحْوُ (القَوْمِ) فِي جاءَنِي القَومُ كُلُّهُم أَجْمَعُونَ ، أَوْ حُكْماً ، كَمَا تَقُولُ: (اِشْتَرَيْتُ البَيْتَ كُلَّهُ) ، وَلاَ تَقُولُ (أَكْرَمْتُ الضيفَ كُلَّهُ).

---

دەڵێیت: (اشتريت البستان كله اجمع اكتع ابتع ابصع، جاءني القوم كلهم اجمعون اكتعون ابتعون ابصعون، اشتريت الحديقة كلها جمعاء كتعاء بتعاء بصعاء، قامت النساء كلهن جُمَع كُتع بتع بُصع)[1].

ئەگەر ویستت ضەمیری مەرفوعی موتتەصیل تەئکید بکەیتەوە بە (نفس) یان (عین) ئەوە پێویستە تەئکیدی بکەیتەوە بە ضەمیرێکی مەرفوعی مونفەصیل، دەڵێین:(ضربت انت نفسكَ).

ناتوانین بە (كلّ) یان (اجمع) شتێك تەئکید بکەینەوە جگە لەو شتانەی کە بەش و پارچەیان هەبێت و دروست بێت ئەو پارچەو بەشانە لە یەکتر جیا بکرێنەوە بە شێوەیەکی هەستپێکراو وەك:(القوم) لە ڕستەی (جاءني القوم كلهم أجمعون) یاخود لەحوکمی جیابوونەوەدان وەك:(اشتريت البيت كله)[2]، بەڵام بە پێچەوانەوە ناڵێیت: (اكرمت الضيف كله).

---

١ نموونەکان بەهەمان شێوەی نموونەکانی پێشوون .

٢ لێرەدا (البيت) واتە خانوو هەرچەندە هەموو بەشەکانی و ژوورەکانی دەگرێتەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەگەری ئەوەی هەر لێدەکرێت کە بەش بەش بکرێت بۆ چەند ژوورێك یان پارچەیەك و کڕینەکە تەنها ڕووی لە بەشێکی کردبێت، ئەوە بە دروست گەڕاوە کە بەو شێوەیە تەئکید بکرێتەوە.

وَاعْـلَمْ أَنَّ (أَكْتَعَ) وَ أَخَوَاتِها أَتْبَاعٌ لِـ (أَجْمَعَ) إِذْ لَيْسَ لَهَا مَعْنىً دُونَهَا وَلاَ يَجُوزُ تَقْدِيمُهَا عَلَى (أَجْمَعَ) ولا يَجُوزُ ذِكْرُهَا دُونَهَا.

اَلْخُلاصَةُ:

اَلتَّأْكِيدُ تَابِعٌ يَدُلُّ عَلى تَقْرِيرِ المَتْبُوعِ فِيمَا نُسِبَ إِلَيْهِ ، اَوْ يَدُلُّ عَلـى شـمُولِ الحُكْـمِ لِكُلِّ أَفْرادِ المَتْبُوعِ. التَّأْكِيدُ عَلَى قِسْمَيْنِ:

أ-لَفْظِيٌّ ، وهُوَ تَكْرَارُ اللَّفْظِ الأَوَّلِ بِعَيْنِهِ ، و يَجُوزُ تَكْرَارُ الحُرُوفِ أَيْضاً.

ب-مَعْنَوِيٌّ: يَتَحَقَّقُ بِالفَاظٍ مَخْصُوصَةٍ ، وَهِيَ:

١-نَفْسٌ و عَيْنٌ.

٢ -كِلا وكِلْتَا (المُضافَتانِ إلى المُضْمَرِ)

٣-كُلٌّ ، وأَجْمَعُ وأَخَواتُها.

---

بزانە کە (اکتع) و هاوشێوەکانی هەموو تابیعی (اجمع)ن، چونکە بەبێ (اجمع) هیچ مانایەکیان نیە و دروستیش نیە پێش بکەون بەسەریدا و دروستیش نیە بەتەنها بە بێ (اجمع) تەئکیدیان پێ بکەینەوە.

پوختە

تەئکید: تابیعێکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە نیسبەت دراوەتە پاڵ مەتبوعەکە، یان دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی کە حوکمەکە گشتگیرە بۆ هەموو تاکەکانی مەتبوعەکە.

تەئکید دووبەشە:

أ. لەفزی: کە بریتیە لە دووبارەکردنەوەی ووشەکەی پێشوو وەك خۆی، دروستیشە دووبارەبووەکە حەرف بێت.

ب. مەعنەوی: ئەمەش بە چەند ووشەیەکی دیاریکراو دەبێت، کە بریتین لە:

١. نفس، عین.

٢. کلا، کلتا (بەمەرجێ ئیزافە کرابن بۆ ضەمیرێك)

٣. کل، اجمع و هاوشێوەکانی.

لا يُؤَكَّدُ الضَّمِيرُ المَرْفُوعُ المُتَّصِلُ بِالنَّفْسِ والعَيْنِ إلاّ بَعْدَ تأْكِيدِهِ بِضَمِيرِ رَفْعٍ مُنْفَصِلٍ.

وشَرْطُ التَّأْكِيدِ بِلَفْظَيْ (كُلّ ، وَأجْمَعَ) صِحَّةُ افْتِراقِ أجزاءِ المُؤَكَّدِ حِسّاً أَوْ حُكْماً.

ولاَ يَجُوزُ ذِكْرُ (أَكْتَعَ) و أَخَواتِهَا فِي الكَلاَمِ إلاّ بَعْدَ ذِكْرِ (أَجْمَعَ).

**أسْئِلَة:**

١-عَرِّفِ التَّأْكِيدَ ، ومَثِّلْ لَهُ.

٢-مَا هِيَ أَقْسامُ التَّأْكِيدِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٣-كَيْفَ تُؤَكِّدُ تأْكِيداً لَفظِياً؟ مَثِّلْ لذلِك.

٤-مَا هِيَ الألفاظُ الَّتِي يُؤَكَّدُ بِها مَعْنَوِيّاً؟ مَثِّل لَها.

٥-بِمَ تُؤَكِّدُ المُثَنّى؟ وبِمَ تُؤَكِّدُ الجَمْعَ؟ اِشْرَحْ ذلِك وَمَثِّلْ لَهُما.

٦-كَيْفَ تُؤَكِّدُ الضَّمِيرَ المُتَّصِلَ بِالنفْسِ وَالعَيْنِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

---

ضەمیری مەرفوعی موتتەصیل تەئکید ناکرێتەوە بە (نفس) و (عین) تاوەکو ضەمیرەکە تەئکید نەکەینەوە بە ضەمیرێکی ڕەفعی مونفەصیل.

مەرجی تەئکید بە هەردوو ووشەی (کل)و (اجمع) ئەوەیە دروست بێت پارچەکانی تەئکید کراوەکە بەشێوەیەکی هەست پێکراو لەیەکتری جیابکرێنەوە یان لە حوکمی لەیەکجیابوودا بن.

دروست نیە بۆ تەئکید (ابتع) و هاوشێوەکانی بەکار بهێنین بە دوای (اجمع) دا نەبێت.

**پرسیار:**

١. پێناسەی تەئکید بکەو نموونەی بۆ بهێنەوە.

٢. بەشەکانی تەئکید چین؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

٣. چۆن تەئکیدێکی لەفزی دەکەیت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. ئەو ووشانە چین کە تەئکیدی مەعنەوییان پێ دەکرێت؟ نموونەیان بۆ بهێنەوە.

٥. بە چی موسەنا تەئکید دەکەیتەوە؟ ئەی بە چی جەمع تەئکید دەکەیتەوە؟ ئەمانە ڕوون بکەوەو نموونەیان بۆ بێنەوە.

٦. چۆن ضەمیری موتتەصیل تەئکید دەکەیتەوە بە نفس و عین؟ نموونەی بۆ بهێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ- لەم نموونانەدا ئەو ووشانەی کە تەئکیدیان پێ دەکرێتەوە دیاری بکە و جۆرەکەیان بڵێ:

١-إنَّ إنَّ الوَلَدَ نَائِمٌ.            ٢- جاءَ جاءَ سَعِيدٌ.

٣-هذِهِ خالَتُكَ عَيْنُها.            ٤-أَنْتَ نَفْسُكَ لَمْ تُعْطِ أخاكَ حَقَّهُ.

٥-جَاءَتِ المُعَلِّمَاتُ أَنْفُسُهُنَّ.            ٦-أَكَلْتُ أنا البُرتُقالَ.

٧-ذَهَبَ الطِّفْلان كِلاَهُمَا.

ب-تەئکیدێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆ شاییانەی خوارەوە:

١-جاءَ أَبُوكَ..........

٢-رَأَيْتُ أَخاكَ..........

٣-سافَرَ الطّالِبَان..........

٤-......... اَلطِّفْلَ ذَكِيٌّ.

٥-......... ذَهَبَ إلى السُّوقِ.

٦-اِشْتَرَيْتُ الكُتُبَ ..........

٧-قَرَأْتُ المَجلاّتِ......... .

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-سَافَرَ سَافَرَ سَعِيدٌ.

٢- قال تعالى:﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ﴾(الشعراء/١٧٠).

٣- قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾(البقرة/٣١).

٤-إنَّ إنَّ الخَمْرَ مُحَرَّمَةٌ.

## الدرس الثاني والعشرون

### اَلقِسمُ الرابِعُ: اَلبَدَلُ

اَلبَدَلُ، تَابِعٌ نُسِبَ إِلَيهِ مَا نُسِبَ إِلى مَتْبُوعِهِ وهُوَ المَقْصُودُ بِالنِّسْبَةِ دُونَ مَتْبُوعِهِ.

واقْسامُ البَدَلِ أَرْبَعَةٌ:

١ .بَدَلُ الكُلِّ مِنَ الكُلِّ، وَهُوَ مَاكَانَ مَدْلُولُهُ تَمامَ مَدْلُولِ المَتْبُوعِ، نَحْوُ(جَاءَنِي صَالِحٌ اخُوكَ).

٢-بَدَلُ البَعْضِ مِنَ الكُلِّ، وهُوَ مَا كَانَ مَدْلُولُهُ جُزءَ مَدلولِ المَتْبُوعِ، نَحْوُ (قَرَأْتَ الكِتابِ أوَّلَهُ).

---

## وانەی بیست و دوو

### بەشی چوارەم: بەدەل[1]

بەدەل: تابیعێکە ئەوەی نیسبەت دراوەتە پاڵ مەتبوعەکەی دراوەتە پاڵی و هەر ئەمیش مەبەستە لە نیسبەتەکەدا نەك مەتبوعەکە. بەدەل دەکرێت بە چوار بەشەوە:

١. بەدەلی (کل من الکل): ئەوەیە کە واتاکەی تەواوی واتای مەتبوعەکەیەتی، وەك: (جاءني صالح اخوك)[2].

٢. بەدەلی (.بعض من الکل): ئەوەیە کە واتاکەی بەشێکە لە واتای مەتبوعەکە، وەك: (قرات الكتاب اوله)[3].

---

١ لە کوردیدا ناوترێت: (ساڵح هات براکەت) (کتێبەکەم خوێندەوە سەرەتاکەی) (سەرم سوڕدەمێنێ لە عەلی عیلمەکەی) بەڵکو دەوترێت: (ساڵحی برات هات) (سەرەتای کتێبەکەم خوێندەوە) (سەرم لە عیلمی عەلی سوڕدەمێنێ)، بە نیسبەت بەدەلی غەڵەتیشەوە لە کوردیدا شتێکی وام بەرچاو نەکەوت کە جێگای متمانە بێت. بۆیە وەرگێڕانی کوردی ڕستە عەرەبیەکان تەنها بۆ ڕوونکردنەوەیە نەك ئەوەی لە کوردیدا بە هەمان شێوە بەکار بهێنرێن.

٢ واتە: ساڵح هات بۆ لام براکەت، کە (اخوك) دەبێتە بەدەل بۆ (صالح).

٣ واتە: کتێبەکەم خوێندەوە سەرەتاکەی، کە (اوله) دەبێتە بەدەل بۆ (الكتاب).

٣-بَدَلُ الاشتِمالِ ، وهوَ مَا كَانَ مَدْلُولُهُ مُتَعَلِّقاً بِالْمَتْبُوعِ نَحْوُ (سُلِبَ زَيْدٌ ثَوْبُهُ ، وأَعْجَبَنِي عَلِيٌّ عِلْمُهُ).

٤-بَدَلُ الغَلَطِ، وهُوَ مَا يُذْكَرُ بَعْدَ الغَلَطِ، نَحْوُ (جَاءَنِي زَيْدٌ جَعْفَرٌ، ورَأَيْتُ بَغلاً حِماراً).

والبَدَلُ إنْ كانَ نَكِرَةً مِنْ مَعْرِفَةٍ يَجِبُ نَعْتُهُ كَقَوْلِهِ تَعَالى:﴿لَنَسْفَعَنْ بِالنَّاصِيَةِ(١٥)نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ﴾(العلق/١٥،١٦) ولايَجِبُ ذلِك فِي عَكْسِهِ نَحْوُ قَوْلِهِ تَعالى:﴿ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٥٢)صِرَاطِ اللَّهِ﴾(الشورى/٥٢،٥٣)وَلا فِي الْمُتَجَانِسَيْنِ مِنْ حَيْثُ التَّعْرِيفُ والتَّنْكِيرُ،

---

٣. بەدەلی ئیشتیمال: ئەوەیە کە واتاکەی شتێك ئەگەیەنێت کە پەیوەستە بە مەتبوعەکەوە، وەك: (سلب زيدٌ ثوبه) و (اعجبني عليٌ علمه) [1].

٤. بەدەلی غەڵەت: ئەوەیە کە بەدوای هەڵەکردندا دەوترێت، وەك:(جاءني زيدٌ جعفرٌ) (رايت بغلاً حمارا)[2]. بەدەل ئەگەر خۆی نەکیرە بوو بەڵام بەدەل بوو لە مەعریفەیەك، ئەوە پێویستە وەصفی بکەین، وەك: ﴿ لنسفعاً بالناصية ناصية كاذبة﴾[3]، بەڵام لە پێچەوانەکەیدا ئەمە پێویست نیە، وەك:﴿الى صراط مستقيم صراط الله﴾[4].

بەهەمان شێوە پێویست نیە ئەگەر بەدەل بوو لە شتێکی وەك خۆی لە تەعریف و تەنکیردا،

---

١ لەم دوو نموونەدا(ثوب) و(علم) هەمان(زيد)و(علي)نیـن بەڵکو شتانێکن کە پەیوەستن بەوانەوە.

٢ (جعفر)و(حمار) نە هەمان (زيد) و (بغل)ـەکەن نە بەشێکن لێیان نە شتانێکن پەیوەستبن پێیانەوە بەڵکو بێژەرەکە لە ووتنیاندا سەهووی کردووە، بۆیە هەڵەکەی ڕاست دەکاتەوە، بەوەی کە خێرا ئەو ناوەی کە ڕاستە و مەبەستی بووە بەدوای ناوە بە هەڵە ووتراوەکەدا دەهێنێت لەهەمان ڕستەدا .

٣ لێرەدا (ناصية)ی دووهەم بەدەلە لە(الناصية)ی یەکەم، لەبەرئەوەی یەکەم (ال)ی بەسەرەوەیە و مەعریفەیە نابێت نەکیرەیەك ببێتە بەدەلی، بۆیە پێویست بووە (ناصية)ی دووەم بکرێتە مەعریفە بە وەصف کردنی بە ووشەی (كاذبة) ئەو کاتە دروستە ببێتە بەدەلی (الناصية) کە مەعریفەیە .

٤ (صراط) هەرچەند بە ووشەی(مستقيم) وەصفکراوە بەڵام نەبوەتە مەعریفە چونکە صیغەتەکەشی هەر نەکیرەیە، بەڵام (صراط)ی دووهەمیان ئیزافە کراوە بۆ لای ووشەی پیرۆزی (الله) کە مەعریفەیە و لێیەوە مەعریفەبوونی دەست کەوتووە .

نَحْوُ قَوْلِهِ تَعالى:﴿ اهْدِنا الصِراطِ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذيَن..﴾(الفاتحة)، وَجَاءَنِي رَجُلٌ غلامٌ.

## القِسْمُ الخامِسُ

## عَطفُ البيَانِ

عَطْفُ البَيَانِ ، تَابِعٌ غَيْرُ صِفَةٍ يُوَضِّحُ مَتْبُوعَهُ ، وَهُوَ أَشْهَرُ اسْمَيْ شَيْءٍ نَحْوُ:(قَالَ أَبُو عَبْدِ اللّهِ الصادق، اخْبَرَنَا أمير المؤمنين عليّ عليه السلام).

### الخُلاصَةُ:

اَلبَدَلُ: تَابِعٌ يُوضِّحُ المَتْبُوعَ ، ويُنْسَبُ إِلَيْهِ مَا يُنْسَبُ إِلى مَتْبُوعِهِ. وهُوَ المَقْصُودُ بِالنِّسْبَةِ.

---

وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿اهْدِنا الصِراطِ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذيَن..﴾[1]، یان (جاءني رجلٌ غلامٌ).

## بەشی پێنجەم

### عەتفی بەیان (پارستەی ناوەڵناوی)

عەتفی بەیان: تابیعێکە صیفەت نیە و مەتبوعەکەی ڕوون دەکاتەوە و مەشهورترینی دووناوی شتێکە[2]، وەك: (قال ابو عبدالله الصادق)، (اخبرنا امیر المؤمنین عليّ علیه السلام) [3]

### پوختە

بەدەل: تابیعێکە مەتبوعەکەی ڕوون دەکاتەوە، و هەرشتێك نیسبەت درابێتە پاڵ مەتبوعەکەی نیسبەت دەدرێتە پاڵی ، و مەبەستی سەرەکی لە نیسبەتەکە ئەمە.

---

١ (صراط)ی دووهەم بووەتە مەعریفە چوونکە ئیزافە کراوە بۆ لای (الذین) کە مەعریفەیە .

٢ بەمەدا دەردەکەوێت کە ئەو شتەی کە عەتفی بەیانی بۆ دەهێنرێت پێویستە دوو ناوی هەبێت، یەکەمجار ئەو ناوەی دەڵێین کە زۆر ناسراو نییە و پاشان ناوی دووەمیان کە ناوە مەشهورەکەیەتی بەدوایدا دەهێنین و دەیکەینە عەتفە بەیانی ناوی یەکەم.

٣ لەم دوو نموونەیەدا (ابو عبدالله) و (الصادق) دوو ناون بۆ یەك کەس ، هەروەها (امیر المؤمنین) و (علیّ)ش بە هەمان شێوە ، بەڵام هەریەکە لە (الصادق) و (علیّ) مەعریفەترن لە (ابو عبدالله) و (امیر المؤمنین) چونکە کەسانی تر زۆرن کە بەو دوو ناوەوە ناسراون ، لەبەر ئەوە بە هەریەکە لە (الصادق) و (علیّ) دەوترێت عەتفی بەیان .

أقْسامُ البَدَلِ: ١-بَدَلُ الكُلِّ مِنَ الكُلِّ.
٢-بَدَلُ البَعْضِ مِنَ الكُلِّ.
٣-بَدَلُ الاشْتِمال.
٤-بَدَلُ الغَلَطِ.

شَرْطُ البَدَلِ مِنَ المَعْرِفَةِ بِالنَّكِرَةِ:أنْ تَكُونَ النَّكِرَةُ مَوْصُوفَةً.

عَطْفُ البَيانِ ، تابِعُ يَدُلُّ عَلى التَّوضِيحِ والتَّخْصِيصِ ، وهُوَ أشْهَرُ اسْمَى المَتْبُوعِ.

**أسئلة:**

١-عَرِّفِ البَدَلَ ، و مَثِّلْ لَهُ.
٢-مَا هُوَ عَطْفُ البَيَان؟
٣-مَا هِيَ أنْواعُ البَدَلِ؟ عَدِّدْهَا ، ومَثِّلْ لَها.
٤-هَلْ يُبْدَلُ مِنَ المَعْرِفَةِ بِنكِرَةٍ أمْ لا؟ اِشْرَحْ ذلِك و مَثِّلْ لَهُ.

---

بەشەکانی بەدەل: ١. بەدەلی (کل من الکل).
٢. بەدەلی (بعض من الکل).
٣. بەدەلی ئیشتیمال.
٤. بەدەلی غەڵەت.

مەرجی بەدەلی نەکیرە لە شتێکی مەعریفە ئەوەیە کە نەکیرەکە وەصف بکرێت.

عەتفی بەیان: تابیعێکە دەلالەت دەکاتە سەر ڕوونکردنەوە و تایبەتکردن، و پێك هاتووە لە ناسراوترینی دووناوی مەتبوعەکە.

**پرسیار:**

١. بەدەل پێناسە بکە و نموونەی بۆ بێنەوە.
٢. عەتفی بەیان چیە؟
٣. جۆرەکانی بەدەل کامانەن؟ بیانژمێرە، و نموونەیان بۆ بێنەوە.
٤. ئایا نەکیرە دەبێتە بەدەلی نەکیرە یاخود نا؟ ئەمە ڕوون بکەرەوە و نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

ا. عەتفی بەیان و بەدەل لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە و جۆرەکەی بنووسە:

١-مَا أَعْظَمَ جِهَادَ أَبِي عبيدةَ عامرِ بن الجراحِ.

٢-سَافَرَ مَسْعُودٌ أَخُوكَ.

٣-كَسَرْتُ القِنِّينَةَ رَأْسَهَا.

٤-رَأَيْتُ مَجِيداً حَامِداً.

٥-أَعجَبَنِي أَبُوكَ عِلْمُهُ.

ب-عەتفە بەیانێك یان بەدەلێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆ شاییانەوە:

١-رَأَيْتُ صَادِقاً..........

٢-قَرَأَ حَمِيدٌ الكِتَابَ............

٣-سَافَرَ عَامِرٌ..........

٤-سُرِقَ البَيْتُ............

٥-أَعْطَيْتُ أَخَاكَ........... الكِتَابَ.

٦-قَالَ أَبُو الحَسَنِ............

٧-يُهِمُّنِي أَبُوكَ..........

ج-وەڵامی ئەم داواکاریانە بدەرەوە:

١-دوو ڕستە بێنەوە کە بەدەلی ئیشتیمالیان تێدا بێت.

٢-دوو ڕستە بهێنەوە کە بەدەلی (بعض من الكل)یان تێدابێت.

٣-دووڕستە بێنەوە کە هەریەکەیان عەتفی بەیانی تێدابێت.

ـ ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ (٧)﴾(الفاتحة /٦-٧).

٢-حَضَرَ أبو مُحَمَّدٍ طلحةُ.

٣-بَرَيْتُ القَلَمَ رَأْسَهُ.

٤-يُعْجِبُنِي أَخُوكَ حِلْمُهُ.

٥-جَاءَ أَخُوكَ قَاسِمٌ.

٦-رَأَيْتُ عَمَّكَ خَالَكَ.

## الدرس الثالث والعشرون

## اَلبَابُ الثَّانِي فِي الاسْمِ المَبْنِيِّ

اَلاسْمُ المَبْنِيُّ: مَا لا يَخْتَلِفُ آخِرُهُ بِاخْتِلافِ العَوامِلِ ، ويكُونُ ذلِك فِي المَوارِدِ التَّالِيَةِ:

أ-مَا وَقَعَ غَيْرَ مُرَكَّبٍ مَعَ غَيْرِهِ ، مِثْلُ (ألفْ ، باءْ ، تاءْ ، ثاءْ ... الخ)
وَمِثْلُ (أَحَد ، اِثْنان ، ثَلاثَة) ومِثْـلُ لَفْظِ (زَيْد) قَبْـلَ التَّرْكِيـبِ فَإِنَّـهُ مَبْنِـيٌّ بِالفِعْـلِ عَلـى السُّكونِ ومُعْرَبٌ بِالقُوَّةِ
ب-مَا شَابَهَ مَبْنِيَّ الأصْلِ بِأَنْ يَكُونَ فِي الدَّلالَةِ عَلى مَعْنَـاهُ مُحْتاجَـاً إلى قَرِينَـةٍ كَأَسْمـاءِ الإشارَةِ وَالَموصُولاتِ ، نَحْوُ (هؤُلاءِ ، مَنْ).

---

## وانەی بیست و سێ

### بابی دووهەم لە بارەی ئیسمە مەبنیەکانەوە

ئیسمی مەبنی: ئەوەیە کە کۆتاییەکەی بە هۆی عامیلە جیاجیاکانەوە نەگۆڕێت.

ئەویش لەم شوێنانەدا دەبێت:

ا. ئەوەی کە لەگەڵ حەرفێکی تردا تەرکیب نەکرابێت، وەك: (الف، باء، تاء، ثاء،.... هتد)[1]، هەروەها وەك (احد، اثنان، ثلاثة)[2] و، وەك ووشەی: (زید) پێش ئەوەی بخرێتە ڕستەوە، چونکە لەو حاڵەتەدا بە کردەیی مەبنی دەبێت لەسەر سکون بەڵام لە ڕووی قوەت و تواناوە موعرەبە.

ب. ئەوەی کە لە شتێك بچێت کە ئەو شتە لە بنەڕەتدا مەبنی بێت، وەك ئەوەی بۆ دەرکەوتنی واتاکەی پێویستی بە شتێکی تر هەبێت بۆ ئەوەی واتاکەی نیشان بدات، ئەمەش وەك: (ئیسمی ئیشارە، و ئیسمە مەوصولەکان، وەك: (هؤلاء، مَن).

ج-مَا كَانَ عَلى أَقَلَّ مِنْ ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ ، مِثْـلُ ضَمِيرِ (نا) فِي (جِئْتَنا).
د-مَا تَضَمَّنَ مَعْنىً مِنْ مَعانِي الحُرُوفِ ، مِثْـلُ (هذا) ومِنْ (أَحَدَ عَشَرَ إلى تِسْعَةَ عَشَرَ).

---

١ مەبەست لە :( ا ، ب، ت)ـە ...هتد، نەك ناوەکانیان کە لەسەرەوە هاتوون چونکە ئەوانە بەو شێوەیە موعرەبن نەك مەبنی.

٢ مەبەست ئەوەیە لە کاتی ژماردندا مەبنین، ئەگەرنا هەریەك لەوانە لە ڕستەدا موعرەبە.

وَحَرَكاتُ الاسْمِ المَبْنِيِّ تُسَمَّى ضَمّاً ، وَفَتْحاً ، وَكَسْراً ، وَسُكُونُهُ وقْفاً.

وبناءً عَلى مَا ذَكَرْنا يَنقَسِمُ الاسْمُ المَبْنِيُّ إلى الأقْسامِ التَّالِيَةِ:

١-المُضْمَراتُ. ٢-أَسْماءُ الإشارَةِ. ٣-المَوصُولاتُ. ٤-أَسْماءُ الأفعالِ.

٥-أسْماءُ الأصْواتِ. ٦-المرَكَّباتُ. ٧-اَلكِناياتُ. ٨-بَعْضُ الظَّرُوفِ.

**اَلنَّوعُ الأوَّلُ: المضمَراتُ**

اَلضَّمِيرُ: هُوَ اسْمٌ ما ، وُضِعَ لِيَدُلَّ عَلى مُتَكَلِّمٍ ، أَوْ مُخاطَبٍ ، أَوْ غَائِبٍ تَقدَّمَ ذِكْرُهُ.

وَلا بُدَّ لِضَمِيرِ الغائِبِ مِنْ مَرْجِعٍ يَرجِعُ إلَيهِ ، وهُوَ مَذْكُورٌ قَبْلَهُ لَفْظاً ، نَحْوُ (سَلِيمٌ حَضَرَ أَخُوهُ)

---

ج. ئەوەی کە حەرفەکانی کەمترین لە سێ حەرف، وەك ضەمیری (نا) لە ووشەی (جئتنا) دا.

د. ئەوەی مانایەك لە ماناکانی حەرفی گرتبێتەخۆ، وەك:(هنا)و لە(احدعشر)وە تا(تسعة عشر).

حەرەکەکانی ئیسمی مەبنی پێیان دەوترێت(ضم، فتح، کسر)سکونەکەش پێی دەوترێت (وقف).

کەواتە بەو پێیە ئیسمە مەبنیەکان دابەش دەبن بۆ ئەم بەشانەی خوارەوە:

١. ضەمیرەکان. ٢. ئیسمەکانی ئیشارە. ٣. مەوصولەکان. ٤. ئیسمی فیعلەکان.

٥. ئیسمەکانی صەوت. ٦. مورەکەبەکان. ٧. کینایەکان. ٨. هەندێ لە زەرفەکان.

**جۆری یەکەم: ضەمیرەکان ( جێناوەکان )**

ضەمیر: ئیسمێکە دانراوە بۆ ئەوەی دەلالەت بکات لە سەر موتەکەلیم یان موخاتەب یان غائیبێك کە پێشتر ناوبرابێت.

پێویستە هەمیشە ضەمیری غائیب مەرجەعێکی هەبێت کە بگەڕێتەوە بۆی، جا ئەو مەرجەعە پێشتر بە لەفزی ناوبرابێت، وەك: (سلیمٌ حضر اخوە)[1]

---

١ لەم نموونەیەدا (ە)ی (اخوە) دەگەڕێتەوە بۆ (سلیم) کە پێشتر ناوبراوە .

أَوْ مَعْنىً نَحْوُ قوله تعالى: ﴿ اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ (المائدة/٨).أوْ حُكْمَاً نَحْوُ قوله تعالى: ﴿..وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ..﴾ ( هود/٤٤) ، فَالضَّمِيرُ فِي (اسْتَوَتْ) يَعُودُ إلى سفينة نُوحٍ المعلومة مِن السِّياقِ.

اَلضَّمِيرُ عَلى قِسْمَيْنِ:

١-مُتَّصِلٌ:وهُوَ مَا لا يُسْتَعمَلُ وَحْدَهُ، وهُوَ إمّا مَرْفُوعٌ، نَحْوُ (ضَرَبْتُ...إلى ضَرَبْنَ) أَوْ مَنْصُوبٌ،نَحْوُ(ضَرَبَنِي...إلى ضَرَبَهُنَّ)أَوْ مَجْرُورٌ، نَحْوُ(غُلامِي، ولِي...إلى غُلامِهِنَّ ولَهُنَّ).

یان واتاکەی پێشتر ناوبرابرێت، وەك:﴿ اعدلوا هو أقرب للتقوى﴾[1]، یان لە حوکمی ناوبراودابێت، وەك:﴿واستوت علی الجودي﴾[2] لێرەدا ئەو ضەمیرەی کە لە ووشەی (استوت)دایە ئەگەڕێتەوە بۆ کەشتیەکەی نوح کە لە سیاقی ئایەتەکەوە دەیزانین.

ضەمیرەکان دەبن بە دوو بەشەوە:

١. موتتەصیل( لکاو ): ئەمەش بریتیە لەو ضەمیرانەی کە خۆیان بەتەنها بەکار نایەن. ئەمانیش یان مەرفوعن، وەك: (ضربت... تاوەکو.. ضربن)، یاخود مەنصوبن، وەك: (ضربني...تاوەکو...ضربهن) یان مەجرورن، وەك:(غلامي، لي..... تاوەکو.... غلامهن، لهن).

١ لێرەدا ضەمیری(هو) ئەگەڕێتەوە بۆ(العدل) واتە:(اعدلوا، العدل أقرب للتقوى)، لێرە ووشەی (العدل) لە ڕستەکەدا نەهاتووە بەڵام ووشەیەکی تر هەیە-(اعدلوا)- کە فیعلی ئەمرە و بۆ مەرجەعی ضەمیر ناشێت، بەڵام دەتوانین لە واتاکەیەوە ناوێك وەربگرین کە(العدل)ە و بیکەینە مەرجەعی ضەمیرەکە .

٢ لەم نموونەیەدا ئەو ناوەی کە ضەمیری موستەتیری ناو ووشەی (استوت)ی بۆ دەگەڕێتەوە ، لە ڕستەکەدا نەهاتووە ، بەڵام لە سیاقی ئایەتەکەدا لەپاش چەند ئایەتێکی تر هاتووە کە باس لە کەشتیەکەی نوح دەکات و پاشان باس لە لافاوەکە دەکات و پاشان جوڵەی کەشتیەکە و پاشان تەواو بوونی ڕووداوەکە ، ئینجا دەفەرموێت: (لەسەر شاخی جودی نیشتەوە) هەرکەسێك گوێی لە سەرەتای باسەکە بووبێت تێدەگات کە مەبەست لەو شتەی کە نیشتوەتەوە بریتیە لە کەشتیەکە ، بۆیە پێویستە بڵێین ضەمیری موستەتیری ناو ووشەی (استوت) بە دڵنیاییەوە دەگەڕێتەوە بۆ کەشتیەکە واتە:(الفلك) کە هەرچەندە ناو نەبراوە بەڵام وەك ئەوە وایە ناو برابێت.

٢-مُنفَصِلٌ ، وهُوَ مَا يُستَعْمَلُ وحْدَهُ ، وهُوَ أيْضاً إمّا مَرْفُوعٌ ، مِثْلُ (أنا... إلى هُنَّ) ، وإمّا مَنصُوبٌ ، مِثْلُ (إيّایَ... إلى إيّاهُنَّ) ، فلذلِك سَبْعُونَ ضَمِيراً.

والضّمِيرُ المَرْفُوعُ المُتَّصِلُ يَكُونُ مُستَتِراً فِي مَا يَلِي:

١-المَاضِي الغائِبُ والغائِبَةُ ، نَحْوُ عَليٌّ نَصَرَ الإسْلامَ وَفَاطِمَةُ أَعَزَّتِ النِّسَاءَ أيْ: (نَصَرَ هُوَ، وأَعَزَّتْ هِيَ)

٢-المُضَارِعُ المُتَكَلِّمُ ، مِثْلُ (أَنْصُرُ و نَنصُرُ).

٣-المُضَارِعُ المُخاطَبُ ، مِثْلُ (تَأكُلُ).

٤-الغائِبُ وَالغائِبَة مِثْلُ يَنصُرُ وتَنْصُرُ.

٥-اِسْمُ الفاعِلِ و المَفْعُولِ (الصِّفَة)

---

٢. مونفەصیل ( سەربەخۆ ): بریتیە لەو ضەمیرەی کە خۆی بەتەنها بەکار دەهێنرێت، ئەمیش یان مەرفوعە، وەك:(انا....تاوەکو...هنّ)، یان مەنصوبە، وەك:(إیاي.... تاوەکو... إیاهنّ)، بەم شێوەیە ژمارەیان دەبێتە حەفتا ضەمیر [1].

ضەمیری مەرفوعی موتتەصیل دەبێتە موستەتیر ( شاراوە ) لەم شوێنانەدا:

١. ماضی غائیبی موزەکەر و موئەنەس، وەك: (عليٌّ نصر الإسلام) و (فاطمةُ أعزّت النساء)، واتە: (نصر هو) و (اعزّت هي).

٢. موضاریعی موتەکەلیم: وەك:(انصرُ، ننصرُ)

٣. موضاریعی موتەکەلیم: وەك:(تأکلُ)

٤. موضاریعی غائیبی موزەکەر و موئەنەس، وەك:(ینصرُ، تنصرُ)

٥. ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول، (صیفەت).

---

١ ضەمیرە موتتەصیلە مەرفوعەکان١٤ دانەن مەنصوب و مەجرورەکانیش بەهەمان شێوە، کۆیان دەکاتە ٤٢، مونفەصیلە مەرفوعەکان ١٤ دانەن و مەنصوبەکانیش بەهەمان شێوە ، کۆیان دەکاتە ٢٨، کۆی گشتی موتتەصیل و مونفەصیل دەکاتە ٧٠ ، ئەوەش بزانە کە ضەمیری مونفەصیل مەجروریان نیە.

ولا يَجُوزُ استِعْمالُ المُنفَصِلِ إلاّ عِندَ تَعَذُّرِ المُتَّصِلِ نَحْوُ ﴿إيَّـاكَ نَعْبُـدُ﴾ (الفاتحـة/٥) ، و (مَا نَصرَكَ إلاّ أنَا).

## ضَميرُ الشأنِ و القصَّة

واعْـلَمْ أنَّ لَهُمْ ضَمِيراً غائِباً تَأتِي بَعْدَهُ جُملَةٌ تُفَسِّرُهُ، ويُسَمَّى(ضَمِيرَ الشَّأنِ) فِي المُذكَّرِ، و(ضَمِيرَ القِصَّةِ) فِي المُؤَنَّثِ، مِثْلُ قول تعالى:﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أحَدٌ﴾(الإخلاص/١)، وهِيَ هِندٌ مَلِيحَةٌ ، وإنَّها زَيْنَبُ قائِمَةٌ.

---

دروست نیە ضەمیری مونفەصیل بەکار بهێنین لەکاتێکدا نەبێت کە نەتوانین موتتەصیل بەکار بهێنین، وەك:﴿ إيّاك نعبد﴾[1]، و (ما نصرك إلاّ انا)[2].

### ضەمیری شەئن یان قیصصە[3]

بزانە کە لە عەرەبیدا ضەمیرێکی غائیب هەیە کە بە دوایدا ڕستەیەك دێت کە ڕاڤەی واتاکەی دەکات، کە پێی دەوترێت ضەمیری شەئن ئەگەر بۆ موزەکەر بەکار هێنرا، و ضەمیری قیصصە ئەگەر مۆئەنەس بوو، وەك:﴿قل هو الله أحدٌ﴾[4]، (هي هندٌ مليحة)، (إنها زينب قائمة)[5].

---

١ لێرەدا دروستە بڵێین: (نعبدك) بەڵام مانای ئایەتەکە دەگۆڕێت چونکە ئەو تەخصیص کردنەی کە لە(إيّاك نعبد)دا هەیە دەفەوتێ .

٢ لای زۆربەی زانایانی نەحو دروست نیە ضەمیری موتتەصیل بنوسێنین بە (اِلا)ی ئیستیسناوە .

٣ لە کوردیدا هاوشێوەی ئەم ضەمیرەم دەست نەکەوت.

٤ ضەمیری (هو) لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخ _الشأن_ ، واتاکەش وای لێ دێت: (پێیان بڵێ بارودۆخ ناوایە کە خوا تەنهایە).

٥ لەم دوو نموونەیەدا ضەمیرەکە دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆك_القصە_ واتاکەش وای لێ دێت:(چیرۆکەکە ناوایە هند خوێن گەرمە)، (چیرۆکەکە ناوایە کە زەینەب بەپێوەیە)، بەم پێیە دەبوایە دروست بوایە بڵێین (هو هند مليحه) بەڵام ئەمە نەبیستراوە، بەڵام لە کاتی نوسانیدا بە (رب)ەوە دەڵێین: (ربّه امراة) و پێویستیشە ضەمیرەکە لەم شوێنەدا موزەکەر بێت، کە ئەمەش ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو ضەمیرە بۆ پاش خۆی ناگەڕێتەوە بەڵکو ڕستەکەی پاشەوەی تەنها تەفسیری دەکات .

## ضَميرُ الفصْلِ

وقَدْ يَدْخُلُ بَيْنَ المُبْتَدأ والخَبَرِ ضَمِيرٌ مَرْفُوعٌ مُنفَصِلٌ مُطابِقٌ لِلمُبْتَدَأ ، إذا كَانَ الخَبَرُ مَعْرِفَةً ، أوْ أَفْعَلَ مِنْ كذا [1] ، ويُسَمَّى (فصلاً) لأنَّهُ يَفْصِلُ بَيْنَ المُبْتَدأ وَالخَبَرِ لِيرْفَعَ اشتِباهَ الخَبَرِ بالصِّفَةِ ، وَيُفيدُ التأكِيدَ أيضاً ، نَحوُ :(سَمِيرٌ هُوَ القَادِمُ ، كَانَ قَاسِمٌ هُوَ الزَائِرَ ، و مَجِيدٌ هُوَ أَفْضَلُ مِنْ حَامِدٍ) وقَالَ اللّهُ تَعالى: ﴿.. فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ..﴾ (المائدة/ ١١٧).

---

### ضەميرى فەصل ( جێناوى خۆيى )

هەندێ جار ضەميرێكى مەرفوعى مونفەصيلى گونجاو لەگەڵ موبتەداكەدا دەكەوێتە نێوان موبتەدا و خەبەرەكەيەوە ئەمەش ئەگەر خەبەرەكە مەعريفە بێت يان بە وێنەى (افعل من كذا)[2] بێت، كە پێى دەوترێت ضەميرى فەصل، چونكە موبتەدا و خەبەرەكە لە يەكدى جيا دەكاتەوە -مەبەست ئەوەيە كە دەكەوێتە نێوانيانەوە و دەبێتە فاصيلە نەك جياكردنەوەى لێكچوون لە نێوانياندا- ، ئەمەش بۆ ئەوەيە كە لێكچوونى خەبەرەكە بە صيفەتەوە نەهێڵێ [3]، هەروەها تەئكيديش دەگەيەنێت، وەك:(سميرٌ هو القادم، كان قاسمٌ هو الزائر، مجيدٌ هو افضل من حامد)، خواى گەورە دەفەرموێت:﴿ .. فلمّا توفّيتني كنتَ أنت الرقيب عليهم﴾.

---

١ - المقصود من ، لفعل من كذا هو صيغة التفضيل المجردة من ( أل ) والإضافة ، وبعدها ( من ) فهذه تقارب المعرفة في التعريف .

٢ مەبەستى ئيسم تەفضيلێكە كە (ال)ى پێوە نەبێت و ئيزافەش نەكرابێت .

٣ ئەگەر بڵێين: (زيدٌ القادم) و مەبەستمان ئەوەبێت كە زەيد ئەو كەسەيە كە بەرەو ڕوومان دێت ، شێوەى ڕستەكە وا دەردەخات كە (القادم) صيفەت بێت بۆ زەيد و وەك ئەوە وايە بمانەوێت بڵێين:(زەيدى هاتوو ... ) كە لێرەدا گوێگرەكە وادەزانێت كە (القادم) صيفەتە بۆ زەيد و هێشتا خەبەرەكەمان نەووتوە و بەتەماى ئەوەيە كە پێى بڵێين ، لەبەر ئەوە لەم جۆرە ڕستانەدا پێويستمان بە ضەميرى فەصلٌ هەيە بۆ ئەوەى كە ئەوە بۆ گوێگرەكە يەكلايى بكاتەوە كە ئەوەى ئەو وادەزانێت صيفەتە ، خەبەرە و صيفەت نيە ، بۆيە كاتێك دەڵێين: ( زيدٌ هو القادم) ، وەك ئەوە وايە وتبێتمان: زەيد هاتووەكەيە.

## اَلخُلاصَةُ:

الاسْمُ المَبْنِيُّ: مَا لا يَخْتَلِفُ آخِرُهُ بِاختِلافِ العَوامِلِ وذلِك فِي المَوارِدِ التَّالِيَةِ:

أ-مَا وَقَعَ غَيْرَ مُرَكَّبٍ مَعَ غَيْرِهِ.

ب-مَا شَابَهَ مَبْنِيَّ الأَصْلِ.

ج-مَا كَانَ عَلى أَقَلَّ مِنْ ثَلاثَةِ أحْرُفٍ.

د-مَا تَضَمَّنَ مَعْنىً مِنْ مَعَانِي الحُرُوفِ.

وَيَنْقَسِمُ الاسْمُ المَبْنِيُّ إلى الأقْسامِ الثَّمانِيَةِ الآتِيَةِ:

١-المُضْمَراتُ.

٢-اِسْمُ الإشارَةِ.

٣-المَوْصُولاتُ.

٤-أسْماءُ الأفْعالِ.

---

## پوختە

ئیسمی مەبنی: ئەوەیە کە کۆتاییەکەی بە گۆڕانی عامیلەکان نەگۆڕێت، ئەوەش لەم شوێنانەدا دەبێت:

أ. هەر ئیسمێك لەگەڵ ئیسمێکی تردا تەرکیب نەکرابێت.

ب. ئەو ئیسمەی کە لە شتێکی بنەڕەت مەبنی بچێت.

ج. ئەو ئیسمەی کە کەمتر بێت لە سێ حەرف.

د. ئەو ئیسمەی کە واتای حەرفێکی لە خۆ گرتبێت.

ئیسمە مەبنیەکانیش دابەش دەبن بۆ ئەم هەشت بەشەی خوارەوە:

١. ضەمیرەکان.

٢. ئیسمەکانی ئیشارە.

٣. مەوصولەکان.

٤. ئیسمی فیعلەکان.

٥-أَسْماءُ الأصْواتِ.

٦-المُرَكَّباتُ.

٧-اَلكِنَايَاتُ.

٨-بَعْضُ الظَّرُوفِ.

اَلضَمِيرُ: اِسْمٌ وُضِعَ لِيَدُلَّ عَلى مُتَكَلِّمٍ ، اَوْ مُخاطَبٍ ، أوْ غَائِبٍ ، تَقَدَّمَ ذِكْرُهُ.

وَالضَمِيرُ عَلى قِسمَيْنِ:

١-اَلضَّمِيرُ المُتَّصِلُ ، وَهُوَ مَا لا يُسْتَعْمَلُ وَحْدَهُ.

٢- اَلضَّمِيرُ المُنْفَصِلُ وَهُوَ مَا يُسْتَعْمَلُ وَحْدَهُ.

والضَّمِيرُ المَرفُوعُ المُتَّصِلُ مُستَتِرٌ فِي المَوارِدِ التَّالِيَةِ:

١-الماضِي الغَائِبُ والغَائِبَةُ.

٢-المُضارِعُ المُتَكَلِّمُ.

---

٥. ئەسمائی ئەصوات.

٦. مورەکەبەکان.

٧. کینایەکان.

٨. هەندێ لە زەرفەکان.

ضەمیر: ئیسمێکە دانراوە بۆ ئەوەی دەلالەت بکات لەسەر موتەکەلیم یان موخاتەب یان غائیبێك کە پێشتر ناوبرابێت.

ضەمیریش دووبەشە:

١. ضەمیری موتتەصیل: ئەوەیە کە خۆی بەتەنها بەکار ناهێنرێت.

٢. ضەمیری مونفەصیل: ئەوەیە کە خۆی بەتەنها بەکاردێت.

ضەمیری مەرفوعی موتتەصیلیش لەم شوێنانەدا موستەتیر دەبێت:

١. ماضی غائیبی موزەکەر یان موئەنەس.

٢. موضاریعی موتەکەلیم.

٣-المُضارِعُ المُخاطَبُ والغائِبُ والغائِبَةُ.

٤-اِسْمُ الفاعِلِ والمَفْعُولِ.

ضَمِيرُ الشَّأنِ ، وهُوَ ضَمِيرٌ مُذَكَّرٌ يَقَعُ قَبْـلَ جُمْـلَةٍ تُفَسِّرُهُ.

ضَمِيرُ القِصَّةِ: وهُوَ ضَمِيرٌ مُؤَنَّثٌ غائِبٌ تَقَعُ بَعْدَهُ جُمْـلَةٌ تُفَسِّرُهُ.

ضَمِيرُ الفَصْـلِ: ضَمِيرٌ يَدْخُلُ بَيْنَ المُبْتَدأ وَ الخَبَرِ لِيُبَيِّنَ أنَّ مَا بَعْدَهُ خَبَرٌ لا صِفَةٌ.

أسْئِلَةٌ:

١-عَرِّفِ الاسْمَ المَبْنِيَّ ، ومَثِّـلْ لَهُ.

٢-مَا هُوَ شَبِيهُ مَبنِيِّ الأصلِ؟ عَدِّدْ أنْواعَهُ مَعَ أمْثِلَةٍ.

٣-عَدِّدْ مَبْنِيَّاتِ الأسْماءِ ، وَمَثِّـلْ لَها.

٤-مَا هُوَ الضَّمِيرُ؟ مَثِّـلْ لذلِك.

---

٣. موضاریعی موخاتەب لەگەڵ غائیبی موزەکەر و مونەنەس.

٤. ئیسمی فاعیل و مەفعول.

ضەمیری شەئن: ئەو ضەمیرە موزەکەرەیە کە دەکەوێتە پێش ڕستەیەکەوە کە ڕاڤەی دەکات.

ضەمیری قیصصە: ئەو ضەمیرە مونەنەسە غائیبەیە کە دەکەوێتە پێش ڕستەیەکەوە کە ڕاڤەی دەکات.

ضەمیری فەصل: ئەو ضەمیرەیە کە ئەکەوێتە نێوان موبتەدا و خەبەرەوە، بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە ئەوەی کە لە پاشیەوە دێت خەبەرە نەك صیفەت.

پرسیار:

١. پێناسەی ئیسمی مەبنی بکە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. ئەوەی لە ئیسمێکی بنەڕەت مەبنی دەچێت کامەیە؟ جۆرەکانی بژمێرە بە نموونەوە.

٣. ئیسمە مەبنیەکان بژمێرە، و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٤. ضەمیر چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥-أُذكُرْ أَقْسامَ الضَّمِيرِ ، وَمَثِّـلْ لَها.

٦-فِي أيِّ الأفْعالِ يَستَتِرُ الضَّمِيرُ المَرْفُوعُ؟

٧-مَتَى لا يَجُوزُ استِعْمَالُ الضَّمِيرِ المُنْفَصِلِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ مُفيدٍ.

٨-عَرِّفْ ضَمِيرَ الشَّأن ، اضْرِبْ مِثالاً لذلِك.

٩-مَا هُوَ ضَمِيرُ القِصَّةِ؟ مَثِّـلْ لَهُ.

١٠-مَا هُوَ ضَمِيرُ الفَصْـلِ؟ ومَتَى يُسْتَعْمَلُ؟ مَثِّلْ لذلِك.

---

٥. بەشەکانی ضەمیر بڵێ و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٦. لە چ فیعلێکدا ضەمیری مەرفوع موستەتیر دەبێت؟

٧. چ کاتێك بەکارهێنانی ضەمیری موتتەصیل دروست نیە؟ بە نموونەیەکی بە سوودەوە ڕوونی بکەوە.

٨. پێناسەی ضەمیری شەئن بکە، نموونەیەکیشی بۆ بێنەوە.

٩. ضەمیری قیصصە چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٠. ضەمیری فەصل کامەیە؟ چ کاتێك بەکار دەهێنرێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان

أ. جۆرەکانی ضەمیر لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیاری بکە:

١-هذا هُوَ أَخُوكَ.

٢-رَأَيْتُهُمْ يَدْرُسُونَ فِي الصَّفِ.

٣-إِنَّهُ عَالِمٌ شَهِيرٌ.

٤-هُمْ أَسَاتِذَةٌ مُحْتَرَمُونَ.

٥-اَلبَناتُ سَافَرْنَ إلى بَلَدِهِنَّ.

٦-مَنْ ظَنَّ بِكَ خَيْراً فَصَدِّقْ ظَنَّهُ.

٧- قال تعالى:﴿أَهَكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُ هُوَ﴾(النمل/٤٢).

ب-بە نموونە بهێنەرەوە:

١-سێ ڕستە کە ضەمیرەکە تێیاندا موستەتیر بێت.

٢-سێ ڕستە کە ضەمیرەکە تێیاندا مونفەصیل بێت.

٣-سێ ڕستە کە ضەمیرەکە تێیاندا موتتەصیل بێت.

ج- وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەرەوە:

١-ضەمیرە مەنصوبە مونفەصیلەکان بژمێرە و پێنجیان بخەرە ڕستەی بەسوودەوە.

٢-ضەمیرە مەرفوعە موتتەصیلەکان کامانەن؟ پێنجیان بخەرە ڕستەی بەسوودەوە.

٣-ضەمیرە مەرفوعە مونفەصیلەکان کامانەن ؟

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-سافَرتُ مِنَ البَصَرةِ إلى بَغْدادَ.

٢- قال تعالى:﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَ إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحة/٥).

٣-هؤُلاءِ قَوْمٌ لا يَعْـلَمُونَ.

٤- قال تعالى:﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ (الزمر/٧).

٥- قال تعالى:﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ (الإخلاص/١).

## الدرس الرابع والعشرون

## اَلنّوعُ الثّاني أسماء الإشارَة

اِسْمُ الإشَارَةِ: مَا وُضِعَ لِيَدُلَّ عَلى مُشارٍ إلَيهِ. وَلَهُ خَمْسَةُ ألفاظٍ لِسِتَّةِ مَعان.

١-(ذا) لِلمُذَكَّرِ الواحِدِ.

٢-(ذانِ ، وذَيْنِ) لِلمُثَنَّى المُذَكَّرِ.

٣-(تا ، وتِي ، وذِي ، وتِهْ ، وذِهْ ، وتِهي ، وذِهي) لِلمُفْرَدِ المُؤَنَّثِ.

٤-(تانِ ، وتَيْنِ) لِلمُثَنّى المُؤَنَّثِ.

٥-(أُولاءِ) بِالمَدِّ والقَصْرِ لِلجَمْعِ المُذَكَّرِ والمُؤَنَّثِ.

وَقَدْ تَلْحَقُ بِأَوائِلِها(هَاء) التَّنْبِيـه ، مِثْلُ (هذا، هؤُلاءِ).

وقَدْ يَتَّصِلُ بِأَوَاخِرِها حَرْفُ الخِطابِ، وَهِيَ خَمْسَةُ أَلفاظٍ (كَ، كُما، كُمْ، كِ، كُنَّ)

---

## وانەی بیست و چوار

### جۆری دووەم: ئیسمەکانی ئیشارە ( جێناوی نیشانە )

ئیسمی ئیشارە: ئەوەیە کە دانراوە بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەو کەسەی کە ئیشارەتی بۆ دەکرێ.

ئیسمی ئیشارە پێنج ووشەی هەیە بۆ شەش واتا.

١. (ذا) بۆ موزەکەری موفرەد.

٢. (ذان، ذين) بۆ موسەنای موزەکەر.

٣. (تا، تي، ذي، ته، ذه، تهي، ذهي) بۆ موفرەدی موئەنەس.

٤. (تان، تين) بۆ موسەنای موئەنەس.

٥. (اولاء) بە درێژکردنەوە و بە کورتکردنەوە، بۆجەمعی موزەکەر و موئەنەس.

هەندێ جار (هاء)ی تەنبیه - ئاگادارکردنەوە- دەنوسێت بە سەرەتاکەیانەوە، وەك (هذا، هؤلاء).

هەندێ جار حەرفێك کە نیشانەی قسەلەگەڵکراوەکەیە دەنوسێت بە کۆتاییەکەیانەوە، کە ئەوانیش پێنج ووشەن: (كَ، كما، كم، كِ، كنّ)،

فذلِك خَمْسَةٌ وَعِشْرُونَ الحاصِلُ مِنْ ضَرْبِ خَمْسَةٍ فِي خَمْسَةٍ وهِيَ (ذاكَ...إلى ذاكُنَّ، و ذانِكَ...إلى ذانِكُنَّ)وَكَذا البَواقِي.

ويُسْتَعْمَلُ(ذا) لِلقَرِيبِ وَ(ذاك) لِلمُتَوسِّطِ و(ذلِك) لِلبَعِيدِ.

## اَلنَّوْعُ الثَّالِثُ الاسْمُ المَوْصُولُ

المَوْصُولُ: اِسْمٌ لا يَصْلُحُ أنْ يَكونَ جُزءاً تامّاً مِنْ جُمْلَةٍ إلاّ بِصِلَةٍ بَعدَهُ ، وَهِيَ جُمْلَةٌ خَبَرِيَّةٌ ، وَلا بُدَّ مِنْ عائِدٍ فِيها يَعُودُ إلى المَوْصُولِ ، مِثْلُ (اَلّذِي) فِي قَوْلِنا (جاءَنِي الّذِي أبوهُ عَالِمٌ ، أوْ قامَ أبوهُ).

اَلأسْماءُ المَوْصُولَةُ هِيَ:

١-(اَلّذي) لِلمُذَكَّرِ.

٢-(اَلّتِي) لِلمُؤَنَّثِ.

---

بەم شێوە كردیە بیست و پێنج كە ئەنجامی لێكدانی پێنج لە پێنجە، ئەوانیش بریتین لە: (ذاك.... تاوەكو.. ذاكن) و (ذانك.... تاوەكو.. ذانكن)، ئەوانی تریش بەهەمان شێوە.

هەروەها (ذا) بۆ نزیك بەكار دەهێنرێت، و (ذاك) بۆ ناوەندی، و (ذلك) بۆ دوور.

## جۆری سێیەم: ئیسمە مەوصولەكان[1]

مەوصول: ئیسمێكە بەكەڵكی ئەوە نایەت ببێتە بەشێكی تەواو لە ڕستەیەك بەهۆی صیلەیەكەوە نەبێت كە بەدوایدا دێت، ئەو صیلەیەش ڕستەیەكی خەبەریە، و پێویستە ضەمیرێكی تێدا بێت كە بگەڕێتەوە بۆ مەوصولەكە، وەك (الذي) لە ڕستەی:(جاءني الذي ابوه عالم) یان(قام ابوه).

ئیسمە مەوصولەكان بریتین لە:

١. (الذي) بۆ موزەكەر

٢. (التي) بۆ موئەنەس

---

١ لە ڕێزمانی كوردیدا بە شێوەیەكی سەربەخۆ هاوشێوەی ئەم ناوانەم دەست نەكەوت.

٣-(اللّذانِ، واللّذَيْنِ، واللّتانِ، واللّتَيْنِ) لِمُثَنّاهُما، بِالألِفِ فِي حَالَـةِ الرَّفْـعِ، وبالياءِ فِي حَالَتَى النَّصْبِ والجَرِّ [١].

٤-(الأُلى [٢]، والّذِينَ) لِجَمْعِ المُذَكَّرِ.

٥-(اَللاّتِي ، واللّواتِي ، و اللاّئِي) لِجَمْعِ المُؤَنَّثِ.

٦-٧-(مَنْ و مَا) و يَكُونَانِ لِلجَمِيعِ.

٨-(أيٌّ وَ أيَّةٌ).

٩-(ذُوْ) بِمَعْنى (الّذِي) فِي لُغَةِ بَنِي طَيِّءٍ كَقَوْلِ الشّاعِرِ:

فَإنَّ الماءَ ماءُ أَبِي وَجَدِّي وَبِئْرِي ذُو حَفَرْتُ وَذُو طَوَيْتُ

أَيْ الّذِي حُفَرْتُ والّذِي طَوَيْتُ [٣].

---

٣. (اللذان، الذين، اللتان، اللتين) بۆ موسەنای موزەکەر و موئەنەس، ڕەفعی بە ئەلفە، و نەصب و جەڕیشی بە یاء.

٤. (الألى، الذين) بۆجەمعی موزەکەر

٥. (اللاتي، اللواتي، الأئي) بۆجەمعی موئەنەس

٦. ٧. (من، ما) بۆ هەموو ئەوانەی سەرەوە بەکاردێن

٨. (اي، اية)

٩. (ذو) بە واتای (الذي) لە لوغەی بەنی طي دا، وەك ووتەی شاعیر:

فإن الماء ماء ابي وجدي وبئري ذو حفرت وذو طويت[٤]

واتە: (الذي حفرت والذي طويت).

---

١ - أعربَ اللذانِ واللتانِ لأنّ التثنيةَ مِنْ مختصاتِ الأسماءِ المتمكّنةِ .

٢ - جاء في أصل الكتاب : الأولى ، وهو تصحيف .

٣ - طوَيتُ ، يَعني بنَيتُ فوهةَ البئرِ بالحجارةِ .

٤ واتە: ئاوەکە ئاوی باوك و باپیرمە و بیرەکەشم ئەو بیرەیە کە خۆم هەڵم کەندووە و هەڵم بەستوە .

١٠-اَلأَلِفُ وَاللامُ بِمَعْنى (اَلَّذِي) وصِلَتُهُ اسمُ الفاعِلِ أَوِ المَفْعُولِ ، نَحْوُ (الآكِلُ أَبُو بَكْرٍ) أيِ الَّذِي اَكَلَ أَبُو بَكْرٍ ، و (المَأْكُولُ تُفّاحٌ) أيِ الّذِي أُكِلَ تُفّاحٌ.

وَيَجُوزُ حَذفُ العَائِدِ مِنَ اللَفْظِ إنْ كَانَ مَفْعُولاً، نَحْوُ:(قَامَ الّذِي أَكْرَمْتُ) أَيْ الّذِي أَكْرَمْتُهُ.

واعلَمْ أنَّ (أيّاً و أيَّةً) مُعْرَبانِ إلاّ إذا حُذِفَ صَدْرُ صِلَتِهِما [١]، كَقَوْلِهِ تَعالَى ، ﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِنْ كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَنِ عِتِيًّا﴾(مريم/٦٩) ، أَيْ: أَيُّهُم هُوَ أَشَدُّ.

**الخُلاصَةُ:**

اِسمُ الإشارَةِ: اِسْمٌ يُشارُ بِهِ إلى مُسَمّىً مَحْسُوس. وأَلفاظُ اسمِ الإشارَةِ هِيَ:

---

**١٠. ئەلف و لامێك كە بە واتای (الذي) بێت و صیلەكەیشی ئیسمی فاعیل یان مەفعول بێت، وەك (الآكل ابوبكر) بە واتای: ئەوەی كە خواردی ئەبوبەكر بوو، هەروەها وەك: (المأكول تفاح) بەواتای: ئەوەی كە خوراوە سێوە.**

**دروستە ئەو ضەمیرەی كە دەگەڕێتەوە بۆ مەوصولەكە بە لەفزی حەزف بكەین ئەگەر مەفعول بوو، وەك: (قام الذي اكرمت) واتە: (الذي اكرمته).**

**بزانە كە (ایا) و (ایة) هەردووكیان موعرەبن، تەنها لە كاتێكدا نەبێت كە سەرەتای صیلەكەیان سڕرابێتەوە، وەك فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ ثم لننزعنّ من كل شیعة آیّهم أشد علی الرحمن عتیّا﴾ واتە: ایهم هو اشدّ [٢].**

## پوختە

**ئیسمی ئیشارە: ئیسمێكە بە هۆیەوە ئیشارەت ئەكرێت بۆ ناونراوێكی هەست پێكراو و دیار. ووشەكانی ئیسمی ئیشارە بریتین لە:**

---

**١- واضيف إلى معرفةٍ ( ضمير ) .**

**٢ لێرەدا مەبەست لە سەرەتای صیلەكە (هو)یە ، بەهۆی ئەوەی كە سڕراوەتەوە لە سەرەتای صیلەكەوە ووشەی (ایّ) بووەتە مەبنی لەسەر ضەممە، چونكە لێرەدا ئەگەر مەبنی نەبوایە پێویست بوو مەنصوب بێت لەسەر ئەوەی كە مەفعول بیهی یە .**

(ذا ، و ذانِ ، و ذَيْنِ) لِلمُفْرَدِ المُذَكَّرِ ومُثَنَّاهُ.

(تا ، و تانِ ، و تَيْنَ) لِلمُفْرَدِ المُؤَنَّثِ ومُثَنَّاهُ.

(أُولاءِ) بالمَدِّ وَالقَصْرِ لِلجَمْعِ المُذَكَّرِ والمُؤَنَّثِ. ويُستَعْمَلُ (ذا) لِلقَرِيبِ ، و(ذاك) لِلمُتَوسِّطِ ، و (ذلِك) لِلبَعيدِ.

الاسْمُ المَوْصُولُ ، اِسْمٌ يُفَسِّرُهُ جُملةٌ تَأتِي بَعْدَهُ ، وَفِيهَا ضَمِيرٌ يَعُودُ إلَيهِ. والأسْماءُ المَوْصولَةُ هِيَ:

١-(اَلّذي) ، و (اللّذانِ ، اللّذَيْنَ) ، و (الّذِينَ ، الأُلى) للمُفرَدِ المُذَكَّرِ وَتَثْنِيَتِهِ وَجَمْعِهِ عَلَى التَّوالِي.

٢-(الّتِي) ، و (اللّتَانِ ، اللّتَيْنِ) ، و (اللّوَاتِي ، اللاّئِي ، اللّوَائِي ، اللاّتِي) ، للمُفرَدِ المُؤَنَّثِ وتَثْنِيَتِهِ وجَمْعِهِ.

---

(ذا، ذان، ذين) بۆموفرەدی موزەکەر و موسەناکەی

(تا، تان، تین) بۆموفرەدی موئەنەس و موسەناکەی

(اولاء) بە درێژکردنەوە، و بە کورتکردنەوە، بۆجەمعی موزەکەرو موئەنەس، (ذا) بەکاردێت بۆ نزیك، و (ذاك) بۆ ناوەندی و (ذلك) بۆ دوور[1].

ئیسمی مەوصول: ئیسمێکە ڕستەیەك ڕاڤەی دەکات کە بەدوایدا دێت، و ڕستەکە ضەمیرێکی تێدایە دەگەڕێتەوە بۆی.

ئیسمە مەوصولەکان بریتین لە:

١. (الذي) و (اللذان، اللذين) و (الذين، الألي) بۆموفرەد و موسەنا و جەمعی موزەکەر بەدوای یەکەوە.

٢. (التي) و (اللتان، اللتين) و (اللواتي، اللائي، اللواتي، اللاّتي) بۆموفرەد و موسەنا وجەمعی موئەنەس.

---

١ لە کوردیدا بەزۆریی بۆ نزیك ووشەی(ئەمە) بەکار دەهێنین، بۆ ناوەندی(ئەوە)، بۆ دوور (ئائەوە) .

٣-(مَنْ و مَا) ويَستَوِي فِيهِما المُذَكَّرُ و المُؤنَّثُ إفْراداً و تَثْنِيَةً و جَمْعاً.

٤-أَيُّ ، وأَيَّةُ: وهُما مُعْرَبانِ إلاّ إذا حُذِفَ صَدْرُ صِلَتِهِما و أُضيفَ إلى معرفَة (ضمير) فَيُبْنَيانِ عَلى الضَّمِّ.

٥- (اَلألِفُ و اللاَّمُ) ، و (ذُو) بِمَعنى (الّذِي).

أسئلة:

١-مَا هُوَ اسْمُ الإشارَةِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-بِماذا يُشَارُ إلى المُؤنَّثِ؟ وبِمَ يُشَارُ إلى المُذكَّر؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٣-عَرِّفِ الاسْمَ المَوصُولَ ، واذكُرْ مِثالاً لذلِك.

٤-أُذكر الاسْمَ المَوصُول المختصّ بِالمُؤنَّثِ المُفْرَدِ والمُذكَّرِ المُفْرَدِ ، ومَثِّلْ لَهما.

٥-مَا هِيَ الأَسْماءُ المَوْصُولَةُ المُخْتَصَّةُ بِالمُثَنّى؟ عَدِّدْها ، ومَثِّلْ لَها.

---

٣. (من، ما) ئەم دوانە بۆ موزەکەر و موئەنەس و موفرەد و موسەنا و جەمع وەك يەك بەکاردێن.

٤. (اي، اية) ئەم دوانەيان موعرەبن، مەگەر تەنها کاتێك نەبێت کە سەرەتای صيلەکەيان حەزف کرابێت و ئيزافە کرابن بۆ مەعريفەيەك -ضەمير-ئەوکات مەبنی دەبن لەسەر ضەممە.

٥. (ئەلف و لام)، و (ذو) بەمانای (الذي).

پرسيار:

١. ئيسمی ئيشارە چيە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. بە چی ئيشارەت بۆ موئەنەس دەکەين؟ ئەی بە چی ئيشارەت بۆ موزەکەر دەکەين؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٣. پێناسەی ئيسمی مەوصول بکە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. ئەو ئيسمە مەوصولانە بڵێ کە تايبەتە بە موئەنەسی موفرەد و موزەکەری موفرەد، نموونەشيان بۆ بێنەوە.

٥. ئيسمە مەوصولە تايبەتەکان بە موسەناوە کامانەن؟ بيانژمێرە و نموونەيان بۆ بێنەوە.

٦-أُذكُرِ الأسْماءَ المَوْصُولَةَ المُختَصَّةَ بِجَمْعِ المُذَكَّرِ وَجَمْعِ المُؤَنَّثِ ، مَعَ أمْثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٧-مَتَى تبْنى (أيٌّ) و (أيَّةٌ)؟ مَثِّلْ لذلِك.

٨-مِا هُوَ العائِدُ عَلى الاسْمِ المَوْصُوْلِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٩-كَيْفَ تُستَعْمَلُ (مَنْ) و (مَا)؟ مَثِّلْ لذلِك.

١٠-مَتَى يَجُوزُ حَذفُ العَائِدِ مِنْ جُمْـلَةِ الصِّلَةِ؟

١١-هَلْ تُستَعْمَلُ (الألِفُ و اللاَّمُ) بِمَعْنى (الَّذِي)؟ مَثِّلْ لذلِك.

١٢-هَلْ تُستَعْمَلُ (ذو) بِمَعْنى (الَّذِي)؟ اِشْرَحْ ذلِك ومَثِّلْ لَهُ.

---

٦. ئەو ئیسمە مەوصولانەی کە تایبەتن بەجەمعی موزەکەر و جەمعی موئەنەسەوە بڵێ و نموونەی بەسودیان بۆ بێنەوە.

٧. چ کاتێك (ايّ) و (اية) مەبنی دەبن؟ نموونە بێنەوە بۆ ئەوە.

٨. ئەو ضەمیرەی کە دەگەڕێتەوە بۆ ئیسمی مەوصول کامەیە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٩. چۆن (من) و (ما) بەکار دەهێنیت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٠. چ کاتێك دروستە ضەمیری گەڕاوە بۆ مەوصول بسڕینەوە لە ڕستەی صیلەکەدا.

١١. ئایا (ئەلف و لام) بە مانای (الذي) بەکاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٢. ئایا (ذو) بە مانای (الذي) بەکاردێت؟ ئەمە ڕوون بکەوە و نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

**أ. بەم ئیسمانەی خوارەوە ئیشارەت بکە لە ڕستەی بەسووددا:**

هذا، هذه، ذاكم، ذلك، هؤلاء.

**ب. ئیسمەکانی ئیشارە لەم نموونانەدا دەربهێنە:**

١- قال تعالى:﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾(الرعد/٤).

٢- قال تعالى:﴿هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي﴾(النمل/٤٠).

٣-اُنْظُرْ ذاكُمُ الأَوْلادَ.

٤- قال تعالى:﴿ذَلِكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ﴾(آل عمران/٤٤).

٥-هَاتانِ البِنْتانِ عَامِلَتانِ.

٦-ذلِكَ الكِتابُ مُفِيدٌ.

٧-اِشْتَرَيْتُ هذَيْنِ القَلَمَيْنِ.

**ج-ئیسمێکی ئیشارە بخەرە هەریەك لەم بۆشاییانەوە:**

١-......... الرَّجُلُ عَالِمٌ.

٢-أَنا مُنْتَظِرٌ......... الْمُعَلِّمَ.

٣-........... آبائِي فَجِئْني بِمِثْلِهِمْ.

٤-خُذْ......... الكِتابَ وَضَعْهُ فَوْقَ......... الرَّفِّ.

٥- قال تعالى:﴿....... الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ﴾(البقرة/٢).

**د-ئیسمە مەوصولەکان لەهەریەکە لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:**

١- قال تعالى: ﴿ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ هَذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ (الذاريات/ ١٤).

٢- قال تعالى:﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾(النور/٣٠).

٣- قال تعالى:﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ﴾(فصلت/٤٤).

٤- قال تعالى:﴿لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾(الكافرون/٢).

٥- قال تعالى:﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ(١)الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاَتِهِمْ خَاشِعُونَ(٢)﴾ (المؤمنون/١-٢)

**هـ-ئەم مەوصولانەی خوارەوە بخەرە ڕستەوە:**

اللَّتانِ، الَّذِينَ، اللَّوَاتِي، اللَّذانِ، اللَّذَيْنِ، الَّتِي، ما، مَنْ.

و-مەوصولی گونجاو بخەرە هەریەك لەم بۆشاییانەوە:

١-مَنْ......... يَدُلُّني عَلى البَيْتِ؟

٢-جَاءَ......... لا تَأخُذُهُمْ فِي اللّهِ لَوْمَةُ لائِمٍ.

٣-......... أخبَرَني مُوَثَّقٌ.

٤-شَاهَدْتُ القائِمِينَ بالأعْمالِ و......... يُوازِرُونَهُم.

٥-اِشْتَرَيْتُ......... يُفِيدُكَ مِنَ الوَسائِلِ.

٦-رَأَيْتُ......... سَأَلتَهُ.

٧-الشَّابَّانِ......... ذهَبا هُما مِنْ أصْدِقائِي.

ز-ئەم ڕستانەی خوارەوە ئیعراب بکە:

١-شَرُّ الإخوانِ مَنْ تُكُلِّفَ لَهُ.

٢- قال تعالى:﴿قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ﴾(يوسف/٣٢).

٣- قال تعالى:﴿إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾(المؤمنون/٨٣).

٤-اَلصَّلاةُ الَّتِي تَنْهى عَنِ الفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ مَقْبُوْلَةٌ.

٥- قال تعالى:﴿مَنْ ذا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾(البقرة/٢٤٥).

## الدرس الخامس والعشرون

### النَّوعُ الرّابِعُ أسْماءُ الأفْعالِ

اسْمُ الفِعْلِ: كُلُّ اسْمٍ يَكُونُ بِمَعْنـى الأمْـرِ والمَاضِـي ، مِثْـلُ (رُوَيْـدَ زَيْـداً) أيْ أمْهِلْـهُ ، و(هَيْهاتَ زَيْدٌ) أيْ بَعُدَ ، و(هَاؤُمْ) أيْ خُذُوا ، (حَيَّ) أيْ أقْبِلْ وَعَجِّـلْ ، و (مَكَانَـكَ) أيْ اُثْـبُتْ ، و (عَلَيْـكَ) أيْ: اِلزَمْ. ولَهُ وَزْنٌ قِياسِيٌّ ، وهُوَ (فَعالِ) بِمَعْنَى الأمْرِ مِـنَ الثُّلاثِـيِّ ، مِثْلُ (نَزالِ) بِمَعْنى اِنْزِلْ ، و (تَراكِ) بِمَعْنى اُتْرُكْ.

وقَدْ يُلْحَقُ بِهِ (فَعالِ) مَصْدراً مَعرِفَةً نَحْوُ (فَجارِ) بِمَعْنـى الفُجـورِ ، أوْ صِـفَةً للمُؤَنَّـثِ، نَحْوُ يَا (فَسَاقِ) بِمَعْنى فاسِقَة ،

---

## وانەی بیست و پێنج

### جۆری چوارەم: ئیسمی فیعلەکان[1]

ئیسمی فیعل: هەموو ئیسمێکە کە بەمانای ئەمر یان ماضی بێت. وەك: (روید زیدا)، پەلەی لێمەکە، (هیهات زید) واتە: دوورە، (هاؤم) واتە: بگرە، (حيَّ) واتە: وەرە و پەلەبکە، (مکانك) واتە: نەجوڵێی، (علیك) واتە: دەستی پێوە بگرە و دەستبەرداری نەبی.

وەزنێکی قیاسیشی هەیە، کە بریتیە لە (فعالِ) و بەمانای ئەمر دێت لە فیعلێك کە سێ حەرفیی بێت، وەك: (نزال) بەمانای دابەزە، (تراك) واتە: وازی لێ بێنە.

هەندێ جار وەزنی (فعال) کە مەصدەری مەعریفە بێت بەمەوە مولحەق دەکرێت وەك: (فجار) بەمانای فوجور -خراپ ووتن-، یان صیفەت بێت وەك: (فساق) بەمانای ئافرەتی ناگوێڕایەڵ،

---

١ هەندێکیان ووشەی سەرسوڕمانن وەك بەخ ئۆف ئاخ. ئەم ووشانە هەندێ جار بەهەڵە مانا دەکرێن و وادەزانرێت کە لەهەمان کاتدا ئیسمیش و فیعلیشن یان وەك واسیتە وان لە نێوانیاندا، بەڵام ئەمە هەڵەیە و مەبەست لە ئیسمی فیعلەکان ئەوەیە کە فیعلێکمان هەیە و هەروەك چۆن شتەکانی دەوروبەرمان ناویان هەیە ئێمەش هاتووین ناومان بۆ ئەو فیعلە داناوە، بۆ نموونە فیعلی (انزل) ناوێکمان بۆ داناوە کە بریتیە لە (نزال)، لە کوردیشدا هاوشێوەی ئەمە هەیە بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت بە کەسێك بڵێین (بگرە) دەڵێین (ها).

ويَا (لَكاعِ) بِمَعْنى لاكِعَة أوْ عَلَماً للأعْيَانِ المُؤنَّثةِ ، كَقَطامِ وَ غَلابِ وحَضارِ. وهذِهِ الثَّلاثةُ الأخِيرةُ لَيْسَتْ مِنْ أسْماءِ الأفْعَالِ ، وإنَّما ذُكِرَتْ ههنا لِلمُنَاسَبَةِ.

### النَّوعُ الخامسُ أسْمَاءُ الأصْوَاتِ

اِسْمُ الصَّوتِ ، كُلُّ اسْمٍ حُكِيَ بِهِ صَوْتٌ ، مِثْلُ (غاقْ) لِصَوتِ الغُرابِ ، و(طَاقْ) لِحِكايَةِ الضَّربِ ، و(طَقْ) لِحِكايَةِ وَقْعِ الحِجارَةِ بَعْضِها عَلى بَعْضٍ ، أوْ لِصَوتٍ يُصَوَّتُ بِهِ لِلبَهائمِ كـ (نِخْ) لإناخَةِ البَعِيرِ.

### النَّوعُ السَّادسُ: المُرَكَّباتُ

المُرَكَّبُ: كُلُّ اسْمٍ رُكِّبَ مِنْ كَلِمَتَيْنِ لَيْسَ بَيْنَهُما نِسْبَةٌ ، أيْ لَيْسَ بَيْنَهُما النِّسبَةُ الإضافِيَّةُ أوِ الإسْنَادِيَّةُ.

---

و (لكاع) بەمانای ئافرەتی ڕسوا، یان ئەو وەزنە عەلەم بێت بۆ شتانێکی بەرچاوی موئەنەس، وەك (قطام، غلاب، حضار)، بەڵام ئەم سێ جۆرەی کۆتایی[1] لە ئیسمی فیعلەکان نین، بەڵکو تەنها لەبەر لێکچوون لێرەدا باسمان لێوە کردن.

### جۆری پێنجەم: ئیسمەکانی ئەصوات ( دەنگە سروشتیەکان )

ئیسمی صەوت: بریتیە لە هەر ئیسمێك لاسایی دەنگێکی پێ بکرێتەوە.

وەك: (غاق) بۆ دەنگی قەلەڕەش، (طاق) بۆ لاسایی دەنگی لێدان، و (طق) بۆ لاسایی دەنگی کەوتنی بەرد بەسەر یەکدا، یان وەك ئەو دەنگانەی کە بە هۆیانەوە لە ئاژەڵ دەخوڕین وەك: (نخ) بۆ خوس دادانی ووشتر.

### جۆری شەشەم: مورەکەبەکان ( هاوەڵناوی لێکدراوی ناوێتە )

مورەکەب: هەموو ئیسمێکە لە دوو ووشە پێکهاتبێت کە نیسبەت لە نێوانیاندا نەبێت، واتە لە نێوانیاندا هیچ نیسبەتێکی ئیزافی یان ئیسنادی نەبێت.

---

[1] واتە مەصدەری مەعریفە و صیفەت و عەلەمەکە.

فَإنْ تَضَمَّنَ الجُزءُ الثّاني مِنَ المُرَكّبِ حَرْفاً فَيَجِبُ بِناؤُهُما عَلى الفَتْحِ مِثْلُ (أحَدَ عَشَرَ... إلى تِسعَةَ عَشَرَ) إلاّ (اثْنَيْ عَشَرَ) فَإنَّهُ مُعْرَبٌ كَالمُثَنّى ، وإنْ لَمْ يَتَضَمَّنِ الثّاني حَرْفاً فَفِيها ثَلاثُ لُغَاتٍ أفْصَحُها بِناءُ الأوَّلِ عَلَى الفَتْحِ ، وإعْرَابُ الثّانِي إعْرَابَ غَيرِ المُنْصَرِفِ مِثْلُ (بَعْلَبَكٌّ و مَعْدِي كَرْب).

**الخُلاصَةُ:**

اِسْمُ الفِعْلِ: اِسْمٌ يَدُلُّ عَلى مَعْنى فِعْلِ الأمْرِ أوِ الماضِي ، ولا يَقْبَلُ عَلامَاتِهِ ولَهُ وَزْنٌ قِيَاسِيٌّ هُوَ (فَعَالِ) مَنْ الثّلاثيِّ المُجَرَّدِ.

اِسمُ الصَّوْتِ ، اِسْمٌ يُحْكى بِهِ صَوْتٌ.

المُرَكَّبُ: لَفْظٌ يُرَكَّبُ مِنْ كَلِمَتَيْنِ لَيْسَ بَيْنَهُما نِسْبَةٌ إضافِيَّةٌ وَلا إسْنَادِيَّةٌ.

---

ئەگەر بەشی دووەمی ئیسمە مورەکەبەکە لە ناوەڕۆکدا حەرفێکی لەخۆ گرتبوو [1] ئەوە پێویستە مەبنیان بکەین لەسەر فەتحە، وەك: (احد عشر.... تا تسعة عشر) جگە لە (اثني عشر) کە موعرەبە و وەك موسەنا ئیعراب دەکرێ، بەڵام ئەگەر دووەمیان حەرفی لە خۆ نەگرتبوو، ئەوە سێ لوغەتی تێدا دەبێت، فەصیحترینیان ئەوەیە کە یەکەمیان مەبنی بێت لەسەر فەتحە، و دووەمیان وەك ئیسمی نامونصەریف ئیعراب بکەین، وەك: (بعلبك، معدي كرب).

**پوختە**

ئیسمی فیعل: ئیسمێکە دەلالەت دەکاتە سەر مانای فیعلێکی ئەمر یان ماضی، و نیشانەی هیچ کامیان وەرناگرێت، و یەك وەزنی قیاسی هەیە کە بریتیە لە (فعال)، ئەگەر فیعلەکە سێ حەرفی سادە بوو.

ئیسمی صەوت: ئیسمێکە لاسایی دەنگێکی پێ بکرێتەوە.

مورەکەب: لەفزێکە لە دوو ووشە پێکهاتووە کە لەنێوانیاندا هیچ نیسبەتێکی ئیزافیی یان ئیسنادیی نیە.

---

١ مەبەست لەو حەرفە (و)ی عەتفە ، چونکە (احد عشر) لە بنەڕەتدا (احد و عشر) بووە و لەبەر زۆر بەکارهێنان واوەکە حەزف کراوە ، ئیسمەکانی تری لەم جۆرەش بەهەمان شێوەن .

**أسْئِلَةٌ:**

١-مَا هُوَ اسْمُ الفِعْلِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-مَاذا يُلْحَقُ باسْمِ الفِعْلِ؟ اُذكُرْهُ مَعَ مِثالٍ لَهُ.

٣-مَا هُوَ اسْمُ الصَّوتِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٤-عَرِّفِ الاسْمَ المُرَكَّبَ ، مَعَ مِثَالٍ لذلِك.

٥-مَتى يُبْنَى المُرَكَّبُ ، مَعَ مِثَالٍ لذلِك.

٦-بِأَيِّ الحَالاَتِ يُبْنَى الجُزءُ الأوَّلُ مِنَ المُرَكَّبِ عَلَى الفَتْحِ وَيُعْرَبُ الثَّانِي إعْرَابَ غَيْرِ المُنْصَرِفِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

---

**پرسیار:**

١. ئیسمی فیعل چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. چ شتێك دەخرێتە ڕیزی ئیسمی فیعلەوە؟ بە نموونەوە باسی بکە.

٣. ئیسمی صەوت چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. ئیسمی مورەکەب پێناسە بکە، بە نموونەوە.

٥. چ کاتێك ئیسمی مورەکەب مەبنی دەبێت؟ نموونە بێنەوە.

٦. لە چ حاڵەتێکدا بەشی یەکەمی ئیسمی مورەکەب مەبنی دەبێت لەسەر فەتحە و دووەمیشیان وەك نامونصەریف ئیعراب دەکرێ؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان

ا-ئیسمی فیعلەکان لەم ڕستانەدا دیاری بکە:

١- قال تعالى:﴿هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَه﴾(الحاقة/١٩)..

٢-حَيٌّ عَلى الصَّلاةِ.

٣-مَكانَكَ يَا سَعِيدُ.

٤-عَلَيْكَ نَفْسَكَ يَا سَعْدُ.

٥-(هَيْهاتَ مِنَّا الذِّلَّةُ).

ب-ئیعرابی ئەمانەی خوارەوە بکە:

١-آمِينَ رَبُّ العَالَمِينَ.

٢-نَزالِ عِنْدَ رَأْيِهِ.

٣- قال تعالى:﴿هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ﴾(المؤمنون/٣٦).

٤- قال تعالى:﴿فَلاَ تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ ﴾(الإسراء/٢٣).

٥- قال تعالى:﴿عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ ﴾(المائدة /١٨)

## الدرس السادس والعشرون

### النَّوعُ السَّابِعُ: اَلكِنَايَاتُ

الكِنَاياتُ ، هِيَ أسْماءٌ وُضِعَتْ لِتَدُلَّ عَلى عَدَدٍ مُبْهَمٍ مِثْـلُ: (كَـمْ وَ كَـذَا) أوْ حَـدِيثٍ مُبْهَمٍ ، مِثْلُ (كَيْتَ وَذَيْتَ).

و (كَمْ) عَلى قِسْمَيْنِ:

١-اِسْتِفْهامِيَّةٌ، وهِيَ مَا يأْتِي بَعْدَها مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ عَلى التَّمييزِ مِثْلُ :(كَمْ كِتاباً عِنْدَكَ).

٢-خَبَرِيَّةٌ ، وهِيَ مَا يأْتِي بَعْدَها مُفْرَدٌ مَجْرُورٌ ، مِثْـلُ: (كَـمْ مَـالٍ أنْفَقْتُـهُ)،أوْ مَجْمُـوعٌ مَجْرُورٌ نَحْوُ: (كَمْ رِجالٍ لَقِيتُهُمْ) ، وَمَعْنَاهُ التَّكْثِيرُ.

---

## وانەی بیست و شەش

### جۆری حەوتەم: کینایەکان[1]

کینایەکان: کۆمەڵە ئیسمێکن دانراون بۆ ئەوەی دەلالەت بکەنە سەر ژمارەیەکی موبهەم،واتە نا ڕوون، وەك: (کم، کذا)، یان لەسەر قسەیەکی موبهەم، وەك: (کیت، ذیت) [2].

دوو جۆر (کم)مان هەیە:

١. ئیستیفهامی: ئەوەیە کە لە پاشیەوە موفرەدێك دێت کە مەنصوبە لەسەر ئەوەی کە تەمیزە، وەك: (کم کتابا عندك).

٢. خەبەری: ئەوەیە کە لە پاشیەوە موفرەدێك دێت کە مەجرورە، وەك: (کم مالٍ انفقته)، یاخود جەمعێکی مەجرور، وەك:(کم رجالٍ لقیتهم)، مەبەستیش لێی بریتیە لە زۆرکردن[3].

---

١ ئەم ووشانە لە زمانی کوردیدا هەندێکیان جێناوی نادیارن و هەندێکیان ووشەی سەرسوڕمانن.

٢ لە زمانی کوردیدا وەك ئەوە وایە بڵێین: فلان کەس واو وای ووت ، یان ئەوانە جوتەجوت دەکەن .

٣ ئەم بەشەی دووەمی (کم) بۆ پرسیارکردن نایەت، واتە ئەوکەسەی کە دەڵێت:(کم مال انفقته) یاخود (کم رجل لقیته) مەبەستی ئەوە نیە کە پرسیار بکات چەند پارەی بەخشیوە ، یان چەند پیاوی بینیوە ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە بڵێ ماڵی زۆرم بەخشیوە ، یان پیاوی زۆرم بینیوە ، ئەمەش جۆرێکە لە خەبەردان .

وقَدْ تَأْتِي (مِنْ) بَعْدها تَقُولُ ، (كَمْ مِنْ رَجُلٍ لَقِيتُهُ وَكَمْ مِنْ مَالٍ أَنفَقْتُهُ).

وَقَدْ يُحْذَفُ مُمَيِّزُ (كَمْ) لِقِيامِ قَرِينَةٍ ، مِثْلُ (كَمْ مَالُكَ؟) أيْ كَمْ دِيناراً مالـكَ؟ و (كَـمْ ضَرَبتَ؟) أيْ كَمْ رَجُلاً ضَرَبْتَ.

وَاعْـلَمْ أَنَّ كَمْ فِي الوَجْهَيْنِ يَقَعُ مَنصُوباً إذا كَانَ بَعْدَهُ فِعْلٌ غَيْرُ مُشْتَغِلٍ عَنْهُ بِضَـمِيْرِهِ ، فَإِنْ كَانَ مُمَيِّزُ (كَمْ) اسْماً ، يكون مَفْعُولاً بِهِ، مِثْـلُ (كَـمْ رَجُـلاً أَكْرَمْـتَ؟ وَ كَـمْ غُـلامٍ مَلَكْتُ !) وإن كَانَ مَصْدَراً [1] فإنه مفعول مطلق ، نَحْوُ (كَمْ زِيارَةً زُرْتَ؟) ، ومَفْعُولاً فِيهِ إنْ كانَ ظَرْفاً ، نَحْوُ (كَمْ يَومٍ سِرْتُ! وَ كَمْ يَوْماً صُمْتَ؟).

وَتَقَعُ مَجْرُورَةً إذا كَانَ مَا قَبْلَها حَرْفَ جَـرٍّ ، أو مُضـافاً نَحْـوُ (بِكَـمْ رَجُـلٍ مَـرَرْتُ ، وَعَلى كَمْ رَجُلٍ حَكَمْتَ ، وغُلامَ كَمْ رَجُلٍ احْتَرَمْتُ ، ومَالَ كَمْ رَجُلٍ صُنْتُ).

---

هەندێك جار (من) بەدوایدا دێت، دەڵێین: (كم من رجل لقيته؟) یان (كم من مالٍ انفقته)[2].

هەندێ جار تەمیزەكەی (كم) حەزف دەكەین لەبەر هەبوونی بەڵگەیەك لەسەری، وەك: (كم مالك؟) واتە: (كم دينارا مالك؟) یاخود: (كم ضربت؟) واتە: (كم رجلاً ضربت؟).

بزانە كە (كم) بە هەردوو بەشەكەیەوە مەنصوب دەبێت ئەگەر ئەو فیعلەی بەدوایدا دێت مەشغوڵ نەكرابێت بە ضەمیرەكەیەوە، خۆ ئەگەر تەمیزەكەی (كم) ئیسم بوو، ئەوە دەبێتە مەفعول بیهی، وەك: (كم رجلاً أكرمت؟) و (كم غلام ملكت؟)، ئەگەریش مەصدەر بوو ئەوە دەبێتە مەفعول موتڵەق، وەك:(كم زيارة زرت؟)، یان دەبێتە مەفعول فیهی ئەگەر زەرف بێت، وەك:(كم يوم سرت!)و (كم يوما صمت؟).

هەروەها دەبێتە مەجرور ئەگەر حەرفێكی جەڕ لە پێشیەوە بوو، یان ئەگەر موزاف بوو، وەك: (بكم رجل مررت؟ ، على كم رجلٍ حكمت؟ ، غلام كم رجلٍ احترمت ، مال كم رجلٍ صنت؟)

---

[1] - أيْ : مَفْعُولاً مُطلقاً .

[2] ئەمە وەك ئەوە وایە كە لە كوردیدا دەڵێین: چەندێك لە پارەم بەخشیوە ، یان: چەندێك لە پیاوانم بینیوە ، واتە: لە جێی ووشەی (من)ی عەرەبیدا (لە) بەكار دەهێنین لە كوردیدا .

وتَقَعُ مَرْفُوعَةً إذا لَمْ يَكُنْ شَيءٌ مَنَ الأمْرَيْنِ ، فَتَكُونُ مُبْتَدأً إذا لَمْ يَكُنْ تَمْيِيزُها ظَرْفاً ، نَحْوُ (كَمْ رَجُلاً إخوَتُكَ؟) و (كَمْ رَجُلٍ أكْرَمْتَهُ) ، وخَبَراً إنْ كَانَ ظَرفاً ، نَحْوُ (كَمْ يَوماً سَفَرُكَ؟) و (كَمْ شَهْرٍ صَوْمِي).

الخُلاصَةُ:

الكِنَايَاتُ أسْمَاءٌ تَدُلُّ عَلَى عَدَدٍ مُبْهَمٍ أوْ حَدِيثٍ مُبْهَمٍ.

أقْسَامُ (كَمْ) ، وهِيَ عَلى قِسْمَيْنِ:

١-اِستِفْهَامِيَّةٌ ، و تَمْيِيزُها مُفْرَدٌ مَنصوبٌ.

٢-خَبَرِيَّةٌ ، وتَمْيِيزُها مُفْرَدٌ مَجْرُورٌ أوْ جَمْعٌ مَجْرُورٌ.

إعْرابُ (كَمْ) ثلاثَةُ أنواعٍ وهِيَ:

١-النَّصْبُ ، إذا كَانَ بَعْدَه فِعْلٌ غَيْرُ مُشْتَغِلٍ عنه بِضَمِيرِهِ ، فيكون مَفْعُولاً بِهِ أو ظَرْفاً فَيكُونُ مَفْعُولاً فِيهِ أوْ مَصْدراً فَيَكُونُ مَفْعُولاً مُطْلَقاً.

---

خۆ ئەگەر هیچ کام لەم دوو شتەی کە باسمان کرد لە ئارادا نەبوون، ئەوە مەرفوع دەبێت، و دەبێتە موبتەدا ئەگەر تەمیزەکەی زەرف نەبوو، وەك:(كم رجلاً إخوتك؟) و (كم رجلٍ اكرمته) ئەگەریش تەمیزەکەی زەرف بوو دەبێتە خەبەر، وەك:(كم يوماً سفرك) و (كم شهرٍ صومي).

پوختە

کینایەکان چەند ئیسمێکن دەلالەت دەکەنە سەر ژمارەیەکی موبهەم یان قسەیەکی موبهەم.

(کم) دەکرێتە دوو بەشەوە:

١. ئیستیفهامی: ئەمەش تەمیزەکەی موفرەد و مەنصوبە.

٢. خەبەری: ئەمەش تەمیزەکەی موفرەد و مەجرورە یان جەمع و مەجرورە.

ئیعرابی (کم) سێ جۆرە:

١. نەصب: ئەگەر فعلێکی بەدوادا هات کە مەشغوڵ نەبوو بە ضەمیرەکەیەوە، ئەوکاتە دەبێتە مەفعول بیهی، یان زەرف کە مەفعول فیهی دەبێت یان مەصدەر ئەوکاتەش دەبێتە مەفعول موتڵەق.

٢-الجَرُّ ، إذا كَانَ مَا قَبْلَها حَرْفَ جَرٍّ أو مُضَافاً.

٣-الرَّفْعُ ، إذا لَمْ يَكُنْ شيْئاً مِمّا سَبَقَ.

أَسْئلَةٌ:

١-عَرِّفِ الكِنَايَةَ ، ومَثّلْ لَها.

٢-عَدِّدْ أقْسامَ (كَمْ) و اذكُرْ مِثالاً لكلِّ قِسْمٍ.

٣-هَلْ يَجُوزُ حَذْفُ مُمَيِّزِ (كَمْ) ومَتى؟ مثِّلْ لِذلك.

٤-مَتى تَقَعُ (كَمْ) مَجْرُورَةً؟ ومَتى تَقَعُ مَنصُوبَةً؟ مَثّلْ لذلِك.

٥-مَتى تَقَعُ (كَمْ) مَرْفُوعَةً؟ وَضِّحْ ذلِك بأمْثِلَةٍ.

٦-مَا حُكْمُ (كَمْ) الاسْتِفْهامِيَّةِ وَالخَبَرِيَّةِ فِي الإعْرابِ؟

٧-مَا هِيَ أسْماءُ الكِناياتِ؟ أُذْكُرْها مَعَ أَمْثِلَةٍ.

---

٢. جەڕ: ئەگەر لە پێشیەوە حەرفی جەڕ هەبوو یان موزاف بوو.

٣. ڕەفع: ئەگەر هیچکام لەوانەی پێشەوە نەبوو.

پرسیار:

١. پێناسەی کینایە بکە، و نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. بەشەکانی (کم) بژمێرە و نموونەیەك بۆ هەربەشێکیان بێنەوە؟

٣. ئایا دروستە تەمیزی (کم) حەزف بکەین.؟ چ کاتێك؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. چ کاتێك (کم) مەجرور دەبێت؟ و چ کاتێك مەنصوب دەبێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. چ کاتێك (کم) مەرفوع دەبێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٦. حوکمی (کم)ی ئیستیفهامی و خەبەری چیە لە ئیعرابدا؟

٧. ئیسمە کینایەکان کامانەن؟ بە نموونەوە ناویان بێنە.

## ڕاهێنان:

أ. جۆری (كم) و تەمیزەكەی دیاری بكە لەم نموونانەدا:

١-كَمْ دِرْهماً عِنْدَكَ؟

٢-بِكَمْ دِرْهَماً اشْتَرَيْتَ الكِتابَ؟

٣-كَمْ يوماً سَفَرُكَ؟

٤-كَمْ أُسْبُوعاً صُمْتَ؟

٥-كَمْ شَهْراً عُطْلَتُكَ؟

٦-كَمْ كِتابٍ قَرَأتُ.

٧-كَمْ يَوْماً قَضَيْتَ فِي المَدِينَةِ؟

ب-لەم ڕستانەی خوارەوەدا كینایەكان دەربهێنە:

١-رَأَيْتُ كَذَا وكَذَا عِمارَةً فِي الشّارِعِ.

٢-قَالَ لِي أخِي كَيْتَ و ذَيْتَ.

٣-سَمِعْتُ مِنْهُ كَيْتَ و ذَيْتَ، وَقُلْتُ لَهُ كَيْتَ وَ كَيْتَ.

٤-اِشْتَرَيْتُ كَذَا و كَذَا كِتاباً.

٥-كَمْ مَجَلَّةٍ اشْتَرَيْتُ.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بكە:

١-كَمْ مِنْ أَكْلَةٍ مَنَعَتْ أَكَلاتٍ.

٢-كَمْ كِتاباً اشْتَرَيْتَ؟.

٣-سَمِعْتُ منْ أَخِي كَيْتَ و ذَيْتَ.

٤- قال تعالى:﴿ كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً ﴾(البقرة/٢٤٩).

٥- قال تعالى:﴿ كَمْ تَرَكُوا مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾(الدخان/٢٥).

## الدرس السابع والعشرون

## النَّوعُ الثَّامِنُ: الظُّرُوفُ المَبْنِيَّةُ -١

وهِيَ عَلَى أَقْسامٍ ، نَذْكُرُهَا فِيما يَلِي:

١-مَا قُطِعَ عَنِ الإضافَةِ بِأَنْ حُذِفَ المُضافُ إلَيْهِ ، مِثْلُ (قَبْلُ ، و بَعْدُ، و فَوقُ ، و تَحْتُ) قَالَ تَعالى:﴿لِلَّهِ الأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ﴾(الروم/٤)،. أَيْ مِنْ قَبْلِ كُلِّ شَيءٍ ومِنْ بَعْدِهِ ، و يُسَمّى (الغَايَاتِ) [١]. هذا إذا كانَ المَحْذُوفُ مَنوِيّاً لِلْمُتَكَلِّمِ وإلاّ كانَتْ معْرَبَةً [٢]، وعَلى هذا قُرِئ قوله تعالى:(لِلَّهِ الأَمْرُ مِنْ قَبْلٍ ومِنْ بَعْدٍ).

---

## وانەی بیست و حەوت

**جۆری هەشتەم: زەرفە مەبنیەکان-١ ( هاوەڵکارەکانی کات یان شوێن یان چۆنیەتی )**

ئەمانەش دەکرێنە چەند بەشێکەوە، کە لێرەدا باسیان لێ دەکەین:

١. ئەوەی کە لە ئیزافەکردن بڕابێتەوە بەو جۆرەی کە موزاف ئیلەیهیەکە حەزف کرابێت، وەك: (قبل، بعد، فوق، تحت)، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿لله الأمر من قبلُ ومن بعدُ﴾، واتە پێش هەموو شتێك و پاش هەموو شتێك، ئەمانەش پێیان دەوترێت: (غايات) واتە مەبەستەکان.

ئەمە لە کاتێکدایە کە حەزفکراوەکە لە نیەتی موتەکەلیمدا بێت[٣]، ئەگەر نا ئەوە دەبێتە موعرەب، لەسەر ئەم شێوەیەش ئەم ئایەتە خوێندراوەتەوە:﴿ لله الأمر من قبلٍ ومن بعدٍ﴾.

---

١ - إنّما قيلَ لهذهِ الظُّروفِ ( غايات ) لأنّ غايَةَ كُلِّ شَيءٍ ما ينتهي بهِ ذلك الشيءُ وهذهِ الظُّروفُ إذا اضيفت كانت غايَتها آخرَ المُضافِ إليهِ ، لأنّ بهِ يَتمُّ الكلامُ و هوَ نهايَتهُ فإذا قطعت عنِ الإضافةِ و أُريدَ معنى الإضافةِ صارت هيَ غاياتِ ذلك الكلام فلذلك قيلَ لها غايات مِن حَيثُ المعنى . ( راجع شرح المفصل لابن يعيش ج ٤ ص ٨٥ )

٢ - الغايات ( الظروف ) تكونُ مُعرَبَةً إذا أضيفت ، نَحوُ ، جئتُ مِنْ قبلِ الظهرِ ، أوْ كانَ المُضافُ إليه مَنسِيّاً ، نَحوُ ، جئتُ قبلاً أوْ بعداً .

٣ حەزفکراوەکە لەم نموونەیەدا بریتیە لە: (کل شيء) -هەموو شتێك- لەم جۆرە بەکارهێنانەی زەرفەکاندا دەبێت لە نیەتی موتەکەلیمدا شتێك هەبێت کە گشتیی بێت وەك ئەوەی لەم ڕستەدایە، و نابێت موزاف ئیلەیهیەکی تایبەت تەقدیر بکات، چونکە ئەوکاتە گشتی بوونەکە لەدەست دەدات.

٢-(حَيْثُ) -وهو في المكانِ كـ(حِين)في الزَّمان، وقد يَرِدُ للزَّمان، والغالب كونه في محلِّ نصبِ ظرفَ مَكان- وشَرْطُها أنْ تُضَافَ إلى الجُمْلَةِ ، مِثْلُ (اجْلِسْ حَيْثُ زَيْدٌ جَالِسُ) وقَالَ اللّهُ تَعالى: ﴿سَنَستَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ﴾(الأعراف/١٨٢). وقَدْ تُضَافُ إلى المُفْرَدِ كَقَوْلِ الشّاعِرِ: أمّا تَرى حَيْثُ سُهَيْلٍ طَالِعاً نجمٌ يُضِيءُ كالشّهابِ لامِعاً

أيْ مكانَ سُهَيْلٍ فـ(حَيْثُ) هُنَا بِمَعْنى مكان.

٣-(إذا) وهِيَ للمُسْتَقْبَلِ ، وإنْ دَخَلَتْ عَلى المَاضِي صَارَ مُسْتَقْبَلاً ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعالى: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللّهِ﴾(النصر/١) وفِيها مَعْنى الشَّرْطِ غالِباً.

ويَجُوزُ أَنْ تَقَعَ بَعْدَها الجُمْلَةُ الاسْمِيَّةُ ، نَحْوُ (أَتَيْتُك إذا الشَّمْسُ طالِعَةٌ). والمُخْتارُ الفِعْلِيَّةُ ، نَحْوُ (أَتَيْتُكَ إذا طَلَعَتِ الشَّمْسُ).

---

٢. (حيث): ئەمە لە مەكاندا هەروەك (حين) وایە لە زەماندا، هەندێ جاریش بۆ زەمان دێت بەڵام زۆربەی جار زەرفی مەكانە و لە محەلی نەصبدایە [١]- مەبنی كراوە لەبەر لێكچوونی لەگەڵ غایەكاندا، چونكە هەمیشە شتی تریان بۆ ئیزافە دەكرێ[٢]، و مەرجەكەشی ئەوەیە كە ئیزافە بكرێ بۆ لای ڕستەیەك، وەك:(اجلس حيث زيد جالس)، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿سنستدرجهم من حيث لا يعلمون﴾ ، هەندێ جاریش ئیزافە دەكرێ بۆ لای موفرەد، وەك ووتەی شاعیر: أما ترى حيث سهيلٍ طالعا نجم يضيء كالشهاب لامعا

واتە: شوێنی سوهیل، چونكە (حيث) لێرەدا بە مانای شوێن دێت.

٣. (إذا) ئەمیش بۆ موستەقبەل دەبێت، ئەگەریش چووە سەر ماضی دەیكاتە موستەقبەل، وەك فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ إذا جاء نصر الله ﴾ زۆربەی جاریش مانای شەرت لەخۆی دەگرێت. دروستیشە ڕستەیەكی ئیسمی بەدوایدا بێت، وەك: (اتيتك إذا الشمس طالعة). بەڵام باشتر ئەوەیە ڕستەی فیعلی بەدوایدا بێت، وەك: (اتيتك إذا طلعت الشمس).

---

١ نێوان دوو داشەكە لە هەندێ لە چاپەكاندا نییە.

٢ لە پاش داشەكەوە بۆ ئێرە لە هەندێكی تر لە چاپەكاندا نییە.

وقَدْ تَكُونُ للمُفاجَأَةِ ، فَيُخْتَارُ بَعْدَهَا المُبْتَدأُ نَحْوُ (خَرَجْتُ فَإذا السَّبُعُ واقِفٌ).

٤-(إذ) وهِيَ لِلمَاضِي ، نَحْوُ (جِئْتُكَ إذ طَلَعَتِ الشَّمسُ ، وإذِ الشَّمسُ طَالِعَةٌ).

**اَلخُلاصَةُ:**

الظَّرفُ ، اسْمٌ يَدُلُّ عَلى زَمَانٍ أوْ مَكانٍ ، حُدُوثِ الفِعْلِ وهُوَ مُعْرَبٌ وَمَبْنِيٌّ.

الظَّرُوفُ المَبْنِيَّةُ هِيَ:

١-الظَّرُوفُ المَقْطُوعَةُ عَنِ الإضافَةِ نَحْوُ قَبْلُ وبَعْدُ وفَوْقُ وَ تَحْتُ.

٢- حَيْثُ.

٣- إذا.

٤- إذْ.

---

هەندێ جاریش بۆ موفاجەئە -واتە ناکاو- دەبێت، ئەوکاتە باشترە موبتەدا بەدوایدا بێت، وەك: (خرجت فإذا السبع واقف)[1].

٤. (إذ) ئەمیش بۆ ڕابردوو دەبێت، وەك: (جئت إذ طلعت الشمس) یان (إذ الشمس طالعة).

**پوختە**

زەرف، ئیسمێکە دەلالەت دەکاتە سەر زەمان یان مەکانی ڕوودانی فیعلێك.

ئەمیش دەکرێت بە دووبەشەوە موعرەب و مەبنی.

زەرفە مەبنیەکان:

١. ئەو زەرفانەی کە لە ئیزافە بڕراونەتەوە، وەك: قبل، بعد، فوق، تحت.

٢. حیث.

٣. إذا.

٤. إذ.

---

١ واتە ڕۆشتمە دەرەوە لەناکاو دڕندەکە وەستابوو.

أسئلة:

١-مَا هِيَ الغَايَاتُ؟ ومَتى تُقْطَعُ عَنِ الإضافَةِ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٢-لِماذا بُنِيَتْ (حَيْثُ)؟ ومَا شَرْطُهَا؟ مَثِّلْ لذلِك.

٣-هَلْ تُضافُ (حَيْثُ) إلى مُفْرَدٍ؟ مَثِّلْ لذلِك.

٤-هَلْ تُفِيدُ (إذا) الشَّرْطَ؟ وكَيْفَ؟ اُذْكُرْ مِثالاً لذلِك.

٥-مَتى تَأتِي (إذا) للمُفاجَأةِ؟ وضِّحْ ذلِك بِمثال.

---

پرسیار:

١. غایەکان کامانەن؟ چ کاتێك دەبڕڕێن لە ئیزافە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. بۆچی (حیث) مەبنیە؟ مەرجەکەی چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. ئایا (حیث) ئیزافە دەکرێت بۆ لای موفرەد؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. ئایا (إذا) مانای شەرت دەگەیەنێت؟ چۆن؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. کەی (إذا) دێت بە واتای موفاجەئە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

## ڕاهێنان

أ. زەرفە مەبنیەکان لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١- قال تعالى: ﴿إنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ﴾(الأعراف/٢٧).

٢- قال تعالى: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا﴾(الجمعة/١١).

٣-اِجْلِسْ حَيْثُ يَجْلِسُ أهْلُ الفَضْلِ.

٤-مَا رَأَيْتُهُ مِنْ قَبْلُ.

٥-إذا ظَهَرَتِ البِدَعُ فَعَلى العالِمِ أنْ يُظْهِرَ عِلْمَهُ.

ب-زەرفێکی مەبنی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-تَدُورُ عَلَيْهِمُ الدَّوَائِرُ مِنْ......... لا يَشْعُرُونْ.

٢-أَنَا أعْطَيْتُهُ الكِتَابَ مِنْ.........

٣-......... رَأَيْتَ ثُمَّ رَأَيْتَ عَجَباً.

٤-أَتَيْتُكَ......... الوَلَدُ وَاقِفٌ.

٥-جِئْتُكَ......... الشَّمسُ طَالِعَةٌ.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ﴾ (الأنعام/١٢٤).

٢- قال تعالى: ﴿إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ (التوبة / ٤٠)

٣-جَلَسْتُ حَيْثُ أَستَطِيعُ القِرَاءَةَ مُرْتَاحاً.

٤-خَرَجْتُ فَإذا المَطَرُ هَاطِلٌ.

٥-إذا ازْدَحَمَ الجَوَابُ خَفِيَ الصَّوَابُ.

٦- قال تعالى: ﴿وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلاَلٍ مُبِينٍ﴾ (آل عمران/١٦٤).

## الدرس الثامن والعشرون

## الظُرُوفُ المَبْنِيَّةُ -٢

٥-(أَيْنَ ، وَأَنَّى) لِلمَكانِ بِمَعْنى الاسْتِفْهامِ ، نَحْوُ (أَيْنَ تَمْشِي؟ ، وأَنَّى تَقْعُـدُ؟) ، وبِمَعْنـى الشَّرْطِ ، نَحْوُ (أَيْنَ تَجْلِسْ أَجْلِسْ ، وأَنَّى تَقُمْ أَقُمْ).

٦-(مَتى) لِلزَّمانِ شَرْطاً ، نَحْوُ (متى تُسَافِرْ أُسافِرْ ، ومَتى تَقْعُدْ أَقْعُـدْ) واسْـتِفْهاماً ، مِثْـلُ (مَتى تَذْهَبُ إلى السُّوقِ؟ ومَتى يَأْتِي أَخُوكَ؟).

٧-(كَيْفَ) لِلاسْتِفْهامِ حَالاً[1] نَحْوُ كَيْفَ جاءَ خَالِدٌ ، أَوْ خَبَراً ، نَحْوُ (كَيْفَ أَنْتَ؟) أيْ فِي أيِّ حَالٍ.

٨-(أَيَّانَ) لِلزَّمانِ اسْتِفْهَاماً ، نَحْوُ قوله تعالى:﴿ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ﴾ (الذاريات/١٢).

---

## وانەی بیست و هەشت

## زەرفە مەبنیەکان-٢

٥. (اين، انى) بۆ مەکان -شوێن- و بە واتای پرسیار دێن، وەك: (اين تمشي؟)، (انى تقعد؟)،هەروەها بە واتای شەرت، وەك:(اين تجلس اجلس)، (انى تقم اقم)[2].

٦. (متى) بۆ زەمان -کات- دەبێت ئەگەر بۆ شەرت بوو، وەك: (متى تسافر اسافر) و (متى تقعد اقعد)، یان بۆ ئیستیفهام ، وەك: (متى تذهب الى السوق؟)، (متى يأتي اخوك؟).

٧. (كيف) بۆ ئیستیفهام دەبێت سەبارەت بە چۆنیەتی، و دەبێتە حاڵ، وەك: (كيف جاء خالد؟) یان دەبێتە خەبەر، وەك: (كيف انت؟) واتە: تۆ لە چ حاڵێکدایت؟

٨. (ايان) بۆ پرسیارکردن لە زەمان، وەك:﴿ أيّان يوم الدين﴾.

---

١ - اي عن الحال .

٢ واتای ئەم دوو ڕستەیە بریتیە لە: تۆ لە هەرکوێ دابنیشی منیش دادەنیشم ، تۆ لە هەرکوێ هەستی منیش هەڵدەستم ، واتە: بەمەرجێ تۆ دابنیشی منیش دادەنیشم ، بەمەرجێ تۆ هەستی منیش هەڵدەستم.

٩-(مُذْ ،وَمُنْذُ) بِمَعْنى أوَّلِ المُدَّةِ جَواباً كـ (مَتَى) نَحْوُ (مَا رَأيْتُ زَيْداً مُذْ يَوْمُ الجُمْعَةِ) فِي جَوابِ مَنْ قَالَ (مَتَى مَا رَأيْتَ؟) أيْ: أوَّلُ مَدَّةِ القَطَعَتْ رُؤيَتِي إيَّاهُ يَومُ الجُمُعَةِ ، وبِمَعْنى جَمِيعِ المُدَّةِ إنْ صَلُحَ جَوَاباً كـ(كَمْ) نَحْوُ (مَا رَأيْتُهُ مُذْ يومَانِ) فِي جَوابِ مَنْ قَالَ: (كَمْ مُدَّةً مَا رَأيْتَ زَيْداً؟) ، أيْ جَمِيعُ مُدَّةٍ مَا رَأيْتُهُ فِيها يوْمان.

١٠-(لَدَى ، ولَدُنْ) بِمَعْنى (عِنْدَ) نَحْوُ (المَالُ لَدَيْكَ) والفَرْقُ بَيْنَهُما أنَّ (عِنْدَ) للمَكَانِ ، ولا يُشْتَرَطُ فِيهِ الحُضُورُ ، ويُشْتَرَطُ ذلِك فِي (لَدَى ، ولَدُنْ) وفِيهِ لُغاتٌ (لَدَنْ ، لَدُنْ ، لَدِنْ ، لَدْ ، لُدْ ، لِدْ).

١١-(قَطُّ) للمَاضِي المَنْفِيِّ ، نَحْوُ (مَا رَأيْتُهُ قَطُّ).

---

٩. (مذ، منذ) به واتای سەرەتای کات دێن، جا لە وەڵامی پرسیارێکدا بێت کە بە (متی) کرابێت، وەك: (مارایت زیداً مذ یوم الجمعة)ئەمەش لەوەڵامی کەسێکدا کە دەپرسێت: (متی ما رایت زیداً؟)، وەڵامەکە بەمانای ئەوە دێت کە: سەرەتای ئەو کاتەی کە بینینم بۆی پچڕاوە ڕۆژی هەینیە، هەروەها بە واتای (هەموو کاتەکە) دێت، بەمەرجێك بەکەڵکی ئەوە بێت کە وەڵام بێت بۆ (کم)، وەك: (مارایته مذ یومان)، لەوەڵامی کەسێکدا کە دەڵێت: (کم مدة ما رایت زیداً؟) ماناکەش ئەوە دەگەیەنێت کە: هەموو ئەو ماوەیەی کە ئەوم تێدا نەبینیوە دوو ڕۆژە.

١٠. (لدی، لدن) بەواتای (عند)-واتە لای-، وەك: (المال لدیك)، جیاوازیش لە نێوانیاندا ئەوەیە کە (عند) بۆ مەکان دەبێت و تێیدا بەمەرج نەگیراوە شتەکەی لەلا ئامادەبێت ، بەڵام ئەمە لە (لدی) و (لدن) دا مەرجە[1]. لەم ووشەیەشدا چەند لوغەیەك هەیە کە بریتین لە (لدن، لدن، لدن، لدْ، لُد، لِد).

١١.(قطّ) بۆ ماضی نەفی کراو، وەك: (ما رایته قطّ).

---

١ بۆ نموونە ئەگەر ووتمان: (المال عندك)، ئەوە دەگەیەنێت کە پارەکە لای ئەوکەسەیە بەڵام مەرج نیە ئێستا لەبەردەستیدا بێت، بەڵام ئەگەر ووتمان: (المال لدیك)، ئەوە ئەوە دەگەیەنێت کە پارەکەی لایە و لەبەردەستیشیدایە.

١٢-(عَوْضُ) لِلمُستَقْبَلِ المَنفِيِّ ، نَحْوُ (لا أضْرِبُهُ عَوْضُ) أيْ أبَداً.

وَاعْلَمْ أنّه إذا أُضِيفَتِ الظّرُوفُ إلى جُمْلَةٍ جَازَ بِناؤُها عَلى الفَتْحِ ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿هَـذَا يَوْمَ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ ﴾ [1](المائدة/١١٩). ، وهكذا (يَوْمَئِذٍ و حِيْنَئِذٍ).

كذلِك (مِثْل ، وغَيْر) مَعَ (مَا وأنْ و أنَّ) تَقولُ: (ضَرَبْتُ مِثْلَ مَا ضَرَبَ زَيْدٌ وضَرَبْتُهُ غَيْـرَ أنْ ضَرَبَ زَيْدٌ ، وقِيامِي مِثْلَ أنَّكَ تَقُومُ).

**الخُلاصَةُ:**

بَقيَّةُ الظّرُوفِ المَبْنِيـةِ:

٥-(أيْنَ ، أنَّى).

٦-(مَتى).

٧-(كَيْفَ).

---

١٢.(عوض) بۆ موضاریعی نەفی کراو، وەك:(لا أضربه عوض) واتە: هەتا هەتایە.

بزانە ئەگەر زەرفەکان ئیزافە کران بۆ لای ڕستە ئەوە دروستە بینا بکرێن لەسەر فەتحە، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿هذا یومُ ینفعُ الصادقِینَ صدقُهم﴾، بەهەمان شێوە:(یومئذٍ) و (حینئذٍ).

هەر بەهەمان شێوەیە:(مثل) و (غیر) لەگەڵ (ما) و (ان) و (ان) دا، دەڵێین: (ضربت مثل ما ضرب زید) و (ضربته غیر ان ضرب زید) و (قیامي مثل انك تقوم).

**پوختە**

پاشماوەی زەرفە مەبنیەکان بریتین لە:

٥.(این، انی).

٦.(متی).

٧.(کیف).

---

١ - وهيَ إحدى القِراءاتِ ، وفي القرآنِ الكريم : ( هذا يَوْمُ يَنفَعُ الصادِقِينَ صِدْقُهُمْ ) (المائدة / ١١٩ ) .

٨-(أَيَّانَ).

٩-(مُذْ ، ومُنْذُ).

١٠-(لَدى ، ولَدُنْ).

١١-(قَطُّ).

١٢-(عَوْضُ).

## اسئلة

١-لأيِّ مَعْنًى تُسْتَعْمَلُ (أَيْنَ و أَنَّى)؟ اُذكُرْ ذلِك مَعَ إيرادِ أَمْثِلَةٍ.

٢-بأيِّ مَعْنًى تُسْتَعْمَلُ (كَيْفَ ، أَيَّانَ ، مُذْ ، وَمُنْذُ) وَضِّحْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٣-مَثِّلْ لِـ (مُذْ وَ مُنْذُ) بِمَعْنى جَمِيعِ اَلْمُدَّةِ.

٤-مَا مَعْنى (لَدى ، وَلَدُنْ)؟ وكَمْ لُغَةً فِيها؟ مَثِّلْ لذلِك.

٥-مَا الفَرْقُ بَيْنَ (لَدى ، ولَدُنْ) و (عِنْدَ)؟ اِشْرَحْ ذلِك ، ومَثِّلْ لَهُ.

---

٨.(ايان).

٩.(مذ، منذ).

١٠.(لدى، لدن).

١١.(قط).

١٢.(عوض).

## پرسیار:

١. (اين) و (انى) بۆ چ مانایەك بەكار دێن؟ بە نموونەوە بیڵێ.

٢. (كيف) و (ايان) و (مذ) و (منذ) بۆ چ مانایەك بەكار دێن؟ بە نموونەوە ڕوونی بكەوە.

٣. نموونە بهێنەوە بۆ (مذ) و (منذ) بە مانای هەموو كات.

٤. مانای (لدى) و (لدن) چیە؟ چەند لوغەی تێدایە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥.جیاوازی لە نێوان (لدى، لدن) و (عند) دا چیە؟ ئەمە ڕوون بكەوە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٦-مَتَى تُستَعْمَلُ (قَطُّ ، عَوْضُ)؟

٧-مَتَى تُبْنى الظَّرُوفُ عَلى الفَتْحِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٨- مَا حُكْمُ (مِثْلِ ، و غَيْر) مَعَ (مَا وأَنْ وأَنَّ)؟

---

٦. چ کاتێك (قط) و (عوض) بەکار دەهێنرێت؟

٧. چ کاتێك زەرفەکان بینا دەکرێن لەسەر فەتحە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨. حوکمی (مثل) و (غیر) چیە لەگەڵ (ما) و (ان) و (انّ) دا.

## ڕاهێنان

أ-زەرفە مەبنیەکان لەم ڕستانەدا دیاری بکە:

١-أيْنَ تَذْهَبُ؟ ومَتَى تأتِي؟

٢-ما رَأَيْتُهُ مُذْ سافَرَ إلى دِمَشْقَ.

٣-لَمْ أشْتَرِ كِتاباً مَنْذُ سَنَتَان.

٤-هَلْ لَدَيْكَ قَلَمُ رَصاصٍ؟

٥-لا أُكَلِّمُهُ عَوْضُ.

٦-مَا قَرَأْتُهُ قَطُّ.

٧-كَيْفَ حَالُكَ؟

ب- ئەم زەرفانەی خوارەوە لە ڕستەی بەسووددا بەکار بهێنە:

مَتَى، كَيْفَ، مُنْذُ، لَدُنْ، قَطُّ، أنّى، أيْنَ.

ج- بە زەرفێکی گونجاو ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

١-......... تَذْهَبْ أذْهَبْ.

٢-مَا سَمِعْتُهُ............

٣-............ حَالُ أخِيكَ؟

٤-هَلْ......... كِتابُ فِقْهٍ؟

٥-لَمْ أشاهِدِ المَدْرَسَةَ......... فِراقَـها.

٦-لا آخُذُ الكِتابَ..........

٧- قال تعالى:﴿.........جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ (النصر/١).

د- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-﴿ قال تعالى:قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا﴾ (آل عمران/٣٧).

٢- قال تعالى:﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا﴾ (الأعراف / ١٨٧).

٣-مَا رَأيْتُهُ يَدرُسُ مُنْذُ ثلاثَةِ أيّامٍ.

٤- قال تعالى:﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلاَمَهُمْ ﴾ (آل عمران /٤٤)

٥-مَا رَأيتُ كَرِيماً مِثْلَكَ قَطُّ.

## الدرس التاسع والعشرون

### الخَاتِمَةُ في سائِرِ أحكامِ الاسْمِ ولَواحِقِه - غَيْرِ الإعْرابِ والبِناءِ

### الفَصْلُ الأوَّلُ: فِي التَّعْرِيفِ والتَّنْكِيرِ

الاسْمُ عَلى قِسْمَيْنِ مَعْرِفَةٍ ونَكِرَةٍ.

أ-المَعْرِفَةُ ، وهِيَ اسْمٌ يَدُلُّ عَلى شيءٍ مُعَيَّنٍ ، وتَنْقَسِمُ إلى سِتَّةِ أقْسامٍ.

١-المُضْمَراتُ.

٢-الأعْلامُ.

٣-المُبْهَماتُ ، أعْنِي أسْماءَ الإشاراتِ والمَوْصُولاتِ.

٤-المُعَرَّفُ باللاَّمِ.

٥-المُضَافُ إلى أحَدِها.

٦-المُعَرَّفُ بِالنِّداءِ.

---

## وانەی بیست و نۆیەم

### کۆتایەك سەبارەت بە حوکمەکانی دیکەی ئیسم و پاشکۆکانی _جگە لە ئیعراب و بینا _

### وەرزی یەکەم: سەبارەت بە مەعریفە و نەکیرەکردنی ئیسم (ناسراوو نەناسراو)

ئیسم دەکرێتە دوو بەشەوە مەعریفە و نەکیرە:

ا.مەعریفە: ئیسمێکە دەلالەت دەکاتە سەر شتێکی دیاریکراو، کە دەکرێت بە شەش بەشەوە:

١. ضەمیرەکان.

٢. عەلەمەکان.

٣. موبهەمەکان -واتە:ناڕوونەکان-، مەبەست لە ئیسمی ئیشارە و مەوصولەکانە.

٤. مەعریفە بەهۆی لامەوە.

٥. ئەو ئیسمەی کە ئیزافە دەکرێت بۆ لای یەکێك لەوانەی سەرەوە.

٦. ناسراو بەهۆی نیداء ەوە.

وأَعْرَفُ المَعارِفِ المُضْمَرُ المُتكَلِّمُ ، نَحْوُ (أَنَا ، ونَحْنُ) ، ثُمَّ المُخاطَبُ ، نَحْوُ (أَنْتَ) ، ثُمَّ الغائِبُ ، نَحْوُ (هُوَ) ، ثُمَّ العَلَمُ و هُوَ مَا وُضِعَ لِشَيْءٍ مُعَيَّنٍ بِحَيْثُ لا يَتَناوَلُ غَيْرَهُ بِوَضِعٍ واحِدٍ نَحْوُ (زَيْد) ، ثُمَّ المُبْهَماتُ ، مِثلُ (هذا ، الَّذِي) ونَحْوُهُما ، ثُمّ المُعرَّف بـاللامِ مِثْلُ: (الرَّجُل) ، ثُمّ المُضَافُ إلى أَحَدِها إضَافَةً معنويّةً ، مِثْلُ: (كتـابُ سَعِيدٍ) ، وهُوَ فِي قُوَّةِ المُضَافِ إليهِ ، ثُمّ المعرَّفُ بالنِّداءِ [1] مثل: يا رَجُلُ

ب–النَّكِرَةُ ، مَا وُضِعَ لِشَيْءٍ غَيرِ مُعَيَّنٍ نَحْوُ (رَجُل وَفَرَس).

**الفَصْلُ الثَّانِي: فِي أَسْماءِ الأَعْدادِ**

اِسْمُ العَدَدِ ، مَا وُضِعَ لِيَدُلَّ عَلى كَمِّيَّةِ آحادِ الأَشْياءِ.

---

مەعریفەترینی مەعریفەکان بریتیە لە ضەمیری موتەکەلیم وەك: (انا، نحن)، پاشان موخاتەب، وەك: (انت)، پاشان غائیب، وەك: (هو)، پاشان عەلەم، کە بریتیە لەو ئیسمەی کە دانراوە بۆ شتێکی تایبەت کە بەو دانانە شتێکی تر ناگرێتەوە[2]. وەك: (زید)، پاشان موبهەمەکان، وەك: (هذا، الذي) و هەر شتێك وەك ئەم دوانە بێت، پاشان مەعریفە بەهۆی لامەوە، وەك: (الرجل)، پاشان ئیزافەکراو بۆ یەکێك لەمانە بە ئیزافەیەکی مەعنەوی، وەك: (کتاب سعید)، ئەم جۆرەشیان موزافەکە مەعریفەبوونەکەی لە ئاست و توانای موزاف ئیلەیهیەکەدایە، پاشان ناسراو بەهۆی نیداء ەوە، وەك: (یارجل).

ب. نەکیرە: ئەوەیە کە دانراوە بۆ شتێکی دیاری نەکراو، وەك: (رجل، فرس).

**وەرزی دووەم: سەبارەت بە ئیسمەکانی عەدەد (هاوەڵناوی ژمارە)**

ئیسمی عەدەد: ئەوەیە کە دانراوە بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر چەندێتی دانەی شتەکان.

---

١ - إن كان نكرة مقصودة .

٢ ئەم فەیدە بۆ ئەوەیە ئەگەر کەسێك بپرسێت: چۆن (زید) کەسی تر ناگرێتەوە لەکاتێکدا چەندەها کەسمان هەیە کە ناویان (زید)ە ، وەڵامەکەش ئەوەیە کە هەر (زید)ێك لەوانە بە دانان و وەضعێکی خۆی و صیفەت و موشەخەصاتی خۆیەوە ئەو ناوەی لێنراوە، واتە چەند (زید)مان هەبێت ئەوەندە وەضع و دانانمان هەیە و هەریەکەیان خاوەنی وەضعی خۆیەتی بە موشەخەصاتی خۆیەوە.

وأُصُوْلُ أَسْـماءِ العَـدَدِ اثنَتَـا عَشْـرَةَ كَلِمَـةً (واحِـدٌ...... إلى عَشَـرَةٍ ، ومِائَـةٌ وأَلْـفٌ) واسْتِعْمَالُهُ فِي واحِدٍ و اثنَينِ عَلى القِياسِ ، أَعْنِي يَكُونُ المُذَكَّرُ بِدُون التَّاءِ والمُؤَنَّـثُ بِالتَّـاءِ تَقُولُ فِي رَجُلٍ (رَجُلٌ وَاحِدٌ) وفِي رَجُلَيْنِ (رَجُلَيْنِ اثنَيْنِ )، وَفِي امْرَأةٍ (امْرَأةٌ وَاحِدةٌ) وفِي امْرَأتَيْنِ : (امْرَأتَيْنِ اثْنَتَيْنِ ، و ثِنْتَيْنِ).

ومِنْ ثَلاثَةٍ إلى عَشَرةٍ عَلى خِلافِ القِيَاسِ ، أعِنْي للمُذَكَّرِ بالتَّاءِ ، تَقُولُ: ثَلاثَةُ رِجَالٍ إلى عَشْرةِ رِجَالٍ ، ولِلمُؤَنَّثِ بِدُونِهَا تَقُوْلُ: ثَلاثُ نِسْوَةٍ إلى عشْرِ نِسْوَةٍ.

وبَعْدَ العَشْرِ تَقُولُ: أَحَدَ عَشَرَ رَجُلاً ، اِثْنَىْ عَشَرَ رَجُلاً ، وإحْدى عَشْرَةَ امْرَأةً ، واثْنَتَى عَشْرَةَ امْرَأةً ، وثَلاثَةَ عَشَرَ رَجُلاً ، وثَلاثَ عَشْرَةَ امْرأةً إلى تِسْعَةَ عَشَـرَ رَجُـلاً وإلى تِسْـعَ عَشْرَةَ امْرَأةً.

وبَعْدَ ذلِك تَقُولُ: عِشْرُونَ رَجُلاً ، وعِشْرُونَ امْرَأةً ، بِلا فَرْقٍ إلى: تِسْعِينَ رَجُلاً وامْرَأةً،

---

ژماره بنچینەییەکانیش دوانزە ووشەن: (واحد) تا (عشرة)، (مائة) و (الف)، بەکارهێنانیشی لە یەك و دوودا لەسەر قیاسە[1]، واتە بۆ موزەکەر (تاء)ی پێوە نابێت و بۆ مێ (تاء)ی پێوە دەبێت، لە ژماردنی یەك پیاودا دەڵێیت: (رجل واحد) ، و لە دوواندا (رجلين اثنين) و لە یەك ئافرەتدا (امراة واحدة) و لە دوو ئافرەتدا: (امراتين اثنتين) یان (ثنتين).

هەروەها بەکارهێنانی لە (ثلاثة)وە بۆ (عشرة) بە پێچەوانەی قیاس دەبێت، واتە بۆ موزەکەر بە (تاء)وە، دەڵێیت: (ثلاثة رجال) تا (عشرة رجال)، بۆ مێینەش بە بێ (تاء) دەبێت، دەڵێیت: (ثلاث نسوة) تا (عشر نسوة).

لەدوای (عشر)ەوە دەڵێیت: (احد عشر رجلا، اثني عشر رجلا، احدى عشرة امراة، اثنتي عشرة امراة، ثلاثة عشر رجلا، ثلاث عشرة امراة) تا (تسعة عشر رجلا) و تا (تسع عشرة امراة).

پاش ئەمەش دەڵێیت: (عشرون رجلا، عشرون امراة) بەبێ جیاوازی، تا (تسعين رجلا وامراة)

---

[1] واتە قیاسی گشتی نەحو کە دەبێت بۆ مونەنەس ژمارەکە مۆئەنەس بێت و بۆ موزەکەر ژمارەکە موزەکەر بێت.

وواحِدٌ وَعِشْرُونَ رَجُلاً، وإحْدى وعِشْرُونَ امْرَأَةً إلى تِسْعَةٍ وتِسعِينَ رجلاً، وتِسْعٍ وتِسعِينَ امْرَأَةً.

اَلخُلاصَةُ:

جُمْلَةٌ مِنْ احْكامِ الاسْمِ ولَواحِقِهِ.

يَنقَسِمُ الاسْمُ إلى قِسْمينِ:

أ-المَعْرِفَةُ: وَهِيَ اسْمٌ وُضِعَ لِشَيءٍ مُعَيَّنٍ ، وتَنقَسِمُ إلى الأقْسامِ التَالِيَةِ:

١-المُضْمَرُ.

٢-العَلَمُ.

٣-المُبْهَماتُ.

٤-المُعَرّفُ باللاّمِ.

٥-المُضافُ إلى أحَدِها.

٦-المُعَرّف بالنّداءِ.

---

و (واحد وعشرون رجلا، احدى وعشرون امراة) تا (تسعة وتسعين رجلا، تسع و تسعين امراة).

پوختە:

هەندێ تر لە حوکمەکانی ئیسم و پاشکۆکانی:

ئیسم دەکرێتە دوو بەشەوە:

أ. مەعریفە: ئەو ئیسمەیە دانراوە بۆ شتێکی دیاریکراو، و دەبێت بەم بەشانەی خوارەوە:

١. ضەمیر.

٢. عەلەم.

٣. موبهەمەکان.

٤. مەعریفە بەهۆی لامەوە.

٥. ئیزافە بۆ لای یەکێك لەوانە.

٦. مەعریفە بەهۆی نیدا وە.

ب–النَّكِرَةُ: وهيَ اسْمٌ وُضِعَ لِشَيءٍ غَيْرِ مُعَيَّنٍ.

اِسْمُ العَدَدِ: اِسْمٌ يَدُلُّ عَلى كَمِّيَّةِ آحادِ الأشْياءِ ، وأُصُولُهُ اثْنَتا عَشْرَةَ كَلِمَةً.

واسْتِعْمالُهُ فِي (١،٢) عَلى القِياسِ فِي كَوْنِ المُذكَّرِ بِدُونِ التَّاءِ ، وَالمُؤنَّثِ بِالتَّاءِ وفِي (٣–١٠) عَلَى خِلافِ القِياسِ.

## أَسْئِلَةٌ:

١–مَا هِيَ أقْسامُ الاسْمِ؟

٢–عَرِّفِ المَعْرِفَةَ ، وعدِّدْ أَقْسامَها مَعَ إيرادِ أمْثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٣–مَا هِيَ النَّكِرَةُ؟ مَثِّلْ لَها.

٤–مَا هُوَ اسْمُ العَدَدِ؟ ومَا هِيَ أُصُولُهُ؟

٥–كَيْفَ يُسْتَعْمَلُ العَدَدانِ (١ ، ٢)؟

٦–اُذكُرْ كَيْفِيَّةَ اسْتِعْمالِ الأعْدادِ مِنْ (٣–١٠).

---

ب. نەكيرە: ئيسميّكە دانراوە بۆ شتيّكى ديارى نەكراو.

ئيسمى عەدەد: ئيسميّكە دانراوە بۆ چەنديّتى دانەى شتەكان، ژمارە بنچينەييەكانيش دوانزە ووشەن.

بەكارهيّنانيشيان لە (١، ٢) دا لەسەر قياس دەبيّت لەوەدا كە بۆ موزەكەر بەبىّ تاء و بۆ مىّيىنە بە تاء دەبيّت، و لە (٣-١٠) بە پيّچەوانەى قياسەوەيە.

## پرسيار:

١. بەشەكانى ئيسم كامانەن؟

٢. پيّناسەى مەعريفە بكە و بەشەكانى بژميّرە بە نموونەى بەسوودەوە.

٣. نەكيرە چيە؟ نموونەى بۆ بيّنەوە.

٤. ئيسمى عەدەد چيە؟ ژمارە بنچينەييەكانيش بژميّرە.

٥. ژمارەى (١، ٢) چۆن بەكار دەهيّنريّن؟

٦. ژمارەكانى (٣-١٠) چۆن بەكار دەهيّنريّن؟

٧–كَيْفَ يُسْتَعْمَلُ العَدَدُ بَعْدَ العَشْرَةِ؟

٨–كَيْفَ تُسْتَعْمَلُ الأعْدادُ بَعْدَ العِشْرِينَ؟ وهَلْ يُوجَدُ فَرْقٌ بَيْنَ الْمُذَكَّرِ والْمُؤنَّثِ فِيْها؟

---

٧. ژماره لەدوای (١٠) وه چۆن بەکار دەهێنرێت؟

٨. ژماره لەدوای (٢٠)هوه چۆن بەکار دەهێنرێت؟ ئایا بۆ موزەکەر و موئەنەس جیاوازی دەبێت؟

## ڕاهێنان:

ا- ئیسمی مەعریفه و نەکیره لەم ڕستانەدا دەربهێنه:

١–قَرَأتُ كِتَابَ الجُغْرَافِيَةِ مَساءً. ٢–جَاءَ الْمُعَلِّمُ إلى الَمدْرَسَةِ.

٣–رَأيْتُ رَجُلاً فِي السَّاحَةِ. ٤–نَحْنُ نَدِيْنُ بِالإسْلامِ لا غَيْرُ.

٥–هُوَ كاتِبٌ شَهِيرٌ. ٦–يَا رَجُلاً خُذْ بِيَدِي.

ب- عەدەد و مەعدود لەم ڕستانەدا بنووسه و شێوەی دروستیان پێ بده:

٥ رجل، ٤ نساء، ١٦ قلم، ٣ كتاب، ٧ ورقة، ١٢ فتاة، ٢١ دينار، ١٤٣ معلمة، ١٩ طالبة، ١٤ مهندس، ١٥ طبيبة.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوه بکه:

١–الصَّلاةُ عَمُوْدُ الدِّينِ.

٢– قال تعالى:﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾ (إبراهيم/٤٠).

٣– قال تعالى:﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ (الإسراء / ٩)

٤–فِي الصَّفِّ اثنا عَشَرَ طَالِباً.

٥–بَابُ الَمدْرَسَةِ مُغْلَقٌ.

## الدرس الثلاثون
## بَقيَّةُ أسماءِ العَدَدِ

تَـقُولُ: (مِائَةُ رَجُلٍ ، ومِائَةُ امْرَأَةٍ ، وأَلْفُ رَجُلٍ ، وأَلْفُ امْرَأَةٍ ، وَمِائَتا رَجُلٍ ومِائَتا امْرَأَةٍ ، وأَلفا رَجُلٍ ، وأَلفا امْرَأَةٍ) ، بِلا فَرْقٍ بَيْنَ الْمُذَكَّرِ والْمُؤَنَّـثِ، فَـإذا زادَ عَلـى الأَلْـفِ والمِائَـةِ يُسْتَعْمَلُ ، عَلَى قِياسِ مَا عَرَفْتَ.

وتُقَدَّمُ الألفُ عَلى المِائَةِ والآحَادُ عَلى العَشَراتِ ، تَقُولُ: (عِنْـدِي أَلْـفٌ ومِائَـةٌ وواحِـدٌ وعِشْرُونَ رَجُلاً ، وأَلفَانِ وثَلاثُ مِائَةٍ واثنانِ وعِشْرُونَ رَجُلاً ، وأَرْبَعَةُ آلافٍ وسَـبْعُ مِائَـةٍ وخَمْسَةٌ وَأَرْبَعُونَ رَجُلاً) ، وَعَلى ذلِك القِياسُ.

وَاعْلَمْ أنَّ الواحِدَ وَالاثنَينَ لا مُمَيِّزَ لَهُما لأنَّ لَفْظَ الْمُمَيِّزِ مُسْتَغْنٍ عَنْ ذِكْرِ العَدَدِ فِيهِمـا ، كَما تَقُولُ: (عِندِي رَجُلٌ ، ورَجُلانِ) ، وأَمَّا سَائِرُ الأعْدادِ فَلابدَّ لَها مَنْ مُمَيِّزٍ.

---

## وانەی سییەم
## پاشماوەی ئیسمەکانی عەدەد

دەڵێیت (مائة رجل، مئة امراة، الف رجل، الف امراة، مائتا رجل، مائتا امراة، الفا رجل، الفا امراة) بەبێ جیاوازی لەنێوان موزەکەر و موئەنەسدا، جا ئەگەر لە سەد و هەزار زیاتر بوو ئەوە بەپێی ئەو پێوەرانەی پێشوو دەیڵێیت کە دەیانزانیت.

هەزار پێش دەخرێت بەسەر سەد دا، موفرەدەکانیش بەسەر دەیەکاندا، دەڵێیت: (عندي الف ومئة وواحد وعشرون رجلا، والفان وثلاث مائة واثنان وعشرون رجلا، و اربعة آلاف وسبع مائة وخمسة و اربعون رجلا) ژمارەکانی تریش بەهەمان پێوەر بەکار بهێنە.

بزانە هەردوو ژمارەی (واحد) و (اثنان) مومەییز نیە، چونکە ووتنی مومەییزەکە وا دەکات کە پێویستمان بە ووتنی ژمارەکە نەبێت[1]، وەك ئەوەی کە دەڵێیت: (عندي رجل، و رجلان)، بەڵام ژمارەکانی تر هەموویان پێویستیان بە مومەییز هەیە.

---

[1] ئەم دەستەواژە کەمێك ئاڵۆزە،مەبەستیشی ئەوەیە، یەك و دوو لەگەڵ تەمییزەکەدا ناووترێن، بەڵکو تەنها تەمییزەکە دەوترێت و جێگەی ژمارەکە دەگرێتەوە، بەڵام لە ئیعرابدا پێی ناوترێت تەمییز.

ومُمَيِّزُ الثّلاثَةِ إلى العَشْرَةِ مَخـفُوضٌ وَمَجْمُوعٌ ، تَقُولُ: ثَلاثَةُ رِجَالٍ وثَلاثُ نِسْـوَةٍ ، إلاّ إذا كَانَ الُمَيِّزُ لَفظَ المِائَةِ فَحِينَئِذٍ يَكُونُ مَخـفُوضاً مُفْرَداً ، تَقُولُ: (ثَلاثُ مِائَةٍ) ، والقِيـاسُ ثَلاثُ مِئاتٍ أوْ مِئِينَ.

وَمُمَيِّزُ أَحَدَ عَشَرَ إلى تِسْعٍ وتِسْعِينَ ، مَنصُوبٌ مُفْرَدٌ ، تَقُولُ: أَحَدَ عَشَرَ رَجُلاً وإحْـدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً ، وتِسْعَةٌ وتِسْعُونَ رَجُلاً ، وتِسْعٌ وتِسْعُونَ امْرَأَةً.

ومُمَيِّزُ مِائَةٍ وأَلْفٍ وتَثْنِيَتِهِما وجَمْعِ الألفِ مَخفوضٌ مُفْرَدٌ تَقُولُ: مِائَةُ رَجُلٍ، ومِائَتَا رَجُلٍ ، ومِائَةُ امْرَأَةٍ ، وَمِائَتَا امْرَأَةٍ ، وَأَلْفُ رَجُلٍ ، وأَلفَا رَجُلٍ ، وألفا رَجُلٍ ، وأَلفُ امرَأَةٍ ، وألفا امرَأَةٍ ، وثَلاثَةُ آلافِ رَجُلٍ ، وَثَلاثَةُ آلافِ امْرَأَةٍ ، وقِسْ عَلى ذلِك.

**الخُلاصَةُ:**

فِي تَمْيِيْزِ العَدَدِ يُسْتَغْنَى عَنْ ذِكْرِ العَدَدِ بِلَفْظِ الُمَيِّزِ فِي الواحِدِ والاثنَيْنِ.

وَلابُدَّ فِي غَيْرِهِما مَنَ الأعْدادِ مَنْ ذِكرِ العَدَدِ والُمَيِّزِ مَعاً.

---

**مومەییزی سێ تا دە، هەمیشە مەجروره و جەمعە، دەڵێیت: (ثلاثة رجال، ثلاث نسوة) تەنها کاتێك نەبێت کە مومەییزەکە ووشەی (مائة) بێت، ئەوکاتە هەمیشە مەجرور و موفرەد دەبێت، دەڵێیت: (ثلاث مائة) بەڵام بەپێی قیاس دەبوایە بمانگوتایە (ثلاث مئات) یان (مئین).**

**مومەییزی یانزە تا نەوەد و نۆ، مەنصوب و موفرەد دەبێت، دەڵێیت: (احد عشر رجلا، احدى عشرة امراة، تسعة وتسعون رجلا، تسع و تسعون امراة).**

**مومەییزی سەد و هەزار و موسەناکەیان و کۆی هەزار، مەجرور و موفرەد دەبێت، دەڵێیت: (مائة رجل، مائتا رجل، مائة امراة، مائتا امراة، الف رجل، الفا رجل، الف امراة، الفا امراة، ثلاثة الاف رجل، ثلاثة الاف امراة) هەربەم شێوەیە پێوانە بکە.**

**پوختە**

**سەبارەت بە مومەییزی عەدەد**

**بەهۆی ناوبردنی مومەییزەکەوە پێویستمان بە ناوبردنی ژمارە نابێت لە یەك و دوودا.**

**بەڵام لە ژمارەکانی تردا دەبێت هەردوویان واتە ژمارە و مومەییزەکە بڵێین.**

والمُمَيِّزِ فِي الثَّلاثَةِ إلى العَشَرَةِ مَخْـفُوضٌ و مَجْمُوعٌ إلاَّ إذا كانَ الْمَمَيِّزِ لَفْظَ المِائَةِ فَيَكُونُ حِينَئِذٍ مُفْرَداً مَجْرُوراً ، والمُمَيِّزُ لـ(١١ – ٩٩) مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ.

والمُمَيِّزُ فِي المِائَةِ ، والألفِ ، وتَثْنِيَتِهِما ، وجَمْعِ الألفِ مُفْرَدٌ مَجْرُورٌ.

**أسْئلَةٌ:**

١-هَلْ هُنَاكَ فَرْقٌ بَيْنَ الألفِ والمِائَةِ مِنْ حَيْثُ التَّذْكِيرُ والتَّأنِيثُ؟

٢-كَيْفَ تُكْتَبُ الأرْقامُ مُرَتَّبَةً؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-هَلْ يُذَكَّرُ العَدَدُ مَعَ الْمُمَيِّزِ فِي الواحِدِ والاثنَيْنِ؟

٤-مَا هُوَ إعْرابُ الْمُمَيِّزِ بَعْدَ المِائَةِ؟

٥-مَا هُوَ إعْرابُ مُمَيِّزِ العَدَدِ (أَحَدَ عَشَرَ... إلى تِسْعٍ وتِسْعِيْنَ)؟

---

مومەییز لە سێ وە بۆ دە هەمیشە مەجرور و جەمعە، مەگەر مومەییزەکە ووشەی (مائة)بێت، ئەو کاتە موفرەد و مەجرور دەبێت، مومەییزی (١١-٩٩)موفرەد و مەنصوب دەبێت.

مومەییز لە سەد و هەزار و موسەنایاندا و لە کۆی هەزار دا، موفرەد و مەجرور دەبێت.

**پرسیار:**

١. ئایا لەڕووی موزەکەرو موئەنەسەوە جیاوازی هەیە لە نێوان هەزار و سەددا؟

٢. ژمارەکان چۆن بە ڕیز دەنوسرێن؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. ئایا لە یەك و دوودا ژمارەکە لەگەڵ مومەییزەکەدا دەگوترێت؟

٤. ئیعرابی مومەییزی دوای سەد چۆنە؟

٥. ئیعرابی مومەییزی ژمارە:(أحد عشر) تا (تسع وتسعين) چۆنە؟

## ڕاهێنان:

أ- ئەم ژمارانەی خوارەوە بنووسە لەگەڵ مومەییزێکی گونجاودا:

١٢٤، ٦٩٨، ١١٠٩، ١٤، ١٦، ٦٢٠، ٧٠٠

ب-ژمارەیەکی گونجاو لەگەڵ مومەییزەکانی ناو ڕستەکاندا بنووسە:

١-اِشْتَرَيْتُ............ قَلَمٍ.

٢-سافَرْتُ إلى............ مُدُنٍ.

٣-جَاءَ............ طَالِباً.

٤-أَخَذْتُ............ كِتاباً مِنَ المَكْتَبَةِ.

٥-كَتَبْتُ............ سَطْراً مِـنَ الكِتابِ.

ج-مومەییزێکی گونجاو لەم ڕستانەی خوارەوەدا دابنێ:

١-صافَحْتُ عِشرينَ............

٢-سَلَّمْتُ عَلى أَحَدَ عَشَرَ............

٣-أَكَلْتُ سِتَّةَ............

٤-وَضَعْتُ ثَلاثَةَ............ عَلى المِنْضَدَةِ.

٥-شاهَدْتُ أَلْفَي............ فِي الشّارِعِ.

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکەن:

١-اِشْتَرَيْتُ خَمْسِينَ دَفْتَراً.

٢-اِشْتَغَلْتُ سَبْعَ عَشْرَةَ ساعةً.

٣-أَكَلْتُ تُفّاحَتَيْنِ.

٤- قال تعالى:﴿ فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾(النور / ٢)

٥- قال تعالى:﴿ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا ﴾(يوسف / ٤)

## الدرس الحادي والثلاثون

## الفَصْلُ الثّالِثُ

## التّذْكِيرُ والتّأنِيث

اَلاسْمُ إمَّا مُذكّرٌ وإمّا مُؤنّثٌ. والمُؤنّثُ مَا فِيهِ عَلامَةُ التّأنِيثِ لَفظاً أوْ تقديراً. والمُذكّرُ بخِلافِهِ.

وعَلاماتُ التّأنِيثِ هِيَ:

١-التّاءُ ، نَحْوُ: فَاطِمَةٌ.

٢-الألِفُ المَقْصُورَةُ ، نَحْوُ: حُبْلَى.

٣-الألِفُ المَمْدُودَةُ ، نَحْوُ: حَمْرَاءَ وصَفْرَاءَ.

وَلا يُقَدَّرُ مِنْ عَلامَاتِ التّأنِيثِ إلاّ التّاءُ ، ودَلِيلُ كَوْنِ التّاءِ مُقَدّرَةً هُوَ رُجُوعُهَا فِي التّصْغِيرِ، نَحْوُ: (أَرْض – أُرَيْضَة) ، (دَار – دُوَيْرَة).

---

## وانەی سی و یەك

## وەرزی سێیەم

## تەزکیر و تەئنیس ( بە نێرو مێ کردنی ناو )

ئیسم یان موزەکەرە یان موئەنەسە، موئەنەس ئەوەیە کە نیشانەیەکی موئەنەسی پێوە بێت جا بە لەفزی یان لە تەقدیردا. موزەکەریش پێچەوانەی ئەوەیە کە گوتمان.

نیشانەکانی موئەنەس بریتین لە:

١. تاء: وەك: فاطمة.

٢. ئەلفی مەقصورە، وەك: حبلى.

٣. ئەلفی مەمدودە، وەك: حمراء، صفراء.

هیچکام لە نیشانەکانی موئەنەس تەقدیر ناکرێن جگە لە تاء، نیشانەی ئەوەش کە تەقدیر کراوە ئەوەیە کە لە کاتی تەصغیری -بچووککردنەوە- ئەو ئیسمەدا تائەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، وەك: (ارض) دەبێتە (أريضة)، (دار) دەبێتە (دويرة).

والمُؤَنَّثُ [1] إمّا حَقِيقِيٌّ وهُوَ ما كانَ بإزَائِهِ ذَكَرٌ فِي الحَيَوَانِ ، كَـ(امْرَأَة) و(ناقَـة) وإلاّ فَهُوَ مَجَازِيٌّ بِخِلافِ الحَقِيقِيّ ، نَحْوُ: (ظُلْمَة) وَ(عَيْن).

وَقَدْ عَرَفْتَ أحْكامَ الفِعْلِ إذا أُسْنِدَ الى المُؤَنَّثِ فَلا نُعِيدُها.

**الفَصْلُ الرَّابِعُ: المُثنّى**

المُثَنّى: اِسْمٌ أُلْحِقَ بِآخِرِهِ أَلِفٌ أوْ ياءٌ مَفْتُوحٌ مَا قَبْـلَها ، ونُـونٌ مَكْسُـورَةٌ، لِيَـدُلَّ عَلـى مُفْرَدَيْنِ اتَّفَقا لَفْظاً وَمَعْنىً. نَحْوُ (رَجُلان) رَفْعاً وَ (رَجُلَيْنِ) نَصْباً وَجَرّاً، هذا فِي الصَّحِيحِ. أمّا فِي المَقْصُورِ ، فَإنْ كَانَ (الألِفُ) مُنْقَلِباً عَنِ (الواو) فِي الثُّلاثِيِّ ، رُدَّ إلى أصْـلِهِ نَحْوُ

موئەنەسیش یان ڕاستەقینەیە، ئەویش بەوە دەگوترێت کە لە بەرامبەریدا گیانلەبەرێکی نێرینە هەبێت، وەك (امراة، ناقة) ئەگەرنا ئەوە پێی دەگوترێت مەجازی کە بە پێچەوانەی ڕاستەقینەکەوەیە، وەك: (ظلمة، عین).

پێشتریش تۆ حوکمەکانی فیعلت زانی کاتێك ئیسناد دەدرێتە پاڵ موئەنەس، ئیتر ئێمە لێرەدا دووبارەیان ناکەینەوە.

**وەرزی چوارەم: موسەنا (دوانیی[2])**

موسەنا: ئیسمێکە کە (ئەلف) یان (یاء)ێك کە پێشەکەی مەفتوح بێت لکێنرابێت بە کۆتاییەکەیەوە، لەگەڵ نونێکی مەکسوردا، بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر دوو موفرەد کە لە لەفز و مەعنادا وەك یەکبن. وەك: (رجلان) لە حاڵەتی ڕەفعدا و (رجلین) لە حاڵەتی نەصب و جەڕدا، ئەمەش کە باسمان کرد لە ئیسمێکدایە کە صەحیح بێت.

بەڵام ئەگەر مەقصور بوو، ئەوە ئەگەر (الف)ەکەی لە بنچینەدا (واو) بوو و ئیسمەکەش سێ حەرف بوو، ئەوە دەیگێڕینەوە سەر بنچینەکەی خۆی، وەك:

---

١ - المؤنث مِنْ حيثُ لفظِهِ قسمانِ : لفظيٌ ومعنويٌ . فالفظيُ : هوَ ما لحقتـهُ علامةُ التأنيثِ سواءٌ أدلَّ على مؤنثٍ كـ ( فاطمة وليلى وزهراء ) أم على مذكرٍ كـ (طلحة و حمزة و زكرياء ) . والمعنويُ : وهو ما دلَّ على مؤنثٍ مِنْ غيرِ علامةٍ ، كـ ( زينب وعينٍ و شمسٍ ).

٢ لە کوردیدا موسەنا نیە، و لەجێگەیدا کۆ بەکاردەهێنین، تەنها بۆ ڕوونکردنەوە ناومان نا(دوانیی).

(عَصَوانِ) فِي (عَصا) ، وإنْ كَانَ مُنقَلِباً عَنْ (ياء) أو عَنْ (واو) فِي الأكْثَرِ مِنَ الثُّلاثِيِّ ، أوْ لَمْ يَكُنْ مُنقَلِباً عَنْ شَيءٍ، يُقْلَبُ (ياءً) ، نَحْوُ (رَحَيانِ ، ومَلْهَيانِ ، وحُبارَيانِ).

وأمّا الاسْمُ المَمْدُودُ ، فَإنْ كَانَتْ هَمْزَتُهُ أصْلِيَّةً نَحْوُ (قَرّاء) تَثْبُتُ نَحْوُ (قَرّاءَانِ) وإنْ كَانَتْ للتَّأنِيثِ تُقْلَبُ واواً، نَحْوُ (حَمراوانِ) وإنْ كَانَتْ بَدَلاً مِنْ (واوٍ) أوْ مِن (ياءٍ) جَازَ فِيهِ الوَجْهانِ ، نَحْوُ (كِساوانِ ، كِساءانِ وَرِداوانِ ، رِداءَانِ).

ويَجِبُ حَذْفُ نُونِ التَّثْنِيَةِ عِنْدَ الإضافَةِ ، تَقُولُ: (جَاءَ غُلامَا زَيْدٍ)، وتُحْذَفُ تَاءُ التَّأنِيثِ فِي الخُصْيَةِ والألْيَةِ خَاصَّةً ، تَقُولُ: (خُصْيانِ وألْيانِ) لأنَّهُما مُتَلازِمانِ ، فَكَأنَّهُما تَثْنِيَةُ شَيءٍ واحِدٍ لا زَوْجٍ.

وإذا أُرِيدَ إضافة المُثَنّى إلى المُثَنّى، يُعَبَّرُ عَنِ الأوَّلِ بِلَفْظِ الجَمْعِ، كَقَوْلِهِ تَعالى:﴿وَالسَّارِقُ

---

(عصنوان) له ووشەی (عصا)دا، ئەگەریش له بنچینەدا (یاء) بوو، یاخود (واو) بوو بەلام ئیسمەکە له سێ حەرف زیاتر بوو، یان له بنچینەدا هیچکامیان نەبوو، ئەوە دەیگۆڕین به (یاء)، وەك: (رحیان، ملهیان، حباریان).

بەلام ئیسمی مەمدود، ئەگەر هەمزەکەی هی خۆی بوو، وەك: (قراء) ئەوە وەك خۆی دەمێنێتەوە، وەك: (قراءان)، بەلام ئەگەر هەمزەکە نیشانەی موئەنەس بوو ئەوە دەکرێت به (واو)، وەك: (حمراوان)، بەلام ئەگەر هەمزەکە جێگری (واو) یان (یاء)ێك بوو کە بەشێك بوو له ئیسمەکە —واتە زیادە نەبوو- ئەوە هەردوو ڕووەکەی تێدا دروستە، وەك: (کساوان - کساءان، رداوان — رداءان).

پێویستە نونی موسەنا لەکاتی ئیزافەکردندا حەزف بکرێت، دەڵێیت: (جاء غلاما زید)، هەروەها تاءی مێینە پێویستە لە کاتی بە موسەناکردندا لابرێت له ووشەکانی: (خصیة، إلیة)دا بە تایبەت له (إلیه)دا، دەڵێیت: (خصیان، الیان) چونکە هەریەکە لەمانە دووشتن کە هەمیشە بەیەکەوەن، بۆیە وەك ئەوە وایە شتێکی موفرەد کرابێتە موسەنا نەك شتێکی جووت.

ئەگەر ویسترا موسەنایەك ئیزافە بکرێت بۆ لای موسەنایەکی تر، ئەوە یەکەمیان بە ووشەی جەمع دەردەبڕێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ وَالسَّارِقُ

وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا ﴾(المائدة/٣٨).وذلِك لِكَرَاهَةِ اجْتِمَاعِ التَّثْنِيَتَيْنِ فِيما يَكُونُ اتِّصالُهُما لَفْظاً ومَعْنىً.

## اَلخُلاصَةُ:

اَلاسْمُ المُؤنَّثُ:ما فِيهِ عَلامَةُ التَّأنِيثِ لَفظاً أوْ تَقْدِيراً ويُشَارُ إلَيهِ بِـ (هذِهِ). والمُذَكَّرُ ، مَا هُوَ بِخِلافِهِ ويُشَارُ إلَيهِ بِـ (هذا).

اَلاسْمُ المُثَنّى: اِسْمٌ اُلْحِقَ بِآخِرِهِ أَلِفٌ ونُونٌ مَكْسُورَةٌ ، أوْ يَاءٌ ونُونٌ مَكْسُورَةٌ ، أوْ يَاءٌ ونُونٌ مَكْسُورَةٌ، ويُفْتَحُ ما قَبْلَ الياءِ لِلفَرْقِ بَينَهُ وَبَيْنَ الجَمْعِ.

ويَجِبُ حَذْفُ نُونِ التَّثْنِيَةِ عِندَ الإضافَةِ.

---

وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا ﴾[1](المائده/٣٨) ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە باش نیە دوو موسەنا کۆببنەوە لەکاتێکدا لە لەفز و لە مانادا پێکەوە نووسابن.

## پوختە

ئیسمی موئەنەس: ئەوەیە کە نیشانەیەکی مێینەی پێوەبێت لە لەفزدا یان لە تەقدیردا، و بە (هذه) ئاماژەی بۆ دەکرێت.

موزەکەریش ئەوەیە کە پێچەوانەی ئەمە بێت و بە (هذا) ئاماژەی بۆ بکرێت.

ئیسمی موسەنا: ئیسمێکە (الف)ێك و (نون)ێك یان (یاء)ێك و (نون)ێکی مەکسور بە کۆتاییەکەیەوە نووسابێت، هەروەها حەرفی پێش (یاء)ەکە فەتحەی دەدرێتێ بۆ ئەوەی جیا بکرێتەوە لە گەڵ جەمع دا.

پێویستیشە نونی موسەنا لەکاتی ئیزافەکردندا لاببرێت.

---

١ مەبەستی (أیدیهما)یە ، خۆی (یدان) بوە لەگەڵ (هما) کە دەگەڕێتەوە بۆ (السارق والسارقە)، لێرەدا ناوترێت :یداهما، بەڵکو دەڵێین: ایدیهما.

أسْئلَةٌ:

١-مَا هُوَ الاسْمُ الْمُذَكَّرُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-عَرِّفْ الاسْمَ الْمُؤَنَّثَ ، وَعَدِّدْ أَقْسامَهُ وَمَثِّلْ لَهُ.

٣-مَا هُوَ الْمُثَنى؟ اُذكُرْ لَهُ أمْثِلَةً.

٤-كَيفَ يُثَنّى المَقْصُورُ الثُّلاثِيُّ الّذِي أَلِفُهُ مُنْقَلِبَةٌ عَنْ واوٍ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٥-مَتَى تَثْبُتُ الهَمْزَةُ فِي المُثَنّى المَمْدُودِ؟

٦-كَيفَ يُثَنّى المَقْصُورُ الّذِي أَلِفُهُ مُنقَلِبَـةٌ عَـنْ (يـاءٍ) أوْ (واوٍ) إذا كَـانَ فِـي الأكْثَـرِ مِـنَ الثُّلاثِيِّ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٧-كَيْفَ يُعَبِّرُ عَنِ الْمُثَنّى إذا اُضيفَ إلى الْمُثَنّى؟ مَثِّلْ لِذلِك.

---

پرسیار:

١. ئیسمی موزەکەر چییە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. ئیسمی موئەنەس پێناسە بکە و بەشەکانی بژمێرە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. موسەنا چییە؟ چەند نموونەیەکی بۆ بڵێ.

٤. چۆن ئەو ئیسمە مەقصورە سێ حەرفیەی کە ئەلفەکەی پێشتر واو بووە دەکەیتە موسەنا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. چ کاتێك هەمزە وەك خۆی دەمێنێتەوە لە موسەنای مەمدوددا؟

٦. چۆن ئەو موسەنا مەقصورەی کە ئەلفەکەی پێشتر واو یان یاء بووە دەکەیتە موسەنا، ئەگەر ئیسمەکە لە سێ حەرف زیاتر بوو؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٧. ئیسمی موسەنا چۆن دەردەبڕیت ئەگەر ئیزافە کرابوو بۆ لای موسەنایەکی تر؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ-ئیسمی موفرەد و موسەنا و جەمع و موزەکەر و موئەنەس لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١-جَاءِ الوَلَدانِ مِنَ المَدْرَسَةِ.

٢-رَأَيْتُ الطِّفْلَيْنِ فِي سَاحَةِ الدَّارِ.

٣-هذا طَالِبٌ ذَكِيٌّ.

٤-الفَتاةُ تُساعِدُ أُمَّها.

٥-الأَبَوَانِ يُرَبِّيانِ أَوْلادَهُمَا.

٦- قال تعالى:﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾(البقرة / ٢٣٣)

٧-ذَهَبَ طَلْحَةُ إلى السُّوقِ.

ب-ئەم ئیسمانەی خوارەوە بکەرە موسەنا:

حَمْراء، خَضْراء، بناء، صَحْراء، حَلْواء، مُصْطَفى، صُغْرى، ثناء.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-(مَنْهُومَانِ لا يَشْبَعَانِ طَالِبُهُمَا: طَالِبُ عَلِمٍ، وَطَالِبُ الدُّنْيَا)[1]

٢- قال تعالى: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾(الرحمن/٥٠).

٣-هَلَكَ فِيَّ رَجُلانِ، مُحِبٌّ غالٍ، ومُبْغِضٌ قالٍ[2].

٤-فِي البَيْتِ سَاحَةٌ خَضْراءُ.

٥-(مَنْ تَساوَى يَومَاهُ فَهُوَ مَغْبُونٌ)

---

١ - المعجم الكبير للطبراني برقم( ١٠٢٣٥و١٠٩٣٢) وهو حديث صحيح

٢ - المطالب العالية برقم(٤٠٤١و٤٠٤٢ ) عن علي رضي الله عنه وهو صحيح موقوف ، وورد مرفوعا.

## الدرس الثاني والثلاثون

### الفَصْلُ الخامسُ: في المَجْمُوعِ

المَجْمُوعُ: اِسمٌ يَدُلُّ عَلى ثَلاثَةٍ فَأكْثَرَ مِنَ الآحادِ بِتَغْيِيرٍ فِي مُفْرَدِهِ هُوَ:

١-لَفْظِيٌّ نَحْوُ رِجال جَمْعُ: رَجُل ، ومُسلِمُونَ جَمْعُ: مُسْلِم.

٢-تَقْدِيرِيٌّ نَحْوُ (فُلك) عَلى وَزنِ (أُسْد) فَإنَّ مُفْرَدَهُ أيْضاً (فُلْك) لِكنَّهُ عَلى وَزْنِ (قُفْل)، أيْ إنَّ الجَمْعَ فِي (فُلْك) عَلى وَزْنِ مُفْرَدِهِ ، لكنَّ الضَّمَّةَ والسُّكُونَ فِي المُفْرَدِ أصْلِيَّانِ كَـ (قُفْل) وفِي الجَمْعِ عَرَضِيَّانِ. وعَلَيهِ فَمِثْلُ القَوْمِ لا يَكُونُ جَمْعاً لِعَدَمِ وُجُودِ مُفْرَدٍ لَهُ.

ثُمَّ الجَمْعُ عَلى قِسْمَيْنِ:

أ-سالِمٌ، وهُوَ لا يَتَغَيَّرُ بِناءُ مُفْرَدِهِ ، نَحْوُ (مُسْلِمُونَ).

ب-مُكَسَّرٌ، وهُوَ مَا تَغَيَّرَ بِناءُ مُفْرَدِهِ ، نَحْوُ (رِجال).

---

## وانەی سی و دوو

### وەرزی پێنجەم : سەبارەت بە جەمع (کۆ)

جەمع: ئیسمێکە دەلالەت دەکاتە سەر سێ موفرەد یان زیاتر بەهۆی گۆڕانێکەوە کە لە موفرەدەکەیدا دەکرێت. ئەو گۆڕانەش یان:

١. لەفزی دەبێت، وەك: (رجال) جەمعی (رجل)، و (مسلمون) جەمعی (مسلم).

٢. تەقدیری دەبێت، وەك: (فلك) لەسەر وەزنی (أسد)، کە موفرەدەکەیشی هەر بریتیە لە (فلك)، بەڵام ئەو کاتە لەسەر وەزنی (قفل) دەبێت، واتە: جەمعی ووشەی (فلك) لەسەر هەمان وەزنی موفرەدەکەیەتی، بەڵام ضەممە و سکونەکە لەموفرەدەکەیدا لەبنچینەدا هی خۆیەتی هەروەك ووشەی (قفل)، بەڵام لە جەمعەکەدا بۆی پێش هاتوون و هی خۆی نین. کەواتە بینا لەسەر ئەمە ووشەیەکی وەك (قوم) پێی ناوترێت جەمع، چونکە هیچ موفرەدێکی نیە.

پاشان جەمع دەبێتە دوو بەشەوە:

أ. سالم: ئەوەیە کە بینای موفرەدەکەی وەك خۆی بمێنێتەوە لە جەمعەکەدا، وەك: (مسلمون)

ب. تەکسیر: ئەوەیە کە بینای موفرەدەکەی گۆڕانی بەسەردا بێت، وەك: (رجال).

والسالم عَلى قِسْمَيْن: مُذَكَّرٍ سالِمٍ ومُؤَنَّثٍ سالِمٍ.

١-المُذَكَّرُ السَّالِمُ ، وهُوَ ما لَحِقَ بِآخِرِهِ (واوٌ) مُضمُومٌ مَا قَبْلَهـا ، ونُـونٌ مَفْتُوحَـةٌ نَحْـوُ (مُسْلِمُـونَ) ، أَوْ (ياء) مَكْسُورٌ مَا قَبْلَها ، ونُونٌ مَفْتُوحَةٌ ، نَحْوُ (مُسْلِمِينَ).

وَأمّا قَوْلُهُمْ (سِنُونَ ، وَأَرَضُونَ ، وَثُبُونَ ، وقَلُونَ) بِالواوِ والنُّونِ فَشاذٌّ.

ويَشْتَرَطُ فِي الجَمْعِ المُذَكَّرِ السَّالِمِ-إنْ كَانَ اسماً-أَنْ يَكُونَ عَلَماً لِمُذَكَّرٍ عَاقِلٍ خالٍ مِنَ التّاءِ. وإنْ كَانَ صِفَةً يُشْتَرطُ فِيهِ-إضافَةً إلى مَا ذُكِرَ- أَنْ لا يَكُونَ مِنْ بَابِ (أفعَل فَعْلاء) نَحْـوُ (أَحْمَرَ) مُؤَنَّثُهُ (حَمراء) وَلا (فَعْلان فَعْلى) نَحْوُ (سَكْرَان) مُؤَنَّثُهُ (سَكْرَى) ولا مِمّا يِسْتَوي فِيهِ المُذَكَّرُ والمُؤَنَّثُ نَحْوُ (صَبُوْر وجَرِيحَ).

---

سالمیش دەبێت بە دوو بەشەوە: جەمعی موزەکەری سالم و جەمعی موئەنەسی سالم.

١. موزەکەری سالم: ئەوەیە کە کۆتاییەکەی (واو)ێکی پێوە نوسابێت کە پێشەوەی مەضموم بێت لەگەڵ نونێکی مەفتوح دا، وەك: (مسلمون)، یان (یاء)ێکی پێش مەکسور و نونێکی مەفتوحی پێوە نووسابێت، وەك: (مسلمین).

بەڵام ئەوەی کە عەرەب دەڵێن: (سنون، ارضون، ثبون، قلون)، بە واو و نون، ئەوە شازە[1].

بەمەرجیش گیراوە لە جەمعی موزەکەری سالم دا -ئەگەر ناو بوو - ئەوە عەلەم بێت بۆ موزەکەری عاقڵی خاڵی لە (تاء). بەڵام ئەگەر صیفەت بوو - لەگەڵ ئەو مەرجانەی سەرەوەدا- بە مەرج گیراوە کە لە بابی (افعل فعلاء) وەك: (احمر) کە موئەنەسەکەی(حمراء)ـە، و لە بابی: (فعلان فعلی) وەك: (سکران) کە موئەنەسەکەی(سکری) یە، نەبێت، هەروەها لەو صیفەتانە نەبێت کە موزەکەر و موئەنەس تێیاندا یەکسانە، وەك: (صبور) و (جریح)[2].

---

١ جەمعی(سنة، ارض، ثبة، قلة) پێیان دەوترێت مولحەق بەجەمعی موزەکەری سالم، چونکە لەم جەمعەدا دەبێت موفرەدەکە وەك خۆی بمێنێتەوەو تەنها واوو نون یان یاءو نونی بخرێتە سەر، بەڵام ئەمانە لەجەمعدا گۆڕان بەسەر صیغەی موفرەدەکەیاندا هاتوە، بۆیە ووتراوە شازن، یا مولحەقن.

٢ دەڵێن: (رجل صبور و امراة صبور، رجل جریح و امراة جریح).

ويَجِبُ حَذْفُ نُونِهِ بالإضافَةِ نَحْوُ (مُسْلِمُو مِصْرَ) هذا في الصَّحِيْحِ.

أمّا المَنقُوصُ فَتُحذَفُ يَاؤُهُ، نَحْوُ (قاضُوْنَ ، وراعُوْنَ)، والمَقْصُورُ تُحْذَفُ أَلِفُهُ ، وَيَبْقى ما قِبْلَها مَفْتُوحاً ، لِيَدُلَّ عَلى الألفِ المَحْذُوفِ ، مِثْلُ (مُصْطَفَونَ).

٢-المُؤَنَّثُ السّالِمُ ، وهُوَ مَا أُلْحِقَ بآخِرِهِ أَلِفٌ وتاءٌ ، وشَرْطُهُ – إنْ كَانَ صِفَةً ولَهُ مُذَكَّرٌ – أنْ يكُونَ مُذَكَّرُهُ قَدْ جُمِعَ بالوَاوِ والنُّونِ نِحْوُ (مُسْلِمات) وإنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مُذكَّرٌ فَشَرْطُهُ أنْ لا يَكُونَ مُؤَنَّثاً مُجَرَّداً مِنَ التّاءِ. نَحْوُ (الحَائِض ، والحَامِل) ، وإنْ كَانَ اسْماً فإنَّهُ يُجْمَعُ بالألفِ والتّاءِ بِلا شَرْطٍ نَحْوُ (هِنْدَات).

وَأمّا الجَمْعُ المُكَسَّرُ فَصِيَغُهُ فِي الثُّلاثِيِّ كَثِيرةٌ غَيْرُ مَضْبُوطَةٍ ، تُعْرَفُ بِالسَّماعِ نَحْوُ (أَرْجُل، وأَضْراس، وَقُلُوب).

---

هەروەها پێویستە نونەکەی بەهۆی ئیزافەکردنەوە حەزف بکرێت، وەك: (مسلمو مصر)، ئەمەی باسمانکرد هەموو لە ئیسمی صەحیحدایە.

بەڵام ئەگەر مەنقوص بوو ئەوە (یاء)ەکەی لێدەکرێتەوە، وەك: (قاضون، راعون)، هەروەها مەقصور ئەلفەکەی لێدەکرێتەوە و پێش ئەلفەکەش مەفتوح دەکرێت بۆ ئەوەی نیشانە بێت لەسەر ئەلفە لابراوەکە، وەك: (مصطفون).

٢. مونەنەسی سالم: ئەویش ئەوەیە کە ئەلف و تایەك نوسێنرابێت بە کۆتاییەکەیەوە.

مەرجەکەشی – ئەگەر صیفەت بێت و موزەکەری هەبێت – ئەوەیە کە موزەکەرەکەی بە واو و نون جەمع بکرێتەوە، وەك: (مسلمات)، بەڵام ئەگەر موزەکەری نەبوو ئەوە مەرجی ئەوەیە مونەنەسەکەی خاڵی لە تاء نەبێت، وەك: (الحائض، الحامل)، ئەگەریش ئیسم بوو ئەوە بە ئەلف و تاء جەمع دەکرێتەوە بەبێ هیچ مەرجێك، وەك: (هندات).

بەڵام جەمعی تەکسیر صیغەکانی لە سێ حەرفیدا زۆر و دەستنیشان نەکراون، و بەهۆی بیستنەوە دەناسرێن، وەك:(ارجل، اضراس، قلوب)

وفِي غَيرِ الثُّلاثِيِّ عَلَى وَزْنِ (فَعَالِل) نَحْوُ (جَعَافِر، وجَداوِل) جَمْعُ (جَعْفَر وجَدْوَل) قِيَاسَاً ، كَما عَرَفْتَ فِي التَّصْرِيفِ.

واعْلَمْ أَنَّ الجَمْعَ المُكَسَّرَ أَيْضاً عَلى قِسْمَيْنِ:

١-جَمْعُ قِلَّةٍ ، وهُوَ ما يُطْلَقُ عَلى العَشْرَةِ فَمَا دُوْنَها ، وأَبْنِيَةُ جَمْعِ القِلَّةِ: (أَفْعُلٌ ، وأفْعالٌ ، وفِعْلَةٌ، وأَفْعِلَةٌ) نَحْوُ: (أَشْهُر، وأعْمال ، وفِتْيَة ، وأَعْمِدَة).

٢-جَمْعُ كَثْرَةٍ وهُوَ مَا يُطْلَقُ عَلى مَا فَوْقَ العَشْرَةِ وأَبْنِيَتُهُ مَا عَدا هذِهِ الأَرْبَعَةِ. ويُسْتَعْمَلُ كُلٌّ مِنْهُما فِي مَوْضِعِ الآخَرِ مَعَ قَرِينَةٍ ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعالى: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ﴾(البقرة/ ٢٢٨) مَعَ وُجُودِ " أَقْراء ".

**الخُلاصَةُ:**

الجَمْعُ: مَا دَلَّ عَلى ثَلاثَةٍ فَأَكْثَرَ

وتَقْسِيمَاتُهُ كَما يَأْتِي:

---

بەڵام لەسەرووی سێ حەرفیەوە لەسەر وەزنی(فعالل) دروست دەكرێت، وەك:(جعافر، جداول) كە جەمعی(جعفر)و (جدول)ن بە قیاسی، وەك لە زانستی صەرفدا دەیزانیت.

پاشان بزانە كە جەمعی تەكسیر دەكرێتە دوو بەشەوە:

١. جەمعی قیللە: ئەوەیە كە بۆ دە یان كەمتر بەكاردێت، بیناكانیشی بریتین لە: (افعُل ، وافعال ، وفِعلة، وافعِلة) وەك: (اشهُر واعمال ، وفِتيَة ، واعمِدة).

٢. جەمعی كەثرە: ئەوەیە كە بۆ سەرووی دە بەكاردێت، بیناكانیشی هەموو ئەوانەی ترن بێجگە لەو چوارە، بەڵام هەریەكە لەم دوو جۆرە هەریەكەیان لە بری ئەوی تر بەكاردێت لە كاتێكدا كە بەڵگەیەكمان بەدەستەوە بێت، وەك: فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ والمطلقات يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء ﴾ لەگەڵ ئەوەشدا كە (اقراء) هەیە.

**پوختە**

جەمع: ئەوەیە كە دەلالەت بكاتە سەر سێ یان زیاتر.

بەشەكانیشی بەم شێوەیەن:

أ- ١-لَفْظِيٌّ نَحْوُ (رِجال).

٢-تَقْدِيْرِيٌّ نَحْوُ (فُلْك).

ب- ١-مُصَحَّحٌ (سالِم)، وهُوَ مَا لَمْ يَتَغَيَّرْ بِناءُ مُفْرَدِهِ. وهُوَ عَلى قِسْمَيْنِ:

أ-الجَمْعُ المُذَكَّرُ السّالِمُ: وهُوَ ما يَلْحَقُ بِآخِرِهِ وَاوٌ ونُونٌ مَفْتُوحَةٌ ، أوْ يَاءٌ ونُونٌ مَفْتُوحَةٌ، نَحْوُ: مُسْلِمُونَ ، مُسْلِمِينَ.

ب-الجَمْعُ المُؤَنثُ السّالِمُ: وهُوَ مَا يَلْحَقُ بآخِرِهِ أَلِفٌ وتَاءٌ نَحْوُ (مُسْلِمَات).

٢-مُكَسَّرٌ ، وهُوَ ما تَغَيَّرَ بِناءُ مُفْرَدِهِ ، مِثْلُ (رِجال).

وَهُوَ عَلى قِسْمَيْنِ: ١-جَمْعُ القِلَّةِ ، وهُوَ مَا يُطْلَقُ عَلى العَشْرَةِ فَما دُونَها.

٢-جَمْعُ الكَثْرَةِ وهُوَ مَا يُطْلَقُ عَلى ما فَوقَ العَشْرَةِ.

وقَدْ يُستَعْمَلُ جَمْعُ القِلَّةِ فِي مَوْضِعِ الكَثْرَةِ وبِالعَكْسِ عِنْدَ وُجُودِ قَرِينَةٍ.

---

أ. ١. لەفزی، وەك: (رجال)

٢. تەقدیری، وەك: (فلك)

ب. ١. سالم: ئەوەیە كە بیناى موفرەدەكەی گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێت، ئەمەش دەبێتە دوو بەشەوە:

أ. جەمعی موزەكەری سالم: ئەوەیە كە واو و نونێك یان یاء و نونێك بە كۆتاییەكەیەوە نووسابێت، وەك: (مسلمون، مسلمین).

ب. جەمعی موئەنەسی سالم: ئەوەیە كە ئەلف و تاء ێك بە كۆتاییەكەیەوە نووسابێت، وەك: (مسلمات).

٢. تەكسیر: ئەوەیە كە گۆڕانكاری هاتبێت بەسەر بیناى موفرەدەكەیدا، وەك: (رجال)

ئەمیش دەكرێتە دوو بەشەوە: ١. جەمعی قیللە: ئەوەیە كە بۆ دە یان كەمتر بەكاردێت.

٢. جەمعی كەثرە: ئەوەیە كە بۆ سەرووی دە بەكاردێت.

هەندێ جار جەمعی قیللە لەجێگای كەثرە یا بەپێچەوانەوە بەكاردێت لەكاتی بوونی بەڵگەدا.

أسئلة:

١-ما هُوَ الجَمْعُ؟ وكَمْ قِسْماً يَنقَسِمُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-مَا هُوَ الجَمْعُ الُمصَحَّحُ؟ وما هِيَ أقْسامُهُ؟ وَضِّحه بِأمْثِلَةٍ.

٣-ما هُوَ الجَمْعُ الُمذَكَّرُ السّالِمُ؟ وَكَيْفَ يُجمَعُ؟ اُذكُرْ شرُوطَهُ ومَثِّلْ لَهُ.

٤-كَيْفَ يُبْنى الجَمْعُ الُمؤَنَّثُ السّالِمُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٥-عَرِّفِ الجَمْعَ الُمكَسَّرَ ، وَمَثِّلْ لَهُ.

٦-مَا هُوَ جَمْعُ القِلَّةِ؟ وما هُوَ جَمْعُ الكَثْرَةِ؟ بَيِّنْ أوْزانَهُما مَعَ أمْثِلَةٍ.

٧-هَلْ يُستَعْمَلُ جَمْعُ القِلّةِ فِي مَوْضِعِ الكَثْرَةِ؟ ومَتَى؟ وَضِّحْ ذلِك بِمَثالٍ.

---

پرسیار:

١. جەمع چییە؟ دەکرێتە چەند بەشەوە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. جەمعی سالم چییە؟ بەشەکانی کامانەن؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٣. جەمعی موزەکەری سالم چییە؟ چۆن جەمع دەکرێتەوە؟ مەرجەکانی بڵێ و نموونەی بۆ بێنەوە.

٤.جەمعی موئەنەسی سالم چۆن دروست دەکرێ؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. پێناسەی جەمعی تەکسیر بکە، و نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. جەمعی قیللە چییە؟ ئەی جەمعی کەثرە؟ وەزنەکانیان بڵێ بە نموونەوە.

٧. ئایا جەمعی قیللە لە جێگای جەمعی کەثرەدا بەکار دەهێنرێت؟ چ کاتێك؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە؟

## ڕاهێنان:

أ. جۆرەکانی جەمع لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیاری بکە:

١- قال تعالى:﴿ قَالَتِ الأَعْرَابُ آمَنَّا ﴾(الحجرات / ١٤).

٢-كَرَّمْتُ النّاجِحِينَ فِي الصَّفِّ.

٣-اِشْتَرَيْتُ الكُتُبَ مِنَ الَمكْتَبَةِ.

٤–فِي الصَّفِّ عَدَدٌ كَبِيرٌ مِنَ التَّلامِيذِ.

٥–هؤُلاءِ نِسْوَةٌ مُهَذَّباتٌ.

ب-ئەم ئیسمانەی خوارەوە جەمع بکەوە.

عِلْمٌ، رَجُلٌ، نَبِيٌّ، مُهَنْدِسٌ، كَاتِبٌ، مِسْطَبَةٌ، رِحْلَة، ذاهِبَةٌ، جَالِسَةٌ، مُحَقِّقَةٌ، وَلَدٌ، كِتابٌ، دَرْسٌ، مَدْرَسَةٌ، ساعَةٌ.

ج-ئیسمێکی جەمعی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە؛

١–هذا مِنْ......... جُرْهُمَ.

٢–رَتَّبْتُ......... عَلَى الرَّفِ.

٣–جاءَتِ......... مِنَ المَدْرَسَةِ.

٤–سافَرَ......... إلى بَغْدادَ.

٣–......... يَذْهَبُونَ إلى السَّاحَةِ.

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١– قال تعالى:﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ (الفتح/٢٩).

٢–البُخْلُ جامِعٌ لِمَساوِئِ العُيُوبِ.

٣–الأَوْلادُ يُطَالِعُونَ فِي المَكْتَبَةِ.

٤–مُوَظَّفُو الجَمَارِكِ يُفَتِّشُونَ أَمْتِعَةَ المُسَافِرِينَ.

٥–جَاءَتْ بائِعاتُ اللَّبَنِ.

## الدرس الثالث والثلاثون

## الفَصْلُ السَادسُ في المَصْدَرِ

المَصْدَرُ: اِسمٌ يَدُلُّ عَلى الحَدَثِ فَقَطْ ، ويُشتَقُّ مِنْهُ الأفعالُ نَحْوُ (الضَّرْب والنَّصْر) مَثَلاً.

وَأَبْنِيَتُهُ مِنَ الثُّلاثِيِّ المُجرَّدِ غَيْرُ مَضْبوطَةٍ ، تُعْرَفُ بالسَّماعِ. وَمِنْ غَيْـرِ الثُّلاثِـيِّ قِياسِـيةٌ ، نَحْوُ: (الإفْعال ، وَالانْفِعَال ، وَالاسْتِفْعال و الفَعْلَلَة...).

والمَصْدَرُ إنْ لَمْ يَكُنْ مَفْعُولاً مُطْلَقاً يَعْمَلُ عَمَلَ فِعْلِهِ، أعْنِي يَرْفَعُ فاعِلاً إنْ كَانَ لازماً ، نَحْوُ (أعْجَبَنِي قِيامُ زَيْدٍ) ويَنْصِبُ مَفْعُولاًبِهِ أيضاً إنْ كَانَ مُتَعَدِّياً، نَحْوُ(نَصْرُ سَعِيْدٍ عَلِيّاً فَضِيلَةٌ).

ولا يَجُوزُ تَقْدِيمُ مَعْمُولِ المَصْدَرِ عَلى المَصْدَرِ ، فَلا يُقالُ (أَعْجَبَنِي زَيْداً ضَرْبُ عَمْرٍو).

وإنْ كَانَ مَفْعُولاً مُطْلَقاً، فَالعَمَلُ لِلْفعلِ الّذِي قَبْلَـهُ ، نَحْـوُ (ضَـرَبْتُ ضَـرْباً عَمْـراً) ، فـإنَّ (عَمْراً) مَنْصوبٌ بِـ(ضَرَبْتُ) لا بِـ(ضَرْباً).

---

### وانەی سی و سێ

### وەرزی شەشەم : سەبارەت بە مەصدەر( چاووگ - ژێدەر- )

**مەصدەر: ئیسمێکە تەنها دەلالەت لەسەر ڕووداو دەکات، و فیعلەکانیشی لێوە دروست دەکرێت، بۆ نموونە وەك: (الضرب، النصر).**

**بیناکانیشی لە سێ حەرفی موجەڕەد زۆرن و هەژمار ناکرێن، تەنها بەهۆی بیستنەوە دەزانرێن، بەلاَم لە غەیری سێ حەرفیدا قیاسین، وەك: (الإفعال، الإنفعال، الإستفعال، الفعللة...).**

**مەصدەر ئەگەر مەفعول موتڵەق نەبوو ئەوە کاری فیعلەکەی خۆی دەکات، مەبەست ئەوەیە فاعیل مەرفوع دەکات ئەگەر لازم بوو، وەك: (اعجبني قيام زيد)، مەفعول بیهیش مەنصوب دەکات ئەگەر موتەعەدی بوو، وەك: (نصرُ سعيدٍ علياً فضيلة).**

**دروست نیە مەعمولی مەصدەر پێش بخرێت بەسەر مەصدەرەکەدا، کەواتە ناوترێت: (اعجبني زيداً ضربُ عمرٍو). بەلاَم ئەگەر مەفعول موتڵەق بوو ئەوە ئەو فیعلەی کە لە پێشیەوەیە عەمەلی تێدا دەکات، وەك:(ضربت ضربا عمروا)، لێرەدا (عمروا) مەنصوبە بە(ضربت) نەك بە(ضربا).**

## الفَصلُ السّابعُ في اسْمِ الفاعلِ واسْمِ المَفْعُولِ

### اسمُ الفاعلِ

اِسْمٌ يُشْتَقُّ مِنْ (يَفْعلُ)، لِيدُلَّ عَلى مَنْ قامَ بِهِ الفِعْلُ بِمَعْنى الحُدوثِ.أيْ حُدُوث الفِعْلِ مِنْهُ.
وصِيغَتُهُ مِنَ المُجرَّدِ الثُّلاثِيِّ عَلى وَزْنِ الفاعِلِ ، نَحْوُ (قائِم ، وناصِر) ومِنْ غَيْرِهِ عَلى وَزْنِ صِيغَةِ المُضارِعِ مِنْ ذلِك الفِعْلِ بِميمٍ مَضْمُومَةٍ مَكانَ حَرْفِ المُضارَعَةِ ، وكَسْرِ مَا قَبْلَ الآخِرِ ، نَحْوُ (مُدْخِل ، ومُسْتَخْرِج).
ويَعْمَلُ عَمَلَ الفِعْلِ إنْ كَانَ فِيهِ مَعْنَى الحالِ والاسْتِقبالِ ، وَمُعْتَمِداً عَلى المُبْتَدأ ، نَحْوُ (سَعِيدٌ قَائِمٌ أَبُوهُ) أوْ ذِي الحالِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي سَعِيدٌ ناصِراً أَبُوهُ عَلِيّاً) ، أوْ هَمْزَةِ الاسْتِفْهامِ، نَحْوُ (أَقائِمٌ سَعِيدٌ؟) أوْ حَرْفِ النَّفْيِ ، نَحْوُ (مَا قَائِمٌ سَعِيدٌ الآنَ أوْ غَداً) أوْ مَوصُوفٍ ، نَحْوُ (عِنْدِي رَجُلٌ ناصِرٌ أَبُوهُ عَلِيّاً).

---

### وەرزی حەوتەم سەبارەت بە ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول

#### ئیسمی فاعیل ( هاوەڵناوی بکەر -ناوی بکەری- )

ئیسمێکە لە (يفعل) دروست دەکرێت، بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەو کەسەی کە بەهۆیەوە فیعلەکە بوونی هەیە بە مانای ڕوودان.
واتە بەمانای ئەوەی کە فیعلەکە لەلایەن ئەوەوە ڕووی داوە.
صیغەکەیشی لە فیعلی سێ حەرفی موجەڕەد لەسەر وەزنی (فاعل)ە، وەك: (قائم، ناصر) لە غەیری ئەویش لەسەر وەزنی صیغە موضاریعەکەی ئەو فیعلە دەبێت بە دانانی میمێکی مەضموم لە جێگای ئەو حەرفەی کە نیشانەی موضاریع بوونی فیعلەکەیە و مەکسور کردنی حەرفی پێش کۆتایی، وەك: (مدخل، مستخرج).
ئیسمی فاعیل وەك فیعلەکەی عەمەل دەکات ئەگەر بە مانای حاڵ یان ئیستیقبال بوو، و پشتی بەستبێت بە موبتەدایەك، وەك: (سعيدٌ قائمٌ ابوه) یان بە خاوەن حاڵێك، وەك: (جاءني سعيد ناصرا أبوه عليا)، یان بە هەمزەیەکی ئیستیفهام، وەك: (أقائمٌ سعيدٌ؟) یان بە حەرفێکی نەفی، وەك: (ماقائم سعيد الآن)یا(غدا) یان بە مەوصوفێك، وەك: (عندي رجل ناصر ابوه عليا).

فَإنْ كَانَ فِيهِ مَعْنى الماضِي وَجَبَتِ الإضافَةُ، نَحْوُ (زَيدٌ نَاصِرُ سَعِيدٍ أَمْسِ) ، هـذا إذا كَـانَ مُنَكَّراً. أمّا إذا كَانَ مُعَرَّفاً باللاَّمِ فَيسْتَوِي فِيهِ جَمِيعُ الأَزْمِنَـةِ ، نَحْـوُ (سَعِيدٌ النَّاصِـرُ أَبُـوهُ خالداً الآنَ أوْ غَداً أوْ أَمْسِ) فَيَعْمَلُ فِي الجَمِيعِ.

## اسْمُ المَفْعُول

اِسْمٌ يُشْتَقُّ مِنَ الفِعْلِ المُضارِعِ المَجْهُولِ المُتَعَدِّي لِيَدُلَّ عَلى مَنْ وَقَعَ عَلَيهِ الفِعْلُ.

وَصِيغَتُهُ مِنَ الثُّلاثِـيِّ المُجَـرَّدِ عَلـى وَزْنِ (مَفْعـول) لَفْظـاً، نَحْـوُ (مَضْـرُوب) أوْ تَقْـدِيراً ، نَحْوُ(مَقُول، وَمَرْمِيّ) .

---

ئەگەر مانای ماضی لەخۆ گرتبوو ئەوە پێویستە ئیزافە بکرێت، وەك (زيد ناصرُ سعيدِ امس)، ئەمە ئەگەر نەکیرە بوو. بەڵام ئەگەر مەعریفەبوو بەهۆی لامەوە ئەوە هەموو کاتەکان تێیدا یەکسانن، وەك:(سعيد الناصر أبوه عليا الآن)یا(غدا) یا (امس)، و لە هەموویاندا عەمەل دەکات.

## ئیسمی مەفعول ( هاوەڵناوی کراو )

ئیسمێکە لە فیعلی موضاریعی بینا مەجهولی موتەعەدی دروست دەکرێت[1] بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەو کەسەی کە فیعلەکەی بەسەردا کەوتووە.

صیغەکەیشی لە سێ حەرفی موجەڕەد لەسەر وەزنی مەفعول دەبێت، بەلەفزی وەك: (مضروب) یان بە تەقدیری، وەك: (مقول، مرميّ)[2].

---

١ هۆی ئەوەی کە ئیسمی فاعیل لە فیعلی بینا مەعلوم دروست دەکرێت و ئیسمی مەفعول لە بینا مەجهول ئەوەیە کە ئیسمی مەفعول ناوە بۆ ئەو کەسەی کارەکە بەسەریدا کەوتووە ، بۆ نموونە :(مضروب) بە مانای ئەو کەسەیە کە لێدان کراوە، بۆیە دەبێت فیعلەکەی موضاریعی بینا مەجهول بێت، واتە:(یُضرَب) کە ماناکەی بریتیە لە:لێدان دەکرێت، کە ئەوەش بریتیە لە هەمان کەسی لێدان کراو، ئەمانە هەموو بە پێچەوانەی ئیسمی فاعیلەوە کە ناوە بۆ ئەو کەسەی کە کارەکەی ئەنجام داوە کە دیارە دەبێت فیعلەکەی موضاریعی مەبنی مەعلوم بێت کە فاعیلی هەیە.

٢ کە لە ئەصڵدا (مقوول) و (مرموي)بوون لەسەر وەزنی مفعول، کە لە یەکەمیاندا ضەممەی واوەکەمان نەقڵ کردوە بۆ لای قافەکە ، ئەو کاتە دوو حەرفی ساکین کەوتوونەتە پاڵ یەکتری.

وَمِنْ غِيْرِهِ كَاسْمِ الفاعِلِ ، مِنَ المُضارِعِ بِفَتْحِ مَا قَبْلَ الآخِرِ ، نَحْوُ (مُدْخَل ، ومُسْتَخْرَج).
وَيعْمَلُ عَمَلَ فِعْلِهِ المَجْهُولِ بِالشَّرائِطِ المَذْكُورَةِ فِي اسْمِ الفاعِلِ نَحْوُ (سَعِيدٌ مَنْصُورٌ أَبُوهُ الآنَ أوْ غَداً).

### الخُلاصَةُ:

المَصْدَرُ: اِسْمٌ يَدُلُّ عَلى الحَدَثِ فَقَطْ.
ويَعْمَلُ المَصْدَرُ عَمَلَ فِعْلِهِ بِرَفْعِ الفَاعِلِ ، ونَصْبِ المَفْعُولِ بِهِ إنْ لَمْ يكُنْ مَفْعُولاً مُطْلَقاً.
ولا يَجُوزُ تَقْدِيمُ مَعْمُولِهِ عَلَيْهِ.

---

لە غەیری ئەویش هەر وەك ئیسمی فاعیل دروست دەکرێت لە فیعلی موضاریع بەهۆی مەفتوح کردنی حەرفی پێش کۆتاییەوە[1]، وەك: (مدخَل، مستخرَج).
لە ڕووی عەمەلکردنیشەوە هەمان عەمەلی فیعلە بینا مەجهولەکەی دەکات بەهەمان ئەو مەرجانەی کە بۆ ئیسمی فاعیل باسکران، وەك: (سعید منصور أبوه الآن) یا(غدا).

### پوختە

مەصدەر: ئیسمێکە تەنها دەلالەت دەکاتە سەر ڕووداو.
مەصدەر هەمان عەمەلی فیعلەکەی دەکات کە مەرفوع کردنی فاعیل و مەنصوب کردنی مەفعول بیهیە، ئەگەر مەفعول موتلەق نەبوو.
دروستیش نیە مەعمولەکەی پێش بخرێت بەسەریدا.

---

- یەکەمیانمان حەزف کردووە بووەتە (مقول) لەسەر وەزنی (مفُول) ، دووەمیشیان واو و یاء لە یەك وشەدا کۆ بوونەتەوە و یەکەمیان ساکینە، لەبەر ئەوە واوەکە دەکەین بە یاء، و دەغمیان دەکەین بە یەکەوە و ضەممەی میمەکەش دەکەینە کەسرە لەبەر موناسەبەی یاءەکە، و دەبێتە (مرمِيّ).

[1] ئەمە هەڵەیەکە لە زۆربەی کتێبەکانی زمانی عەرەبیدا دووبارە کراوەتەوە، چونکە ئەگەر بڕیاربێت ئیسمی مەفعول لە فیعلی بینا مەجهول دروست بکەین ئەوە فیعلەکە خۆی حەرفی پێش کۆتاییەکەی مەفتوحەو پێویست ناکات لە دروستکردنی ئیسمی مەفعولدا ئێمە بەمەرجی بگرین.

اِسْمُ الفاعِلِ: اِسْمٌ يَدُلُّ عَلى مَنْ صَدَرَ عَنهُ الفِعْلُ بِمَعَنى الحُدُوثِ ، لا الثُّبُوتِ . ويُشْتَقُّ مِنَ المُضَارِعِ المَعْلُومِ ، ويَعْمَلُ عَمَلَ فِعْلِهِ إذا كَانَ بِمَعْنى الحالِ أَوِ الاسْتِقْبَالِ ، ومُعْتَمِداً عَلى المُبْتَدإ ، أَوْ ذِي الحَالِ ، أَوْ هَمْزَةِ الاسْتِفْهامِ ، أَوْ حَرْفِ النَّفْيِ ، أَوِ المَوْصُوفِ.

وإنْ كَانَ اسمُ الفاعِلِ مُعَرَّفاً باللاَّمِ فَلا يُشْتَرَطُ فِي عَمَلِهِ كَونُهُ بِمَعْنى الحالِ أَوِ الاسْتِقْبَالِ.

اِسْمُ المَفْعُولِ: اِسْمٌ يَدُلُّ عَلى مَنْ وَقَعَ عَلَيهِ الفِعْلُ ، ويُشْتَقُّ مِنَ الفِعْلِ المَجْهُولِ ، ويَعْمَلُ عَمَلَ فِعْلِهِ بِالشُّروطِ المُتَقَدِّمَةِ فِي اسْمِ الفاعِلِ.

**أَسْئِلَةٌ:**

١-مَا هُوَ المَصْدَرُ؟ مثِّلْ لَهُ.

---

ئیسمی فاعیل: ئیسمێکە دەلالەت دەکاتە سەر ئەو کەسەی کە فیعلەکە لێیەوە دەرچووە بەمانای ڕوودان نەك سابیت بوون[1].

دروستیش دەکرێت لە فیعلی موضاریعی مەعلوم، هەمان عەمەلی فیعلەکەی خۆیشی دەکات ئەگەر بە مانای ئێستا یان موستەقبەل بوو، و پشتی بەستبوو بە موبتەدا یان خاوەن حاڵ یان هەمزەی ئیستیفهام یان حەرفی نەفی یان مەوصوفێك.

ئەگەر ئیسمی فاعیل مەعریفە بوو بەهۆی لامەوە ئەوە بۆ عەمەل کردنی بەمەرج نەگیراوە بە مانای ئێستا یان موستەقبەل بێت.

ئیسمی مەفعول: ئیسمێکە دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی کە فیعلەکەی بەسەردا کەوتووە.

دروستیش دەکرێت لە فیعلی موضاریعی بینا مەجهول، و هەمان عەمەلی فیعلەکەی دەکات بەو مەرجانەی ئیسمی فاعیل کە پێشمان خستن.

**پرسیار:**

١. مەصدەر چییە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

---

١ بۆ نموونە کاتێك دەڵێیت: (زید قائم) مەبەست ئەوەیە کە (قیام) لە زەیدەوە ڕووی داوە نەك ئەوەی کە صیفەتی (قیام)ی بە هەمیشەیی بۆ سابیت بکەین.

٢–مَتَى يَعْمَلُ الَمصْدَرُ عَمَلَ الفِعْلِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣–هَلْ يَكُونُ الَمصْدَرُ لازِماً ومُتَعَدِّياً؟ اِشْرَحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٤–هَلْ يَجُوزُ أنْ يَتَقَدَّمَ مَعْمُولُ الَمصْدَرِ عَلَيْهِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٥–عَرِّفِ اسْمَ الفاعِلِ ، واذكُرْ صِيغَتَهُ بِمِثالٍ مُفِيْدٍ.

٦–كَيْفَ يُصاغُ اسْمُ الفاعِلِ مِنْ غَيْرِ الثُّلاثِيِّ؟ اُذكُرْ أمْثِلَةً لِذلِك.

٧–مَتَى يَعْمَلُ اسْمُ الفاعِلِ عَمَلَ الفِعْلِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٨–مَتَى تَجِبُ إضافَةُ اسْمِ الفاعِلِ؟

٩–عَرِّفِ اسْمَ الَمفْعولِ ، واذكُرْ كَيْفَ يُشتَقُّ مِنَ الثُّلاثِيِّ الُمجَرَّدِ ، مَعَ أمثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

١٠–كَيْفَ يُشْتَقُّ اسمُ الَمفْعُولِ مِنْ غَيْرِ الثُّلاثِيِّ الُمجَرَّدِ؟

١١–هَلْ يَعْمَلُ اسْمُ الَمفْعُولِ عَمَلَ الفِعْلِ؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ أمْثِلَةٍ.

---

٢. چ کاتێك مەصدەر عەمەلی فیعلەکەی خۆی دەکات؟ نموونە بۆ ئەمە بێنەوە.

٣. ئایا دەکرێت مەصدەر لازم یان موتەعەدی بێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. ئایا دروستە مەعمولی مەصدەر پێش بکەوێت بەسەر مەصدەرەکەدا؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٥. پێناسەی ئیسمی فاعیل بکە و صیغەکانی بە نموونەی بە سوودەوە بڵێ.

٦. چۆن لە فیعلی غەیری سێ حەرفیی ئیسمی فاعیل دروست دەکەین؟ نموونە بۆ ئەمە بێنەوە.

٧. چ کاتێك ئیسمی فاعیل عەمەلی فیعلەکەی دەکات؟ نموونە بۆ ئەمە بێنەوە.

٨. چ کاتێك پێویستە ئیسمی فاعیل ئیزافە بکرێت.

٩. پێناسەی ئیسمی مەفعول بکە، و باسی ئەوە بکە کە چۆن لە سێ حەرفی موجەڕەد دروست دەکرێت، بە نموونەی بەسوودەوە.

١٠. چۆن ئیسمی مەفعول لە غەیری سێ حەرفی موجەڕەد دروست دەکەین؟

١١. ئایا ئیسمی مەفعول هەمان عەمەلی فیعل دەکات؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

## ڕاهێنان:

أ-ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعول لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١-رَأَيْتُ قائِدَ الكَتِيبَةِ.
٢-يُعْجِبُني المُتَأَدِّبُ بِالإِسْلامِ.
٣-اَلْخارِطَةُ مَرْسُومَةٌ بِدِقَّةٍ.
٤-هذا المِثالُ مُسْتَخرَجٌ مِنَ الكُتُبِ القَدِيمَةِ.
٥-سَافَرَ المُحَاسِبُ أَمْسِ.
٦-أَكَاتِبٌ أَنْتَ القِصَّةَ؟
٧-ما ذاهِبٌ سَعِيدٌ الآنَ أَوْ غَداً.

ب-مەصدەرێك یان ئیسمێكی فاعیل یان ئیسمێكی مەفعولی گونجاو بخە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-............ العالِمِ زِينَتُهُ.
٢-............ مِنَ اللّهِ............ قَرِيبٌ.
٣-الوَلَدُ............ فِي السَّاحَةِ.
٤-الكِتابُ............ عَلى المَنْضَدَةِ.
٥-هَلْ............ سَعِيدٌ الآنَ.
٦-الغَداءُ............
٧-الصَّباحُ............ واللَّيلُ............

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بكە:

١-زُهْدُكَ فِي راغِبٍ فِيكَ نُقْصانُ حَظٍّ.
٢-الغِيبَةُ جُهْدُ العاجِزِ.
٣-اَلْحِلْمُ غِطاءٌ ساتِرٌ.
٤-إِنَّ المَرْءَ مَخْبُوءٌ تَحْتَ لِسانِهِ.
٥-رُبَّ قَولٍ نافِعٍ أَنْفَذُ مِنْ صَوْلٍ.

## الدرس الرابع والثلاثون

## الفَصلُ الثّامنُ: الصِّفَةُ المُشَبَّهَةُ واسْمُ التَّفْضِيلِ

### الصِّفَةُ المُشَبَّهَةُ

اسْمٌ مَشْتَقٌ مِنْ فِعْلٍ لازِمٍ ، لِيَدُلَّ عَلى مَنْ قامَ بِهِ الفِعْلُ بِمَعْنى الثُّبوتِ.

وصِيغَتُها – عَلى خِلافِ صِيغَةِ اسْمِ الفاعِلِ والمَفْعُولِ – تُعْرَفُ بِالسَّماعِ نَحْوُ (حَسَن – وصَعْب – وشُجاع – وَشَرِيف ، وَذَلُول).

وهِيَ تَعْمَلُ عَمَلَ فِعْلِها مُطْلَقاً بِشَرْطِ الاعْتمادِ المَذْكُورِ فِي اسْمِ الفاعِلِ.

ومَتَى رَفَعْتَ بِها مَعمُولَها فَلا ضَمِيرَ فِي الصِّفَةِ ، ومَتَى نَصَبْتَ أوْ جَرَرْتَ فَفِيها ضَمِيرُ المَوْصُوفِ ، مثْلُ (عَلِيٌّ حَسَنٌ خُلُقُهُ ، عَلِيٌّ حَسَنٌ خُلُقاً ، عليٌّ حَسَنُ الخُلُقِ).

---

## وانەی سی و چوار

## وەرزی هەشتەم: صیفەتی موشەببەهە و ئیسمی تەفضیل

### صیفەتی موشەببەهە[1]

ئیسمێکە لە فیعلی لازم دروست دەکرێت، بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەو کەسەی کە فیعلەکە بەهۆیەوە بوونی هەیە بە مانای سابت بوون.

صیفەکانیشی بە پێچەوانەی ئیسمی فاعیل و مەفعولەوە بەهۆی بیستنەوە دەناسرێن، وەك: (حسن، صعب، شجاع، شريف، ذلول).

ئەم صیفەتە هەمان عەمەلی فیعلەکەی خۆی دەکات بە موتڵەقی، ئەوە نەبێت کە پێویستە ئەو پشت بەستنەی هەبێت کە لە ئیسمی فاعیلدا باسمان کرد[2].

هەرکاتێکیش مەعمولەکەی خۆی مەرفوع کرد ئەوە هیچ ضەمیرێك لە صیفەکەیدا نامێنێت، بەڵام هەرکاتێك مەنصوبی کرد یان مەجروری کرد ئەوە ضەمیرێکی تێدایە کە دەگەڕێتەوە بۆ مەوصوفەکە، وەك: (عليّ حسن خلقه، عليّ حسن خلقاً، عليّ حسن الخلق).

---

١ لە کوردیدا تەنها هاوەڵناومان هەیە، و جێگەی ئەمیشی پێ پڕ دەکرێتەوە.

٢ کە بریتین لە پشت بەستن بە موبتەدا، خاوەن حاڵ، هەمزەی ئیستیفهام، حەرفی نەفی، مەوصوف.

## اسمُ التّفضيل

اِسْمٌ يُشْتَقُّ مِنْ فِعْلٍ لِيَدُلَّ عَلى الْمَوْصُوفِ بِزِيَادَةٍ عَلى غَيْرِهِ.

وصِفَتُهُ (أَفْعَلُ) غالِباً ، فَلا يُبْنى إلاّ مِنْ ثُلاثِيٍّ مُجَرَّدٍ لَيسَ بِلَوْنٍ ولا عَيْبٍ ، نَحْوُ (عَلِيٌّ أَفْضَلُ النّاسِ).

فَإِنْ كَانَ زائِداً عَلى الثّلاثَةِ ، أَوْ كَانَ لَوْناً أَوْ عَيْباً وَجَبَ أَنْ يُبْنى مِنَ الثُّلاثِيِّ الْمُجَرّدِ ما يَدُلُّ عَلى الْمُبالَغَةِ والشِّدَّةِ أَوِ الكَثْرَةِ أَوّلاً ، ثُمَّ يُذْكَرُ بَعْدَهُ مَصْدرُ ذلِك الفِعْلِ مَنصُوباً عَلى التَمْييزِ ، كَمَا تَقُولُ: (هُوَ أَشَدُّ اسْتِخْراجاً ، وأَقْوى حُمْرَةً ، وَأَقْبَحُ عَرْجاً ، وأَكْثَرُ اضْطِراباً مِنْ زَيدٍ).

وقِياسُهُ أنْ يَكُونَ للفَاعِلِ كَمَا مَرَّ ، وقَدْ جَاءَ لِلمَفْعُولِ [1] ، نَحْوُ: أَنْدَرُ أَشْغَلُ وأَشْهَرُ [2].

### ئیسمی تەفضیل (هاوەڵناوی چۆنیەتی پلەی بەراورد)

ئیسمێکە لە فیعلێك دروست دەکرێت بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر مەوصوفێك کە زیادەیەکی هەیە بەسەر غەیری خۆیدا.

صیغەکەیشی زۆربەی کات بریتیە لە (افعل)، کەواتە دروست ناکرێت لە فیعلێکی سێ حەرفی موجەڕەد نەبێت کە نە ڕەنگ بێت و نە عەیب، وەك: (عليٌ افضل الناس).

خۆ ئەگەر زیاتر لە سێ حەرفی بوو، یان ڕەنگ یان عەیب بوو ئەوە پێویستە یەکەمجار لە سێ حەرفیەکی موجەڕەد شتێك دروست بکەین کە دەلالەت بکاتە سەر توندی یان زۆری، پاشان بەدوایدا مەصدەری ئەو فیعلە بهێنین بە مەنصوبی لەسەر ئەوەی کە تەمییزە. وەك ئەوەی کە دەڵێیت: (هو أشد استخراجا، و أقوى حمرة، وأقبح عرجا، و أكثر اضطرابا من زيد).

بە شێوەیەکی قیاسیی دەبێت بۆ فاعیل بەکار بهێنرێت وەك باسمانکرد، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا بەکەمی بۆ مەفعول هاتووە، وەك: (اندر، اشغل، اشهر).

---

١ - القياسُ أن يكونَ التفضلُ على اسمِ الفاعلِ دونَ اسمِ المفعولِ .

٢ - وهذا خلافُ القياسِ لأنّهُ مُخالفٌ للشروطِ التي يجبُ أن تتوفرَ في الفعلِ الذي يُشتقُّ منهُ لفعلِ التفضيلِ فـ ( أشغلُ وأشهرُ ) اشتقا من صيغةِ المجهولِ و ( أندرُ ) من غيرِ الثلاثيِّ .

واسْتِعْمالُهُ عَلى ثَلاثَةِ أوْجهٍ:

١–أنْ يَكُونَ مُضافاً نَحْوُ (زَيدٌ أَفْضَلُ القَوْمِ) ونَحْوُ: (فاطِمَةُ أَفْضَلُ امْرَأةٍ).

٢–أنْ يَكُونَ مُعَرَّفاً باللاّمِ ، نَحْوُ (زَيدٌ الأفْضَلُ).

٣–أنْ تَأتِي بَعْدَهُ (مِنْ) نَحْوُ (زَيدٌ أَفْضَلُ مِنْ رامزٍ).

ويَجُوزُ فِي الأوَّلِ إنْ كَانَ المُضافُ إلَيهِ مُعرَّفاً باللاّمِ ، الإفرادُ والتذكِيرُ ، كَمَا تَجُوزُ مُطابَقَةُ اسْمِ التَّفْضِيلِ لِلمَوصُوفِ نَحْوُ (زَيدٌ أَفْضَلُ القَوْمِ ، والزَّيدان أَفْضَلا القَوْمِ ، وأَفْضَلُ القَوْمِ ، والزَّيدُونَ أَفْضَلُو القَوْمِ وَ أَفْضَلُ القَوْمِ ، وهِنْدٌ فَضْلى القَوْمِ وَ افْضَلُ القَومِ ، والهِنْدان فُضْلَيا القَوْمِ وَافْضَلُ القَوْمِ ، وَالهِنْداتُ فَضْلَيَاتُ القَوْمِ وأَفْضَلُ القَوْمِ).

وإنْ كَانَ نَكِرةً فَيَجِبُ الإفرادُ والتَّذكِيرُ ، نَحْوُ هذان أَفْضَلُ رَجُلَيْنِ وهؤُلاءُ أَفْضَلُ رِجالٍ.

وَفِي الثَّانِي تَجِبُ المُطابَقَةُ، نَحْوُ(زَيْدٌ الأفْضَلُ، والزَّيْدان الأفْضَلان، وَالزَّيدُونَ الأفْضَلونَ).

---

بەكارهێنانیشی بە سێ جۆر دەبێت:

١. موزاف بێت، وەك: (زيد افضل القوم) و (فاطمة افضل امراة).

٢. مەعریفە بێت بەهۆی لامەوە، وەك: (زيد الأفضل).

٣. (من) بەدوایدا بێت ، وەك: (زيد افضل من عمرو).

لە یەكەمیاندا ئەگەر مەعریفە بوو بە هۆی لامەوە، هێنانی دروستە بەموفرەد و موزەكەریی ، هەروەك چۆن دروستیشە ئیسمە تەفضیلەكە موتابیقی مەوصوفەكەبێت، وەك: (زيد افضل القوم) (الزيدان افضلا القوم)يان (افضل القوم)، (الزيدون افضلو القوم) يان (افضل القوم)، (هند فضلى القوم) يان (افضل القوم)، (الهندان فضليا القوم)يان(افضل القوم)، (الهندات فضليات القوم) يان (افضل القوم).

ئەگەریش نەكیرە بوو ئەوە پێویستە بە موفرەد و موزەكەریی بوترێت، وەك:(هذان افضل رجلين)، (هؤلاء افضل رجال).

لە دووەمیشیاندا موتابیق بوون پێویستە، وەك:(زيد الأفضل، الزيدن الأفضلان، الزيدون الأفضلون).

وَفِي الثَّالِثِ يَجِبُ كَوْنُهُ مُفْرَداً مُذَكَّراً أَبداً ، نَحْوُ (زَيْدٌ أَفْضَلُ مِنْ عمروٍ ، والزَّيْدَانِ أَفْضَلُ مِنْ عمروٍ ، والزَّيْدونَ أَفْضَلُ مِنْ عمروٍ. وهِنْدٌ ، والهِنْدانِ والهِنْداتُ أَفْضَلُ مِنْ عمروٍ).

وعَلى الأَوْجُهِ الثَّلاثَةِ يُضْمَرُ فِيهِ الفَاعِلُ ، واسْمُ التَّفْضِيلِ يَعْمَلُ فِي ذلِكَ الُمضْمَرِ ، ولا يَعْمَلُ فِي الاسْمِ الظَّاهِرِ أَصْلاً إلاّ إذا صَلُحَ وُقُوعُ فِعْلٍ بِمَعْنَى اسْمِ التَّفضِيلِ مَوْقِعَهُ فِي مِثْلِ قَوْلِهِم (مَا رَأَيْتُ رَجُلاً أَحْسَنَ فِي عَيْنِهِ الكُحْلُ مِنْهُ فِي عَيْنِ زَيدٍ) ، فَإِنَّ (الكُحْلُ) فاعلٌ لِـ (أَحْسَن) إذْ يَصِحُّ أَنْ يُقالَ (ما رَأَيْتُ رَجُلاً يَحْسُنُ فِي عَيْنِهِ الكُحْلُ كَما يَحْسُنُ فِي عَيْنِ زَيْدٍ).

**الخُلاصَةُ :**

الصِّفَةُ الُمشَبَّهَةُ: اِسْمٌ يُشْتَقُّ مِنَ الفِعْلِ الّلازِمِ ، لِيَدُلَّ عَلى الاتِّصَافِ بِصِفَةٍ عَلى نَحْوِ اللُّزُومِ والثُّبوتِ.

وهِيَ تَعْمَلُ عَمَلَ فِعْلِها بِشُرُوطٍ تَقَدَّمَتْ فِي اسْمِ الفَاعِلِ.

---

لە سێیەمیشیاندا پێویستە هەمیشە موفرەد و موزەکەر بێت، وەك: (زيد افضل من عمرو، الزيدان افضل من عمرو، الزيدون افضل من عمرو)، (هند، الهندان، الهندات لفضل من عمرو).

لەسەر هەرسێ شێوە بەکارهێنانەکەش پێویستە فاعیلەکە تێیدا ضەمیری نادیار بێت، و ئیسمە تەفضیلەکەش لەو فاعیلە نادیارەدا عەمەل دەکات، و هەرگیز عەمەلەکەی لە ئیسمی دیاردا ناکات، تەنها کاتێك نەبێت کە دروست بێت فیعلێکی بەمانا ئیسمە تەفضیلەکە بخرێتە جێگاکەیەوە، ئەمەش لە نموونەیەکی وەك: (مارایت رجلا احسن في عينيه الكحل منه في عين زيد)دا، کە (الكحل) بکەرە بۆ (احسن)، چونکە دروستە بووترێت: (مارايت رجلا يحسن في عينيه الكحل كما يحسن في عين زيد).

**پوختە**

سیفەی موشەببەهە: ئیسمێکە لە فیعلی لازم دروست دەکرێت، بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر وەصفداربوون بە صیفەتێکەوە بەشێوەیەکی سابت.

هەمان عەمەلی فیعلەکەیشی دەکات بەهەمان ئەو مەرجانەی کە لە ئیسمی فاعیلدا باسکران.

اِسْمُ التَّفْضِيلِ: اِسمٌ يُشْتَقُّ مِنَ الفِعْلِ ، لِيَدُلَّ عَلى زِيادَةِ الْمَوْصُوفِ عَلى غَيْرِهِ فِي صِفَةٍ ، وصِيغَتُهُ (أَفْعَلُ) غَالِباً ، ولا يُبْنَى إلاّ مِنَ الثُّلاثي المُجَرَّدِ ، لِيس بِلَوْن ، وَلا عَيْبٍ ، فَإذا لَمْ تَتَوَفَّرِ الشُّرُوطُ المَذْكُورَةُ فِيهِ يَجِبُ أَنْ يُبْنَى مِنَ الثُّلاثِيّ المُجَرَّدِ ما يَدُلُّ عَلى المُبَالَغَةِ والشِّدَّةِ ، ثُمَّ يُذْكَرُ بَعْدَهُ مَصْدَرُ الفِعْلِ المَقْصُودِ تَفْضِيلُهُ ، مَنصُوباً عَلى التَّمْيِيزِ.

ويُستَعْمَلُ أَفْعَلُ التَّفْضِيلِ إمَّا مُضافاً ، أوْ مُعَرَّفاً بِاللاّمِ ، أوْ مَعَ (مِنْ) وَلا يَعْمَلُ أَفْعَلُ التَّفْضِيل فِي الاسْمِ الظَّاهِرِ أَصْلاً.

أسْئِلَةٌ:

١-عَرِّفِ الصِّفَةَ المُشَبَّهَةَ وَ اذكُرْ اشْتِقاقَها مَعَ مِثالٍ يُوَضِّحُ ذلِك.

٢-مَتَى تَعْمَلُ الصِّفَةُ المُشَبَّهَةُ عَمَلَ فِعْلِها؟ وما شَرْطُ ذلِك؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ أَمْثِلَةٍ.

---

ئیسمی تەفضیل: ئیسمێکە لە فیعل دروست دەکرێت، بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر زیادی مەوسوفەکە بەسەر غەیری خۆیدا لە صیفەتێکدا، صیغەکەیشی زۆربەی جار (افعل)دەبێت، دروستیش ناکرێت لە فیعلی سێ حەرفی نەبێت کە نەڕەنگ و نەعەیب بێت، ئەگەریش ئەم مەرجانەی تێدانەبێت ئەوە پێویستە لە فیعلی سێ حەرفی موجەڕەد صیغەیەك دروست بکەین کە دەلالەت بکاتە سەر توندی و زیادەڕۆیی، پاشان بەدوایدا مەصدەری ئەو فیعلە بهێنین کە دەمانەوێت بیکەینە تەفضیل، و مەنصوبی کەین لەسەر ئەوەی کە تەمییزە.

ئیسمی تەفضیل بە موزاف، یان مەعریفەیی بەهۆی لامەوە، یان لەگەڵ (من) دا بەکاردێت. لە بنچینەشدا ئیسمی تەفضیل لە ئیسمی دیاردا عەمەل ناکات.

پرسیار:

١. سیفەی موشەببەهە پێناسە بکە، و چۆنیەتی دروستکردنیشی باس بکە بە نموونەیەکەوە کە ڕوونی بکاتەوە.

٢. چ کاتێك صیفەتی موشەببەهە هەمان عەمەلی فیعلەکەی دەکات؟ مەرجەکەشی چییە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٣-مَتَى تَحْتَمِلُ الصِّفَةُ الضَّمِيرَ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٤-عَرِّفِ اسْمَ التَّفْضِيلِ.

٥-كَيْفَ تُبْنى صِيغَةُ اسْمِ التَّفْضيلِ؟وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٦-كَيْفَ تُبْنى صِيغَةُ اسْمِ التَّفْضِيلِ إنْ كَانَ زَائِداً عَنِ الثَّلاثَةِ؟ مَثِّل لِذلِك.

٧-أُذكُرْ أَوْجُهَ اسْتِعْمالاتِ اسْمِ التَّفْضِيلِ مَعَ أَمْثِلَةٍ.

٨-هَلْ يُضْمَرُ الفاعِلُ فِي اسْمِ التَّفْضِيلِ؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ أَمْثِلَةٍ.

---

٣. چ كاتێك صیفەتی موشەببەهە ضەمیر لەخۆ دەگرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.

٤. پێناسەی ئیسمی تەفضیل بكە.

٥. صیغەی ئیسمی تەفضیل چۆن دروست دەكرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.

٦. صیغەی ئیسمی تەفضیل چۆن دروست دەكرێت ئەگەر زیاتر لە سێ حەرف بوو؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٧. شێوازەكانی بەكارهێنانی ئیسمی تەفضیل بڵێ بە نموونەوە.

٨. ئایا لە ئیسمی تەفضیلدا فاعیل ضەمیری موستەتیر دەبێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.

## ڕاهێنان:

**أ-صیفەتی موشەببەهە و ئیسمی تەفضیل لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:**

١-هذا أَشَدُّ بَيَاضاً مِنْ غَيْرِهِ.

٢-سَعِيدٌ أَحْسَنُ أَخلاقاً، وصَالِحٌ أَكْثَرُ جُوداً.

٣-(وهُوَ عَلَيْكَ سَهْلٌ يَسِيرٌ، وعَلَيْنا صَعْبٌ عَسِيرٌ).

٤-الحَارِسُ شُجَاعٌ.

٥-أَبُوكَ رَجُلٌ شَرِيفٌ.

**ب-لەم ئیسمانەی خوارەوە صیفەتی موشەببەهە و ئیسمی تەفضیل دروس بكە:**

حُسْن، كَرَم، شَرَف، قُوَّة، كَثْرَة، جُود، خُلُق.

ج-صیفەتێکی موشەببەهە یان ئیسمێکی تەفضیلی گونجاو لەم بۆشاییانەدا دابنێ:

١-أَخُوكَ رَجُلٌ............

٢-هذا............ أَخْلاقاً.

٣-جَاءَ............ الْمُدَرِّسِيْنَ.

٤-سَافَرْتُ إِلى............ مِنْ دِمَشْق.

٥-سَعِيدٌ طَالِبٌ............

٦-رَأَيْتُ............ السِّيرة.

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى:﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾(الأحزاب / ٦).

٢- قال تعالى:﴿وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾(الأعراف/١٥١).

٣- قال تعالى:﴿وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنْ الْقَتْلِ﴾(البقرة /١٩١)

٤-الْمُؤمِنُ صَبُورٌ شَكُورٌ.

٥-الْمُنافِقُ حَسُودٌ خَبِيثٌ.

## الدرس الخامس والثلاثون

## القِسْمُ الثاني- فِي الفِعْلِ

وأَقْسامُهُ ثلاثَةٌ:

١-اَلْماضِي. ٢-الْمُضارِعُ. ٣-الأَمْرُ.

### الفِعْلُ الماضي

فِعْلٌ يَدُلُّ عَلى زَمانٍ قَبْلَ زَمانِ الخبرية[1]، وهُوَ مَبْنِيٌّ عَلى الفَتْحِ، إنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ ضَمِيرٌ مَرْفُوعٌ مُتَحَرِّكٌ، وإلاّ فَهُو مَبْنِيٌّ عَلى السُّكُونِ نَحْوُ (ضَرَبْتُ) أوْ عَلى الضَّمِّ إنْ كَانَ مَعَ الوَاوِ نَحْوُ (ضَرَبُوا).

### الفِعْلُ المُضارِعُ

فِعْلٌ يُشْبِهُ الاسْمَ [2] بِأَحَدِ حُرُوفِ (أَتَيْنَ) فِي أَولِهِ لَفْظاً فِي:

---

## وانەی سی و پێنج

## بەشی دووەم سەبارەت بە فیعل (کار)

بەشەکانیشی سیانن:

١. ماضی. ٢. موضاریع. ٣. ئەمر.

### فیعلی ماضی (کاری ڕابردوو)

فیعلێکە دەلالەت دەکاتە سەر کاتی پێش کاتی خەبەردانەکە، و مەبنیە لەسەر فەتحە، ئەگەر ضەمیری مەرفوعی موتەحەریکی پێوە نەبوو، ئەگەرنا ئەوە مەبنی دەبێت لەسەر سکون، وەك: (ضربت) یان لەسەر ضەممە ئەگەر لەگەڵ (واو) دا بوو، وەك: (ضربوا).

### فیعلی موضاریع (کاری ڕانەبردوو)

فیعلێکە لە ئیسم دەچێت و یەکێك لە حەرفەکانی (اتین) بە لەفزی لکاوە بەسەرەتایەوە، ئەم لێکچوونەش لەمانەدا دەبێت:

---

١ - يعني : التكلم والإخبار .

٢ - المقصود اسم الفاعل .

١-اِتِّفَاقِ حَرَكَاتِهِما وَسَكَنَاتِهِما نَحْوُ (يَضْـرِبُ ، وَيَسْـتَخْرِجُ) ، فَهُـوَ نَحْـوَ(ضـارِب ، ومُسْتخْرِج).

٢-دُخُولِ لامِ التَّأكِيدِ فِي أوَّلِهِما ، تَقُـولُ: (إنَّ زَيْـداً لَيَقُـومُ) كَمـا تَقُـولُ: (إنَّ زَيْـداً لَقائِمٌ).

٣-تَساوِيهِما فِي عَدَدِ الحُرُوفِ.

كَما يُشْبِهُ الاسْمَ مَعْنىً فِي أنَّهُ مُشْتَرَكٌ بَيْنَ الحَـالِ والاسْـتِقْبالِ ، كَاسْـمِ الفاعِـلِ ولِـذلِك سَمَّوْهُ مُضارِعاً أيْ مُشابِهاً لاسْمِ الفاعِلِ.

(والسِّينُ ، وسَوْفَ) يُخَصِّصانِ المُضارِعَ بِالاسْتِقْبالِ ، نِحْوُ (سَيَضْرِبُ) والـلاَّمُ المَفْتُوحَـةُ تُخَصِّصُهُ بِالحالِ ، نَحْوُ (لَيَضْرِبُ).

وحُرُوفُ المُضارَعَةِ مَضْمُومَةٌ فِي الرُّباعِيِّ ، أيْ فِيما كَانَ ماضِيهِ عَلـى أرْبَعَـةِ أحْـرُفٍ ، نَحْوُ (يُدَحْرِجُ) وَمَفْتُوحَةٌ فِيما عَداهُ ، نَحْوُ (يَضْرِبُ ، ويَسْتَخْرِجُ).

---

١. وەك یەك بوونی حەرەكات و سەكەناتیان، وەك:(یضرب، یستخرج)، كە وەك: (ضارب، مستخرج)ن.

٢. لامی تأكید دەچێتە سەر سەرەتاكەیان، دەڵێیت: (إن زیدا لیقوم) هەروەك دەڵێیت: (إن زیدا لقائم).

٣. یەكسانبوونیان لە ژمارەی پیتەكانیاندا.

دیسانەوە لە مانایشدا لە ئیسم دەچێت، لەوەدا كە موشتەرەكە لە نێوان ئێستاو داهاتوودا، هەروەك ئیسمی فاعیل، هەر لەبەر ئەوەشە ناویان ناوەتە موضاریع واتە: لێكچوو، مەبەستیش ئەوەیە كە لە ئیسمی فاعیل دەچێت.

(سین) و (سوف) فیعلی موضاریع تایبەت دەكەن بە داهاتووەوە، وەك: (سیضرب)، و لامی فەتحەداریش (لَ) تایبەتی دەكات بە ئێستاوە، وەك: (لیضرب).

حەرفەكانی موزارەعە بە فیعلی چوارحەرفیەوە مەضمومن، واتە:لەو فیعلانەدا كەماضیەكەیان چوار حەرفە، وەك: (یُدحرج)، لەغەیری ئەوەشدا مەفتوحن، وەك: (یَضرب، یَستخرج).

وإعْرابُهُ – مَعَ أَنَّ الأصْلَ فِي الفِعْلِ البناءُ –لِمُشابَهَتِهِ الاسْمَ ، والأصْلُ فِي الاسْمِ الإعْرابُ ، وذلِك إذا لَمْ تتَّصِلْ بِهِ نُونُ التَّأكيدِ ، ولا نُونُ جَمْعِ المُؤَنَّثِ.

وأنْواعُ إعْرابِ المُضارِعِ ثلاثةٌ: رَفْعٌ، ونَصْبٌ، وجزْمٌ، نَحْوُ(يَنْصُرُ و أنْ يِنصُرَ، ولَمْ يِنصُرْ).

## أصْنافُ إعْرابِ الفِعْلِ المُضارِعِ

إعْرابُ الفِعْلِ المُضارِعِ عَلى أرْبَعَةِ أوجُهٍ:

الأوَّلُ: أنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِالضَّمَّةِ ، والنَّصْبُ بِالفَتْحَةِ ، والجَزْمُ بِالسُّكُونِ ، ويَخْتَصُّ بِالمُفْرَدِ الصَّحيحِ [1] غَيرِ المُخَاطَبَةِ ، نَحْوُ (يَكْتُبُ وأنْ يَكْتُبَ ، ولَمْ يكْتُبْ).

الثَّانِي: أنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِثُبُوتِ النُّونِ ، والنَّصْبُ والجَزْمُ بِحَذْفِها ، ويَخْتَصُّ بِالتَّثْنِيَةِ ، والجَمْعِ المُذَكَّرِ ، والمُفْرَدَةِ المُخاطَبَةِ صَحِيحاً أوْ غَيْرَهُ

---

هۆی ئەوەشی کە موعرەبە – لەگەڵ ئەوەشدا کە لە بنچینەدا فیعل دەبێت مەبنی بێت – ئەوەیە کە لە ئیسم دەچێت، کە دیارە ئیسم لە بنچینەدا موعرەبە، ئەوەش لەکاتێکدایە کە نونی تەئکید، یان نونی جەمعی نیسوەی پێوە نەنووسابێت.

جۆرەکانی ئیعرابی فیعلی موضاریع سیانە: ڕەفع و نەصب و جەزم، وەك: (ینصرُ، أن ینصرَ، لم ینصرْ).

## شێوازەکانی ئیعرابی فیعلی موضاریع

ئیعرابی فیعلی موضاریع دەکرێتە چوار جۆرەوە:

یەکەم: ڕەفع بە ضەممە بێت، و نەصب بە فەتحە بێت، و جەزم بەسکون بێت، ئەمەش تایبەتە بەموفرەدی صەحیحەوە بەمەرجێك بۆ موئەنەسی موخاتەب نەبێت، وەك: (یکتب، أن یکتب، لم یکتب).

دووەم: ڕەفع بە سوبوتی نون بێت، نەصب و جەزم بەحەزفی نون بێت، ئەمەش تایبەتە بە موسەنا، و جەمعی موزەکەرەوە، و موفرەدی موئەنەسی موخاتەبەوە، ئیتر صەحیح بێت یان نا

---

١ - المرادُ بالمفرَدِ من صيَغِ المضارعِ : الصيَغُ التي لمْ يتصلْ بها ضميرُ رَفْعٍ بارزٌ نَحوُ : يكتبُ ، تكتبُ ، أكتبُ ، نكتبُ . والصحيح يعني غير المعتل اللام .

تَقُولُ: (هُما يَفعلانِ ، وهُمْ يَفعَلُونَ ، وأَنْتِ تَفعَلِينَ ، ولَنْ تَفْعَلا ، ولَنْ تَفْعَلُوا ، ولَنْ تَفعَلِي ، ولَمْ تَفْعَلا ، ولَمْ تَفعَلُوا ، ولَمْ تَفعَلِي).

اَلثَّالِثُ: أَنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِتَقْدِيرِ الضَّمَّةِ ، والنَّصْبُ بالفَتْحَةِ ، والجَزْمُ بِحَذفِ لامِ الفِعلِ ، ويَختَصُّ بِالنَّاقِص اليائِيِّ والواوِيِّ ، غَيْرِ التَّثْنِيَةِ والجَمْعِ والمُخاطَبَةِ ، تَقُولُ: (هُوَ يَرْمِي ويَغْزُو، ولَنْ يَرْمِيَ ، ولَنْ يَغْزُوَ ، ولَمْ يَرْمِ ، ولَمْ يَغْزُ).

الرّابِعُ: أَنْ يَكُونَ الرَّفْعُ بِتَقْدِيرِ الضَّمَّةِ ، والنَّصْبُ بِتَقْدِيرِ الفَتْحَةِ ، والجَزْمُ بِحَذفِ اللاّمِ ، ويَختَصُّ بِالنّاقِصِ الأَلِفِيِّ غَيْرِ التَّثْنِيَةِ والجَمْعِ والمُخاطَبَةِ ، نَحْوُ (هُوَ يَسْعى ، ولَنْ يَسْعى ، ولَمْ يَسْعَ).

### اَلخُلاصَةُ:

اَلْفِعْلُ: كَلِمَةٌ تَدُلُّ عَلى مَعْنًى يَقْتَرِنُ بِأَحَدِ الأَزْمِنَةِ الثَّلاثَةِ ، ويَنْقَسِمُ إِلى الماضِي ، والمُضارِعِ ، والأَمْرِ.

---

دەڵێیت: (هما يفعلان، هم يفعلون، أنت تفعلين، لن يفعلا، لن تفعلوا، لن تفعلي، لم تفعلا، لم تفعلوا، لم تفعلي).

سێیەم: ڕەفعی بە تەقدیری ضەممە بێت، نەصبی بە فەتحە بێت، و جەزمی بە حەزفی لامی فیعل، ئەمەش تایبەتە بە ناقیصی یایی و واوی، کە موسەنا و جەمع نەبێت و بۆ موئەنەسی موخاتەب نەبێت، دەڵێیت: (هو يرمي و يغزو، لن يرميَ، لن يغزوَ، لم يرمِ، لم يغزُ).

چوارەم: ڕەفعی بە تەقدیری ضەممە بێت، و نەصبی بە تەقدیری فەتحە بێت، و جەزمی بە حەزفی لامەکەی بێت، ئەمەش تایبەتە بە ناقیصێکەوە کە حەرفە عیلەکەی ئەلف بێت، و موسەنا و جەمع نەبێت و بۆ موئەنەسی موخاتەب نەبێت، وەك: (هو يسعى، لن يسعى، لم يسع).

### پوختە

فیعل: ووشەیەکە دەلالەت دەکاتە سەر مانایەك کە پەیوەستە بە یەکێك لە سێ کاتەکەوە، و دابەش دەبێت بۆ: ماضی، و موضاریع، و ئەمر.

الفِعْلُ الماضِي: فِعْلٌ يَدُلُّ عَلى زَمانٍ مَضى وانقَضى.

الفِعْلُ المُضارِعُ: فِعْلٌ يَدُلُّ عَلى زَمانِ الحالِ ، والاستِقْبالِ ، ويُشْبِهُ الاسْمَ بأحَدِ حُرُوفِ المُضارَعَةِ (أَتَيْنَ) ولِذلِك سُمِّيَ مُضارِعاً ، ويَخْتَصُّ الفِعْلُ المُضارِعُ بالاستِقْبالِ إذا دَخَلَتْ عَلَيْهِ (السِّينُ) أوْ (سَوْفَ) ، ويَخْتَصُّ بالحالِ إذا دَخَلَتْ عَلَيْهِ (اللاَّمُ المَفتوحَةُ).

ويُعْرَبُ الفِعْلُ المُضارِعُ لِمُشابَهَتِهِ الاسْمَ.

أسئلة:

١-عَرِّفِ الفِعْلَ الماضِيَ.

٢-مَتى يُبْنى الفِعْلُ الماضِي عَلى السُّكُونِ؟ ومَتَى عَلى الضَمِّ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-مَا هُوَ الفِعْلُ المُضارِعُ؟ هَلْ يُعْرَبُ الفِعْلُ المُضارِعُ أمْ لا؟ ولِماذا؟

٤-ما هِيَ إعْرابِ الفِعْلِ المُضارِعِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

---

فیعلی ماضی: فیعلێکە دەلالەت دەکاتە سەر کاتێك کە تێپەڕیوە و بەسەرچووە.

فیعلی موضاریع: فیعلێکە دەلالەت دەکاتە سەر کاتی ئێستا، یان داهاتوو، و بەهۆی یەکێك لە حەرفەکانی (موضارەعەوە)کە بریتین لە (اتین) لە ئیسم دەچێت، و هەر لەبەر ئەوەشە پێی دەوترێت موضاریع، فیعلی موضاریع تایبەت دەبێت بە داهاتووەوە ئەگەر (س) یان (سوف) ڕۆیشتە سەری، و تایبەتیش دەبێت بە ئێستاوە ئەگەر (لام)ی مەفتوحی چووە سەر.

فیعلی موضاریع لەبەر ئەوەی کە لە ئیسم دەچێت موعرەبە.

پرسیار:

١. پێناسەی فیعلی ماضی بکە.

٢. چ کاتێك فیعلی ماضی مەبنی دەبێت لەسەر سکون؟ و کەی مەبنی دەبێت لەسەر ضەممە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. فیعلی موضاریع کامەیە؟ ئایا فیعلی موضاریع موعرەبە یان نا؟ بۆچی؟

٤. ئیعرابی فیعلی موضاریع چۆنە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥-لِماذا سُمِّيَ الفِعْلُ المُضارِعُ مُضارِعاً؟ اِشْرَح ذلِك مَعَ إيْرادِ مِثال.

٦-مَتَى يُبْنَى الفِعْلُ المُضارِعُ؟ هَاتِ أمْثِلَةً عَلى ذلِك.

٧-مَا هِيَ عَلامَاتُ إعْرابِ الفِعْلِ المُضَارِعِ المُفْرَدِ الصَّحِيحِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٨-أُذكُرْ صِيَغْ الأفْعَالِ الَّتِي تُرْفَعُ بِثُبُوتِ النُّونِ ، وتُنْصَبُ وتُجْزَمُ بِحَذْفِها. اشْرَحْ ذلِك مَعَ إيرادِ الأمْثِلَةِ.

٩-كَيْفَ يُعْرَبُ الفِعْلُ الناقِصُ الواوِيُّ واليَائِيُّ؟

١٠-أُذكُرْ عَلامَاتِ إعْرابِ الفِعْلِ النَاقِصِ المَخْتُومِ بِالألِفِ.

---

٥. بۆ چی بە فیعلی موضاریع دەگوترێت موضاریع؟ ئەمە ڕوون بکەرەوە لەگەڵ هێنانەوەی نموونەدا.

٦. چ کاتێك فیعلی موضاریع مەبنی دەبێت؟ چەند نموونەیەك بێنەوە.

٧. نیشانەکانی ئیعرابی فیعلی موضاریعی موفرەدی صەحیح کامانەن؟ بە نموونە ڕوون بکەوە.

٨. صیغەکانی ئەو فیعلانە بڵێ کە ڕەفعیان بە سوبوتی نونە، و نەصب و جەزمیان بە حەزفی نونە، ئەمە ڕوون بکەوە بەنموونەوە.

٩. فیعلی ناقیصی واوی و یائی چۆن ئیعراب دەکرێن؟

١٠. نیشانەکانی ئیعرابی فیعلی ناقیصی کۆتایی هاتوو بە ئەلف بڵێ؟

## ڕاهێنان:

أ-فیعل و جۆرەکەی و نیشانە ئیعرابیەکەی لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیاری بکە:

١-الأوْلادُ يَلعَبُونَ فِي السّاحَةِ.

٢-زَيْنَبُ لَمْ تَتْرُكْ كُتُبَهَا عَلى المِنْضَدَةِ.

٣-الطَّالِبُ يَسْعى كَيْ يَنْجَحَ فِي الامْتِحان.

٤-الإسْلامُ يَعْلُو ولا يُعْلَى عَلَيْهِ [1].

---

١ - حديث صحيح وقد مر.

٥- قال تعالى: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾(الإسراء/٩).

٦-البِنْتانِ تَلْعَبانِ فِي ساحَةِ المَدْرَسَةِ.

ب-فیعلێکی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-............ الطَّالِبُ إلى المَدْرَسَةِ.

٢-الطُّلابُ............ فِي ساحَةِ المَدْرَسَةِ.

٣-لا............ فِي الصَّفِّ.

٤-الطَّالِباتُ............ فِي البَيْتِ.

٥-الطَّالِبُ المُجِدُّ لَنْ............ أَثناءَ الدَّرْسِ.

٦-المُعَلِّمُ............ الطُّلابَ الآدابَ الإسْلامِيَّةَ.

٧-الكَسُولُ لا.............

ج-ئیعرابی ئەوانە بکە کە هێڵیان بە ژێردا هاتووە:

١-مَنْ أَصْلَحَ سَرِيرَتَهُ أَصْلَحَ اللّهُ عَلانِيَتَهُ.

٢-مَنْ تَرَكَ المُشْتَبَهاتِ نَجا مِنَ المُحَرَّماتِ.

٣-مَنْ عَظَّمَ صِغارَ المَصائبِ ابْتَلاهُ اللّهُ بِكِبارِها.

٤-الدُّنْيا خُلِقَتْ لِغَيْرِها.

٥-الوَلَدُ المُهَذَّبُ يَحْتَرِمُ الكَبِيرَ ويَرْحَمُ الصَّغِيرَ.

## الدرس السادس والثلاثون

### المُضارِعُ المَرْفُوعُ

العامِلُ فِي المُضارِعِ المَرْفُوعِ مَعْنَوِيٌّ ، وهُوَ تَجْرِيدُهُ عَنِ النّاصِبِ والجازِمِ ، نَحْوُ (هُوَ يُسافِرُ، وهُوَ يَغْزُو ، وهُوَ يَرْمِي ، وهُوَ يَسْعَى).

### المُضارِعُ المَنْصُوبُ

والعامِلُ فِي المضارِعِ المَنْصُوبِ أَحَدُ الأَحْرُفِ الخَمْسَةِ: أَنْ ، لَنْ ، كَيْ ، إذنْ ، نَحْوُ (أُرِيدُ أَنْ يُحْسِنَ أَخِي إِلَيَّ ، وأَنا لَنْ أَضْرِبَكَ ، وأَسْلَمْتُ كَيْ أَدْخُلَ الجَنَّةَ ، وإِذنْ يَغْفِرَ اللّهُ لَكَ).

وَبِتَقْدِيرِ (أَنْ) فِي سَبْعَةَ عَشَرَ مَوْضِعاً مُلَخَّصَةً فِي سَبْعَةِ أَقْسامٍ:

١-بَعْدَ حَتَّى مِثْلُ: أَسْلَمْتُ حَتَّى أَدْخُلَ الْجَنَّةَ.

٢-بَعْدَ (لامِ) كَيْ نَحْوُ: قَامَ زَيْدٌ لِيُصَلِّيَ.

٣-بَعْدَ (لامِ) الجُحُودِ ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ﴾(الأنفال / ٣٣).

---

## وانەی سی و شەش

### موضاریعی مەرفوع

عاميلی موضاريعی مەرفوع مەعنەويە، كە بريتيە لە خاڵی بوونی لە ئەداتی نەصب و جەزم، وەك: (هو يسافر، هو يغزو، هو يرمي، هو يسعى).

### موضاریعی مەنصوب

عاميل لە موضاريعی مەنصوبدا بريتيە لە يەكێك لەم پێنج حەرفە: أن، لن، كي، إذن، وەك: (اريد ان يُحسنَ اخي إليّ، انا لن اضربَك، اسلمت كي ادخلَ الجنة، إذن يغفرَ الله لك)، هەروەها مەنصوب دەبێت بە تەقديركردنی (ان) لە حەڤدە شوێندا كە كورت دەكرێنەوە لە حەوت بەشدا:

١. پاش (حتى)، وەك: أسلمت حتى أدخلَ الجنة.

٢. پاش (لام)ی (كي) وەك: قام زيد ليصليَ.

٣. پاش (لام)ی جوحود، وەك: فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ ماكان الله ليعذبهم﴾

٤-بَعْدَ الفَاءِ الوَاقِعَةِ فِي جَوابَ الأمْرِ [١] نَحْـوُ (أَسْـلِمْ فَتَسْـلَمَ). والنَّهْـيِ نَحْـوُ (لا تَعْـصِ فَتُعَذَّبَ) والاسْتِفْهَامِ ، نَحْوُ (هَلْ تَعْلَمُ فَتَنْجُوَ؟) والنَفْي نَحْوُ (مَا تَزُورُنَا فَنُكْرِمَكَ). والتَّمَنِّي نَحْوُ (لَيْتَ لِي مَالاً فَأُنْفِقَهُ). والعَرْضِ [٢] نَحْوُ (ألاَ تَنْزِلُ فَتُصِيبَ خَيْراً).

٥-بَعْدَ الوَاوِ الوَاقِعَةِ كَـذلِك فِـي جَـوَابِ المُتَقَدِّمَـةِ فِـي القِسْـمِ الرَّابِـعِ ، نَحْـوُ (أَسْـلِمْ وتَسْلَمَ...) إلى آخِرِ الأمْثِلَةِ [٣]

٦-بَعْدَ (أوْ) بِمَعْنَى (إلى) ، نَحْوُ (جِئْتُكَ أوْ تُعْطِيَنِي حَقِّي).

٧-بَعْدَ وَاوِ العَطْفِ إذا كَانَ المَعْطُوفُ اِسْماً صَرِيحاً ، نَحْوُ (أَعْجَبَنِي قِيَامُكَ وتَخْرُجَ).

ويَجُوْزُ إظْهَارُ (أنْ) مَعَ (لامِ) كَيْ ، نَحْوُ (أَسْلَمْتُ لأنْ أَدْخُلَ الجَنَّـةَ) ، ومَـعَ وَاوِ العَطْـفِ (أَعْجَبَنِي قِيَامُكَ وأَنْ تَخْرُجَ).

---

٤. پاش ئەو (فا)یەی کە دێت لە وەڵامی ئەمر، وەك: (اسلم فتسلمَ)، و نەهی، وەك: (لاتعصِ فتعذبَ)، و ئیستیفهام، وەك: (هل تعلمَ فتنجوَ؟)، و نەفی، وەك: (ما تزورنا فنكرمك)، و تەمەننی، وەك: (ليت لي مالا فأنفقه)، و عەرضدا -واته: پێشنیار-، وەك: (ألا تنزل بنا فتصيبَ خيرا).

٥. لەپاش ئەو واوەی کە لە وەڵامی ئەو شتانەدا دێت کە لەخاڵی چوارەمدا باسمانکرد، وەك: (اسلم وتسلمَ...) تا کۆتایی نموونەکان.

٦. پاش(او)ێك کە بە مانای (الى) بێت، وەك: (جئتك او تعطيَني حقي).

٧. پاش واوی عەتف ئەگەر مەعتوفەکە ئیسمێکی صەریح بێت، وەك: (اعجبني قيامك وتخرجَ).
دەرخستنی(ان) دروستە لەگەڵ لامی (كي)دا، وەك: (اسلمت لأن ادخلَ الجنة)، و لەگەڵ واوی عەتفدا، وەك: (اعجبني قيامك وان تخرجَ).

---

١ - وتسمى فاءَ السببية .

٢ - هو الطلب بلين و احرفه هي : ألا وأما ولو .

٣ هذه الواو هي واو المعية .

وَيَجِبُ إظْهَارُها مَعَ لا النَّافِيَةِ ، و (لامِ) كَي إذا اجْتَمَعَتا ، نَحْوُ (لِئَلاَّ يَعْلَمَ).

واعْلَمْ أَنَّ (أَنْ) الواقِعَةَ بَعْد العِلْمِ لَيْسَتْ هِيَ النَّاصِبَةَ لِلْمُضَارِعِ ، بَلْ إنَّما هِيَ المُخَفَّفَةُ مِنَ المُثَقَّلَةِ ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنكُمْ مَرْضَى﴾(المزمل / ٢٠) ، وأَمّا الواقِعَةُ بَعْدَ الظَّنِّ فَيَجُوزُ فِيها الوَجْهانِ ، أَنْ تَنْصِبَ بِها ، وأَنْ تَجْعَلَها كَالوَاقِعَةِ بَعْدَ العِلْمِ نَحْوُ (أَظُنُّ أَنْ سَيَنْصُرُهُ).

## المُضارِعُ المَجْزُومُ

والعَامِلُ فِي المُضَارِعِ المَجْزُومِ أَحَدُ الحُرُوفِ التَّالِيَةِ:

لَمْ ، ولَمّا ، و لامُ الأمْرِ ، و (لا) النَّاهِيَة ، وكَلِمُ المُجازاةِ ، وَهِيَ: إنْ، ومَهْما ، وإذْما، وأَيْنَ ، وحَيْثُما ، ومَنْ ، وأيُّ ، وأنَّى ، وإنْ المُقَدَّرَةُ ، نَحْوُ (لَمْ يُسَافِرْ ، وَلَمّا يَعْصِ ، ولِيُنْفِقْ ، ولا تَضْرِبْ ، وإنْ تَحْتَرِمْ احتَرِمْ... إلى آخِرِها).

---

هەروەها پێویستە دەربخرێت ئەگەر لەگەڵ لای نافیە و لامی (كي)دا بوو ئەگەر پێكەوە كۆ بوونەوە، وەك: (لئلا يعلم).

بزانە كە ئەو (ان)ـەی كە بە دوای صیغەی (علم)دا دێت مەنصوبكەری فیعلی موضاریع نیە، بەڵكو ئەوە (ان)ی موخەففەف لە موسەقەلە، وەك: فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ علم ان سيكون منكم مرضى﴾، بەڵام ئەوەی كە بە دوای (ظن)دا دێت ئەوە هەردوو ڕووەكەی تێدا دروستە، واتە ئەوەی كە ناصیبە بێت، یان وەك ئەوەی لێ بكەیت كە بەشوێن (علم)دا دێت، وەك: (اظن ان سينصره).

## موضاریعی مەجزوم

عامیلی موضاریعی مەجزوم یەكێكە لەم حەرفانە:

(لم، لما، لام ی ئەمر، لا ی ناهیە، و وشەكانی جەزا)، كە بریتین لە: (ان، مهما، إذما، اين، حيثما، من، ايّ، انّى، (ان)ی تەقدیركراو)، وەك: (لم يسافر، لما يعص، لينفق، لا تضرب، ان تحترم احترم،... تا كۆتایی).

وَاعْلَمْ أنْ (لَمْ) تَقْلِبُ المضارِعَ ماضِياً و (لَمّا) كَذلِك إلاّ أنَّ فِيها تَوَقُّعاً بَعْدَهُ وَدَواماً قَبْلَهُ. ويَجُوزُ حَذْفُ الفِعْلِ بَعدَ (لَمّا)، تَقولُ: (نَدِمَ زَيْدٌ ولَمّا) ، أيْ: لَمَّا يَنفَعْهُ النَّدَمُ ، ولا تَقُولُ: (نَدِمَ زَيْدٌ ولَمْ).

## الخُلاصَةُ:

إعْرابُ المُضَارِعِ

يُرْفَعُ المُضَارِعُ إذا كَانَ مُجَرَّداً عَنِ النَّاصِبِ والجَازِمِ.

ويُنْصَبُ إذا دَخَلَ عَلَيْهِ أحَدُ النَّواصِبِ الخَمْسَةِ، وهِيَ:(أنْ، لَنْ، كَيْ ، إذَنْ، وأن المُقَدَّرَةَ).

وأمّا (أنْ) الواقِعةُ بَعْدَ العِلْمِ فَلَيْسَتْ بناصِبَةٍ ، وإنّما هِيَ مُخَفَّفَةٌ مِنَ المُثَقَّلَةِ. والواقِعَةُ بَعْدَ الظَّنِّ يَجُوزُ أنْ تجعَلَها ناصِبَةً كَما يَجُوزُ أنْ تَجْعَلَها كَالواقِعَةِ بَعْدَ العِلْمِ.

---

بزانە کە (لم) موضاریع دەکاتە ماضی نەفیکراو[1]، و (لمّا)ش بەهەمان شێوە بەڵام ئەوە هەیە کە مانای چاوەڕوانی پاش و بەردەوامی پێشەوەی تێدایە.

دروستیشە فیعل لەدوای (لمّا)وە حەزف بکرێت، دەڵێیت: (ندم زید ولمّا)، واتە: هێشتا پەشیمانی سوودی بۆی نەبووە، بەڵام ناڵێیت: (ندم زید ولم).

## پوختە

ئیعرابی موضاریع:

فیعلی موضاریع ئەگەر خاڵی بوو لە ناصیبە و جازیمە ئەوە مەرفوع دەبێت.

مەنصوبیش دەبێت ئەگەر یەکێك لە پێنج ناصیبەکەی چووە سەر، کە بریتین لە: (ان، لن، کي، إذن، (ان)ی تەقدیرکراو).

بەڵام ئەو (ان)ـەی کە لەدوای (علم)ەوە دێت ناصیبە نیە، بەڵکو موخەففەف لە موسەقەلە، ئەوەشی کە بەدوای (ظن)دا دێت دروستە بیکەیتە ناصیبە، هەروەك دروستیشە وەك ئەوە بێت کە بەدوای (علم)ەوەیە.

---

[1] لە مانادا.

ويُجزَمُ الفِعْلُ المُضارِعُ إذا دَخَلَ عَلَيْهِ أحَدُ الجَوازِمِ ، وهِيَ: (لَمْ ، لَمّا ، لامُ الأمْرِ ، ولا النَّهي) أوْ إحْدَى كَلِمَاتِ المُجازاةِ وَهِيَ: (إنْ ، مَهْما ، إذما ، أيْنَ ، حَيْثُما ، مَنْ ايُّ ، أنّى ، وإنْ المُقَدَّرَةُ).

والفَرْقُ بَيْنَ (لَمْ) و (لَمّا) أنَّ الفِعْلَ يُتَوَقَّعُ وُقُوعُهُ بَعْدَ الثّاني دُونَ الأوَّلِ.

أسْئِلَةٌ:

١-مَا هُوَ العامِلُ فِي رَفْعِ الفِعْلِ المُضارِعِ؟

٢-عَدِّدْ عَوامِلَ نَصْبِ المُضارِعِ مَعَ إيرادِ أمْثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٣-أُذكرْ خمسةَ مواضعَ تَقَدَّرُ (أنْ) في نصب المضارع مع أمْثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٤-مَتَى يَجِبُ إظْهارُ (أنْ) مَعَ المُضارِعِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٥-هَلْ إنَّ (أنْ) الوَاقِعَةَ بَعْدَ العِلْمِ ناصِبَةٌ لِلمُضارِعِ أمْ لا؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٦-مَا حُكْمُ (أنْ) الواقِعةِ بَعْدَ الظَّنِّ؟

---

هەروەها فیعلی موضاریع مەجزوم دەبێت ئەگەر یەکێك لە جازیمەکانی چووە سەر، کە بریتین لە: (لم، لما، (لام)ی ئەمر، (لا)ی ناهیە) یان یەکێك لە ووشەکانی جەزا کە بریتین لە: (إن، مهما، إذما، اين، حيثما، من، ايّ، انی، (إن)ی تەقدیرکراو).

جیاوازی نێوان (لم) و (لما)یش ئەوەیە کە فیعلی دوای دووەمیان چاوەڕێی ڕوودانی دەکرێت بەپێچەوانەی یەکەمیانەوە.

پرسیار:

١. عامیلی مەرفوع بوونی فیعلی موضاریع چییە؟

٢. عامیلە مەنصوبکەرەکانی فیعلی موضاریع بژمێرە لەگەڵ هێنانەوەی نموونەی بەسوود.

٣.پێنج شووێن بڵێ کە تیایاندا بۆ مەنصوب بوونی فیعلی موضاریع (ان) تەقدیر دەکرێ.

٤. ج کاتێك پێویستە (ان) دەربخرێت لەگەڵ موضاریعدا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. ئایا ئەو (ان)ـەی کە بەدوای (علم)دا دێت ناصیبەی موضاریعە یان نا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. حوکمی ئەو (ان)ـە چییە کە لە پاش (ظن)ـەوە دێت؟

٧-عَدِّدْ عَوامِلَ الجَزْمِ ، ومَثِّلْ لَها.
٨-عدد كَلِماتِ الُمجازاتِ معَ أَمْثِلَةٍ مُفِيدةٍ.
٩-مَاذا تَعْمَلُ (لَمْ ، ولَمَّا) فِي مَعْنَى الُمضارِعِ؟ وما الفَرْقُ بَيْنَهُما؟ مَثِّلْ لِذلِك.
١٠-هَلْ يَجُوزُ حَذْفُ الفِعْلِ بَعْدَ (لَمّا)؟ أُذكُرْ ذلِك مَعَ مِثالٍ مُفِيدٍ.

---

٧. عامیلەکانی جەزم بڵێ، و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٨. ووشەکانی جەزا بژمێرە، و نموونەی بەسوودیان بۆ بێنەوە.

٩. (لم) و(لمّا) چ عەمەلێك دەکەن لە مانای موضاریعدا؟ جیاوازی نێوانیشیان چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٠. ئایا دروستە ئەو فیعلەی کە بە دوای (لمّا)دا دێت حەزف بکرێت؟ ئەمە بە نموونەیەکی بەسوودەوە باس بکە.

## ڕاهێنان:

أ. موضاریعی مەنصوب و مەجزوم و عامیلی نەصب و جەزم لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١- إنْ تَدْرُسْ تَنْجَحْ.
٢- أُحِبُّ أَنْ تَتَعَلَّمَ النَّحْوَ.
٣- لَمْ يَدْرُسِ الطَّالِبُ.
٤- قَرَأَ مَحْمُدٌ الدَّرْسَ ولَمَّا يَفْهَمْ.
٥- جِئْتُ إلى المَدْرَسَةِ كَيْ أَتَعَلَّمْ.
٦- لا تَظْلِمُ فَتُظْلَمَ.
٧- لَيْتَ لِي مالاً فَأُنفِقَهُ فِي سَبِيلِ اللّهِ.

ب-فیعلێکی موضاریعی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-ألا............ عِنْدَنا فَتُصِيبَ خَيْراً.

٢-............ أوْ تُعَلِّمَني.

٣-هَلْ............ فَتَنجَحَ.

٤-أوْدَعْتُ مالِي كَيْ............ بالِي.

٥-سَرَّنِي نَجاحُكَ وأن..........

٦-ما تُحْسِنُ أخلاقَكَ............

٧-جاءِ سَعِيدٌ لِـ............

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-إنْ تَقْرَأ القُرآنَ تَتَهَذَّبْ.

٢- قال تعالى:﴿وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾(البقرة/٢١٢).

٣- قال تعالى:﴿وَلاَ يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلاَّ بِأَهْلِهِ﴾(فاطر / ٤٣)

٤- قال تعالى:﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ﴾(النحل / ٩٠)

٥-الخِلافُ يَهْدِمُ الرَّأيَ.

## الدرس السابع والثلاثون
## الفِعْلُ المُضارِعُ ، وكلِمَةُ المُجازاةِ

كَلِمَةُ المُجازاةِ – حَرْفاً كَانَتْ أو اسْماً – تَدْخُلُ عَلى جُمْلَتَيْنِ لِتَدُلَّ عَلى أنَّ الأولى سَبَبَ للثّانِيَةِ ، وتُسمّى الأولى شَرْطاً ، والثّانِيَةُ جَزاءً.

ثُمَّ إنْ كَانَ الشَّرْطُ والجَزاءُ مُضارِعَيْنِ يَجِبُ الجَزْمُ فِيهِما ، نَحْوُ (إنْ تُكْرِمْنِي أُكْرِمْكَ) ، وإنْ كانا ماضِيَيْنِ لَمْ يَعْمَلْ فِيهِما لَفْظاً ، نَحْوُ(إنْ ضَرَبْتَ ضَرَبْتُ) ، وإنْ كَانَ الجَزاءُ وَحْدَهُ ماضِياً ، يَجِبُ الجَزْمُ فِي الشَّرْطِ ، نَحْوُ (إنْ تَضْرِبْني ضَرَبْتُكَ) ، وإنْ كَانَ الشَّرْطُ وَحْدَهُ ماضِياً ، جازَ فِي الجَزاءِ الوَجهان، نَحْوُ (إنْ جِئْتَنِي أُكرِمْكَ، وإنْ أكرَمْتَني أكْرِمُكَ).

وَاعْلَمْ أنَّهُ إذا كانَ الجَزاءُ ماضِياً بَغَيْرِ (قَدْ) لَمْ يَجُزِ الفَاءُ فِيهِ نَحْوُ (إنْ أَكْرَمْتَنِي أَكْرَمْتُكَ) ، وقَوْلِهِ تَعَالى: (وَمَنْ دخَلَهُ كَانَ آمِناً)(آل عمران / ٩٧)

---

## وانەی سی و حەوت
### فیعلی موضاریع و ووشەی جەزا ( ئامرازی لێکدەری مەرج )

ووشەی جەزا –حەرف بێت یان ئیسم– دەچێتە سەر دوو ڕستە بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەوەی کە یەکەمیان هۆکاری دووەمیانە، و بە یەکەم دەوترێت شەرت و بەدووەم دەوترێت جەزا.

پاشان ئەگەر شەرت و جەزاکە موضاریع بوون ئەوە پێویستە هەردووکیان مەجزوم بکرێن، وەك: (إن تكرمني اكرمك)، ئەگەریش ماضی بوون ئەوە بە لەفزی کاریان تێدا ناکات، وەك: (إن ضربت ضربت)، ئەگەریش تەنها جەزاکە ماضی بوو، ئەوە جەزم پێویستە لە شەرتەکەدا، وەك: (إن تضربني ضربتك)، ئەگەر تەنها شەرتەکە ماضی بوو، ئەوە لە جەزاکەدا هەردوو ڕووەکە دروستن، وەك: (إن جئتني اكرمك، إن اكرمتني اكرمُك).

بزانە ئەگەر جەزاکە ماضی بوو و (قد)ی بەسەرەوە نەبوو ئەوە دروست نیە (فاء) بچێتە سەری، وەك: (إن اكرمتني اكرمتك)، و فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ ومن دخله كان آمنا﴾

، وإنْ كَانَ مُضارِعاً مُثْبَتاً أَوْ مَنفِيّاً بِـ (لا) جَازَ فِيهِ الوَجْهان ، نَحْوُ (إنْ تَحْتَرِمْني أحْتَرِمْكَ أوْ فَأَحْتَرِمُكَ ، وإنْ تَشْتُمْني لا أضْرِبْكَ أوْ فَلا أضْرِبُكَ).

وإنْ كَانَ مُضارِعاً مُثْبَتاً أَوْ مَنفِيّاً بِـ (لا) جَازَ فِيهِ الوَجْهان ، نَحْوُ (إنْ تَحْتَرِمْني أحْتَرِمْكَ أوْ فَأَحْتَرِمُكَ ، وإنْ تَشْتُمْني لا أضْرِبْكَ أوْ فَلا أضْرِبُكَ).

وإنْ لَمْ يَكُنِ الجَزاءُ أَحَدَ القِسْمَيْنِ المَذْكُورَيْنِ يَجِبُ فِيهِ الفاءُ ، وذلِكَ فِي أرْبَعَةِ مَواضِعَ:

الأوَّلُ:أنْ يَكُونَ الجَزاءُ مَاضِياً مَعَ (قَدْ) كَقَوْلِهِ تَعَالى:﴿إنْ يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَهُ﴾(يوسف/ ٧٧)

الثَّاني: أنْ يَكُونَ الجَزاءُ مُضارِعاً مَنْفِيّاً بَغَيْرِ (لا) نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإسْلامِ ديناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنهُ﴾(آل عمران / ٨٥).

الثَّالِثُ:أنْ يَكُونَ جُمْلَةً اسْمِيَّةً كَقَوْلِهِ تَعَالى:﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾(الأنعام/١٦٠).

---

ئەگەریش موضاریعی موسبەت یان مەنفی بوو بەهۆی (لا)وە ئەوە هەردوو ڕوومکە تێیدا دروستە، وەك: (إن تحترمني احترمك)یان(فأحترمك)، (إن تشتمني لا اضربك)یان(فلا اضربك).

خۆ ئەگەر جەزاكە یەكێك لەم دوو بەشە ناوبراوە نەبوو ئەوە پێویستە (فاء)ی پێوە بێت، ئەمەش لە چوار جێگادا دەبێت:

یەكەم: جەزاكە ماضی بێت و (قد)ی بەسەرەوە بێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ إن يسرق فقد سرق أخ له ﴾ .

دووەم: جەزاكە موضاریعێكی مەنفی بێت بەغەیری (لا)، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبل منه﴾.

سێیەم: جەزاكە ڕستەیەكی ئیسمی بێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ من جاء بالحسنة فله عشر أمثالها﴾.

الرّابعُ: أنْ يَكُونَ جُمْلَةً إنْشائيَّةً ، إمّا أمْراً كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿قُلْ إنْ كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي﴾(آل عمران / ٣١) ، وإمّا نَهْياً ، كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿فَإنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلاَ تَرْجِعُوهُنَّ إلَى الْكُفّارِ﴾(الممتحنة / ١٠)، أو اسْتِفهاماً كَقَوْلِكَ (إنْ تَرَكْتَنا فَمَنْ يرْحَمُنا) أوْ دُعاءً ، كَقَوْلِك (إنْ أكْرَمْتَنا فَيَرْحَمُكَ اللّهُ).

وَقَدْ تَقَعُ (إذا) مَعَ الجُمْلَةِ الاسْمِيَّةِ مَوضِعَ الفاءِ كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿وَإنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إذا هُمْ يَقْنَطُونَ﴾(الروم/٣٦).

وإنّما تُقَدَّرُ (إنْ) بَعْدَ الأفعالِ التّالِيَةِ:

١-الأمرُ ، نَحْوُ (تَعَلَّمْ تَنْجَحْ)

٢-النَّهيُ ، نَحْوُ (لا تَكْذِبْ يَكُنْ خَيْراً)

٣-الاسْتِفْهامُ ، نَحْوُ (هَلْ تَزُورُنا نُكْرِمْكَ)

٤-التَّمَنّي ، نَحْو (لَيْتَكَ عِنْدِي أَخْدِمْكَ)

---

چوارەم: ڕستەیەکی ئینشائی بێت، ئیتر یان ئەمر بێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني﴾، یان نەهی بێت، وەك فەموودەی خوای مەزن: ﴿ فإن علمتموهن مؤمنات فلا ترجعوهن إلى الكفار﴾، یان ئیستیفهامی بێت، وەك دەڵێیت: (ان تركتنا فمن يرحمنا)، یان دوعا بێت، وەك دەڵێیت: (إن اكرمتنا فيرحمك الله).

هەندێ جار لە ڕستەی ئیسمیدا (إذا) دەچێتە جێگەی (فاء)ەوە، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ وإن تصبهم سيئة بما قدمت أيديهم إذا هم يقنطون﴾.

تەقدیرکردنی (إن)یش لەپاش ئەم فیعلانەی خوارەوە دەبێت:

١. ئەمر، وەك: (تعلم تنجح).

٢. نەهی، وەك: (لا تكذب يكن خيرا).

٣. ئیستیفهام، وەك: (هل تزورنا نكرمك).

٤. تەمەننی، وەك: (ليتك عندي اخدمك).

٥-العَرْضُ ، نَحْوُ (ألا تَنْزِلُ بِنا تُصِبْ خَيْراً)

كُلُّ ذلِك إذا قُصِدَ أنَّ الأوَّلَ سَبَبٌ لِلثّاني كَما رَأَيْتَ فِي الأمْثِلَةِ ، فَإنَّ مَعْنى قَوْلِكَ: (تَعَلَّمْ تَنجَحْ) هُوَ: إنْ تَتَعَلَّمْ تَنجَحْ ،وكَذلِك البَواقِي ، فلِذلِك امْتَنَعَ قَوْلُكَ: (لا تَكْفُرْ تَدْخُلِ النّارَ) لامْتِناعِ السَّبَبِيَّةِ ، إذ لا يَصِحُّ أنْ يُقالَ: (إنْ لا تَكفُرْ تَدْخُلِ النّارَ).

**الخُلاصَةُ:**

كَلِمَةُ المُجازاةِ تَدْخُلُ عَلى جُمْلَتَيْنِ ، عَلى أنْ تَكُونَ الأُولى سَبَباً للثّانِيَةِ ، والجُمْلَةُ الأُولى تُسَمّى (فِعْلَ الشَّرْطِ) والثّانِيةُ (جَزاءَ الشَّرطِ).

يَجِبُ الجَزْمُ فِي المُضارِعِ شَرْطاً أوْ جَزاءً ، إلاّ إذا كانَ الشَّرْطُ وَحْدَهُ ماضِياً ، فَيَجُوزُ حِينَئِذٍ الوَجْهان.

---

٥. عەرض –واتە پێشنیار-، وەك: (الا تنزل بنا تصب خیرا).

ئەمە هەموو لەکاتێکدا دەبێت ئەگەر مەبەست ئەوە بێت کە یەکەم هۆی دووەمە، وەك لە نموونەکاندا بینیت، کە مانای ئەوەی کە دەڵێیت: (تعلم تنجح) ئەوەیە: ئەگەر فێربیی سەرکەوتوو دەبیت، ئەوانی دیش هەر بەهەمان شێوەن، هەر لەبەر ئەوەیە کە دروست نیە بڵێیت: (لا تکفر تدخلِ النار) چونکە سەبەبیەت تێیدا دروست نیە، چونکە دروست نیە بڵێیت: (إن لا تکفر تدخلِ النار)[1].

**پوختە**

ووشەی جەزا دەچێتە سەر دوو ڕستە، بۆ ئەوەی کە یەکەمیان بکاتە هۆ بۆ دووەمیان، بە ڕستەی یەکەم دەوترێت (فیعلی شەرت) و بە دووەم دەگوترێت: (جەزای شەرت).

جەزمکردنی فیعلی موضاریع پێویستە ئیتر شەرت بێت یان جەزا، کاتێك نەبێت کە شەرتەکە بەتەنها ماضی بێت، ئەو کاتە هەردوو ڕووەکە دروستە تێیدا.

---

١ ئەو کاتە ماناکەی بەم شێوەیەی لێ دێت: ئەگەر کوفر نەکەیت دەچیتە ئاگرەوە. کە دیارە مانایەکی نادروستە.

دُخُولُ الفاءِ عَلى الجَزاءِ:

لِلفاءِ مَعَ جُمْلَةِ الجَزاءِ ثلاثَةُ أَحكام:

أوَّلاً – يَجِبُ اقْتِرانُ الجَزاءُ بِالفاءِ فِي أربَعَةِ مَواضِعَ:

١–إذا كَانَ الجَزاءُ ماضِياً مَعَ (قَدْ).

٢–إذا كَانَ الجَزاءُ مُضارِعاً مَنْفِيّاً بِغَيْرِ (لا).

٣–إذا كَانَ الجَزاءُ جُملَةً اسْمِيَّةً.

٤–إذا كَانَ الجَزاءُ جُمْلَةً إنْشائِيَّةً.

ثانِياً – يَجُوزُ الوَجْهانِ إذا كَانَ المُضارِعُ مُثبَتاً ، أو كَانَ مَنْفِيّاً بِحَرْفِ (لا).

ثالِثاً– لا يَجُوزُ دُخُولُ الفاءِ إذا كَانَ الجَزاءُ ماضِياً بِغَيْرِ (قَدْ).

---

وەرگرتنی (فاء) لەلایەن جەزاکەوە:

(فاء) لەگەڵ ڕستەی جەزادا سێ حوکمی هەیە:

یەکەم: پێویستە (فاء) بلکێنرێت بە جەزاکەوە لە چوار شوێندا:

١. ئەگەر جەزاکە ماضی بوو و (قد)ی پێوە بوو.

٢. ئەگەر جەزاکە موضاریعێکی مەنفی بوو بە غەیری (لا).

٣. ئەگەر جەزاکە ڕستەیەکی ئیسمی بوو.

٤. ئەگەر جەزاکە ڕستەیەکی ئینشائیی بوو.

دووەم: هەردوو ڕووەکە دروستە ئەگەر موضاریعەکە موسبەت بوو، یان مەنفی بوو بە(لا).

سێیەم: دروست نیە (فاء)ی بچێتە سەر ئەگەر جەزاکە ماضیەك بێت و (قد)ی بەسەرەوە نەبێت.

أسْئلَةٌ:

١-ما هِيَ كَلِمَةُ الُمجَازاةِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٢-عَلامَ تَدْخُلُ كَلِمَةُ الُمجازاةِ؟ وعَلى ماذا تَدُلُّ بَعْدَ دُخُولِها؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-مَتى يَجِبُ الجَزْمُ فِي الشَّرْطِ والجَزاءِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٤-مَتى لا تَعْمَلُ كَلِمَةُ الُمجازاةِ لَفْظاً فِي الشَّرْطِ والجَزاءِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٥-مَتى يَجِبُ الجَزْمُ فِي الشَّرْطِ وَحْدَهُ؟ بَيِّنْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٦-متى يَجُوزُ الجَزْمُ فِي الشَّرْطِ والجَزاءِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٧-مَتى لا يَجُوزُ دُخُولُ الفاءِ عَلى الجَزاءِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٨-أُذْكُرْ مَتى يَجُوزُ دُخُولُ الفاءِ عَلى الجَزاءِ مَعَ إيْرادِ مِثالٍ.

٩-أُذْكُرْ مَوارِدَ وُجُوبِ دُخُولِ الفاءِ عَلى الجَزاءِ ومَثِّلْ لَها بِجُمَلٍ مُفِيدَةٍ.

---

پرسیار:

١. ووشەی جەزا کامەیە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٢. ووشەی جەزا سەر چی دەچێت؟ پاش چوونیشی دەلالەت لەسەر چیی دەکات؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. کەی جەزم پێویستە لە شەرت و جەزادا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. ووشەی جەزا کەی بە لەفزی عەمەل ناکات لە شەرت و جەزادا؟ ئەمە بە نموونەی بەسوود ڕوون بکەوە.

٥. کەی جەزم بەتەنها لە شەرتەکەدا پێویستە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٦. کەی جەزم دروستە لە شەرت و جەزادا؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٧. کەی دروست نیە (فاء) بچێتە سەر جەزا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨. بە نموونەوە باسی ئەوە بکە کە کەی دروستە (فاء) بچێتە سەر جەزا.

٩. ئەو شوێنانە بڵێ کە تیایاندا پێویستە (فاء) بچێتە سەر جەزا، بە ڕستەی بەسوود نموونەی بۆ بێنەوە.

١٠–هَلْ تَقَعُ (إذا) مَوْضِعَ الفاءِ؟ ومَتى؟ وَضِّحْهُ بِمِثالٍ مُفِيدٍ.

١١–بَعْدَ أيِّ الأفْعالِ تُقَدَّرُ (إنْ)؟ اشْرَحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ مُفيدَةٍ.

---

١٠. ئایا (إذا) دەچێتە جێگەی (فاء)ەوە؟ کەی؟ ئەمە بە نموونەی بەسوود ڕوون بکەوە.

١١. لە دوای کام جۆرە فیعلێك (إن) تەقدیر دەکرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

## ڕاهێنان:

أ-وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەرەوە:

١. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا شەرت و جەزاکە پێویستە مەجزوم بن.

٢. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا ووشەی جەزا بە لەفزی کاریان تێ ناکات.

٣. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا تەنها شەرتەکە مەجزوم بێت.

٤. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا جەزم لەشەرت و جەزادا دروست بێت.

٥. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا دروست نەبێت (فاء) بچێتە سەر جەزا.

٦. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا دروست بێت (فاء) بچێتە سەر جەزا.

٧. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا واجب بێت (فاء) بچێتە سەر جەزا.

٨. سێ ڕستە بێنەوە کە تێیاندا (إن) تەقدیرکراو بێت.

ب- لەم ڕستانەی خوارەوەدا هەردوو ڕستەی شەرت و جەزا جیا بکەرەوە و دروستی و نادروستی و واجب بوونی جەزمیان تێدا ڕوون بکەرەوە:

١–إنْ تَذْهَبْ أذهَبْ.

٢–إنْ قَرَأتَ قَرَأتُ.

٣–إنْ تَكْتُبْ لِي كَتَبْتُ لَكَ.

٤–إنْ زُرْتَنِي أحْتَرِمْكَ.

٥–إنْ جِئْتَ تَفْهَمْ ما يَجْرِي هُنَا.

ج- ئەو جێگایانەی کە واجبە یان دروستە یان نادروستە (فاء) بچێتە سەر جەزا دیاری بکە لەم ڕستانەی خوارەوەدا:

١- قال تعالى:﴿وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ ﴾(المائدة/٩٥).

٢- قال تعالى:﴿فَمَنْ يُؤْمِنْ بِرَبِّهِ فَلاَ يَخَافُ بَخْسًا وَلاَ رَهَقًا﴾(الجن/١٣).

٣- قال تعالى: ﴿فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُمْ مِنْ أَجْرٍ﴾(يونس / ٧٢)

٤- قال تعالى:﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ﴾(التوبة / ٦)

٥- قال تعالى:﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾(الأنعام/١٧).

٦- قال تعالى:﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمْ اللَّهُ﴾(آل عمران / ٣١)

٧- قال تعالى: ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَن تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ (النساء/ ٨٠)

٨- قال تعالى: ﴿وَمَا يفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ يُكْفَرُوهُ﴾(آل عمران/١١٥).

٩-إنْ رَأيتَ المُنافِقِينَ فَلا تَحتَرِمْهُمْ.

١٠-إنْ تَذهَبْ فَهَلْ يَبْقى أَحَدٌ هُنا؟

١١- إنْ جِئتَنا فَجَزَاكَ اللّهُ خَيْراً.

د-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-مَنْ لَمْ يُنْجِهِ الصَّبْرُ أَهْلَكَهُ الجَزَعُ.

٢-إذا تَمَّ العَقلُ نَقَصَ الكَلامُ.

٣- قال تعالى: ﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا﴾(إبراهيم/٣٤).

٤-إنْ صَبَرتُمْ فَالنَّصرُ لَكُمْ.

٥- قال تعالى: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا﴾(النساء/٨٦).

## الدرس الثامن والثلاثون

### فعلُ الأمْر

فِعْلُ الأمْرِ: كَلِمَةٌ تَدُلُّ عَلَى طَلَبِ الفِعْلِ مِنَ الفاعِلِ المُخاطَبِ ، نَحْوُ (اِضْرِبْ ، واغْزُ ، وارْمِ) وصيغَتُهُ أنْ يُحْذَفَ مِنَ المُضارِعِ حَرْفُ المُضارَعَةِ ثُمَّ يُنْظَرُ ، فَإن كَانَ مَا بَعْدَ حَرْفِ المُضارَعَةِ سَاكِناً ، زِيدَتْ هَمَزَةُ الوَصْلِ مَضْمُومَةً إنِ الضَمَّ ثالِثُهُ [1] نَحْوُ (اُنْصُرْ) ، مَكْسورَةً إنِ الفَتَحَ أوِ انكَسَرَ ثالِثُهُ ، نَحْوُ (اِعْلَمْ ، اِضْرِبْ ، واسْتَخرِجْ) وإنْ كَانَ مُتَحَرِّكاً فَلا حاجَةَ إلى الهَمْزَةِ ، نَحْوُ (عِدْ وحَاسِبْ) ، ومِنْهُ بَابُ الإفْعالِ [2] .

---

### وانەی سی و هەشت:

### فیعلی ئەمر (کاری داخوازی)

فیعلی ئەمر: ووشەیەکە دەلالەت دەکاتە سەر داخوازی کردنی ئەنجامدانی کارێك لە موخاتەب، وەك: (اضرب، اغزُ، ارم) دروستکردنیشی بەوە دەبێت کە حەرفی موضارەعەکە لێبکرێتەوە لە فیعلە موضاریعەکەی، پاشان سەیردەکەین ئەگەر حەرفی دوای حەرفە موضارەعەکە ساکین بوو، ئەوە لەسەرەتاکەیەوە هەمزەیەکی وەصڵی بۆ دادەنێین، بە مەضمومی ئەگەر سێیەم حەرفی مەضموم بوو، وەك: (انصر)، بە مەکسوری ئەگەر مەفتوح یان مەکسور بوو، وەك: (إعلم، اضرب، استخرج)، بەڵام ئەگەر یەکەم حەرف خۆی حەرەکەتی هەبوو ئەوە پێویستی بە هەمزەی وەصڵ نیە، وەك: (عِد، حاسِبْ)، بابی (إفعال)یش هەر لەم جۆرەیە[2].

---

[1] - ثالثهُ ، يعني الفعلِ من المُضارع .

[2] - اي انّ من باب الإفعال لا يحتاج إلى همزة الوصل.

[2] مەبەست ئەوەیە بابی (إفعال) هەرچەندە سەرەتاکەی بە هەمزە دەست پێ دەکات بەڵام هەمزەکەی هەمزەی وەصڵ نیە و بۆیە کاتێك کە دەیکەینە موضاریع حەرفی موضارەعەکەی لێدەکەینەوە هەمزەکەی خۆی بۆ دادەنێینەوە و پێویستی بە هەمزەی وەصڵ نیە.

وفِعْلُ الأمْرِ مَبْنِيٌّ عَلى عَلامَةِ الجَزْمِ كما فِي مُضارِعِهِ ، نَحْوُ (اِضْرِبْ ، أُغْزُ ، اِسْعَ ، اِضْرِبا، اِضْرِبُوا ، دَحْرِجْ).

## الفعْلُ المَجْهُولُ

الفِعْلُ المَجْهُولُ: فِعْلٌ لَمْ يُسَمَّ فَاعِلُهُ ، أو هُوَ فِعْلٌ حُذِفَ فاعِلُهُ وَأُقِيمَ المَفْعُولُ بِهِ مَقامَهُ ، ويَخْتَصُّ بِالمُتَعَدِّي.

وعَلامَتُهُ فِي الماضِي أَنْ يَكُونَ الحَرْفُ الأوَّلُ مَضْمُوماً فَقَطْ ، وما قَبْلَ آخِرِهِ مَكْسُوراً فِي الأبْوابِ الَّتِي لَيْسَتْ فِي أَوائِلِها هَمْزَةُ وَصْلٍ ، ولا تاءٌ زائِدَةٌ ، نَحْوُ (ضُرِبَ ، ودُحْرِجَ).

---

فیعلی ئەمر مەبنی دەبێت لەسەر نیشانەی جەزمی موضاریعەکەی، وەك: (إضرب، أغزُ، إرم، إسعَ، إضربا، إضربوا، دحرج)[1].

## فیعلی بینا مەجهول (کاری بکەرنادیار)

فیعلی بینا مەجهول: فیعلێکە فاعیلەکەی ناونەبرابێت، یان فیعلێکە فاعیلەکەی حەزف کرابێت و مەفعول بیهیەکەی لە جێگایدا دانرابێت، ئەم صیغەیە تایبەتە بە فیعلی موتەعەدیەوە[2].

لە فیعلی ماضیدا نیشانەکەی ئەوەیە کە تەنها یەکەم حەرفی مەضموم بێت، و پێش کۆتاییەکەی مەکسور بێت لەو بابانەدا کە یەکەم حەرفیان هەمزەی وصڵ یان تاءی زیادە نیە، وەك: (ضُرِبَ، دُحرِجَ).

---

١ واتە هەریەکە لەم نموونانەی سەرەوە ئەگەر بیانکەیتە موضاریعی مەجزوم نیشانەی جەزمەکەیان چی بێت ئەوەی لە حاڵەتی ئەمردا مەجزوم دەبن لەسەر ئەو نیشانەیە.

٢ مەبەست ئەوە نیە کە فیعلی لازم ناکرێتە بینا مەجهول، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە هەرکاتێك ویستمان فیعلێکی لازم بکەینە مەبنی مەجهول ئەوە پێویستە لە سەرەتاوە بیکەینە موتەعەدی، وەك: (جاء رجل)، لە پێشدا دەیکەینە (جاء رجل بزید) واتە دەیکەینە موتەعەدی بەهۆی حەرفی جەڕ یان هەر شتێکی ترەوە، پاشان دەیکەینە مەبنی مەجهول، و دەڵێین: (جيء بزید).

وأَنْ يَكُونَ أَوَّلُهُ وثانيه مَضمُوماً وما قَبْلَ آخِرِهِ مَكْسُوراً فِيما أَوَّلُهُ تاءٌ زائِدَةٌ نَحْوُ (تُفُضِّلَ، وتُقُوِّيَ).

وَأَنْ يَكُونَ أَوَّلُ حَرْفٍ مُتَحَرِّكٍ مِنْهُ مَضمُوماً وما قَبْلَ آخِره مَكْسُوراً فِيما أَوَّلُهُ هَمْزَةُ وَصْلٍ ، نَحْوُ (اُسْتُخْرِجَ ، اُقْتُدِرَ).والهَمْزَةُ تَتْبَعُ المَضمُومَ إنْ لَمْ تُدْرَجْ.

وعَلامَةُ الفِعْلِ المَجْهُولِ فِي المُضارِعِ أنْ يَكُونَ حَرْفُ المُضارَعَةِ مَضمُوماً ، ومَا قَبْلَ آخِرِهِ مَفْتُوحاً نَحْوُ (يُضْرَبُ ، ويُسْتَخْرَجُ) ، إلاّ فِي بابِ المُفاعَلَةِ، وَالإفْعالِ ، والتَّفْعِيلِ ، والفَعْلَلَةِ ، ومُلْحَقاتِها فَإنَّ العَلامَةَ فِيها فَتْحُ ما قَبلَ الآخِرِ فَقَطْ ، نَحْوُ (يُحاسَبُ ، ويُدَحْرَجُ).

وعَلامَتُهُ فِي الأَجْوَفِ أنْ يَكُونَ فَاءُ الفِعْلِ مِنْ مَاضِيهِ مَكْسُوراً ، نَحْوُ (قِيلَ وبِيعَ).

وتُقْلَبُ العَيْنُ فِي المُضارِعِ الأجْوَفِ أَلِفاً نَحْوُ(يُقالُ، ويُباعُ) كما وتُقْلَبُ الألفُ فِي الماضِي المَجْهُولِ واواً مِنْ بَابِ المُفاعَلَة والتَفاعُل، نَحْوُ(قُوتِلَ وتُعُوهِدَ) كَما عَرَفْتَ فِي التَّصرِيفِ.

---

هەروەها سەرەتاکەی و دووەم حەرفی مەضموم بێت و پێش کۆتایی مەکسور لەو فیعلانەدا کە سەرەتاکەیان (تاء)ی زیادەیە، وەك: (تفُضل، تقُوي).

یەکەم حەرفی حەرەکەتداریشی مەضموم بێت و پێش کۆتایی مەکسور لەو فیعلانەدا کە سەرەتاکەیان هەمزەی وەسڵە، وەك: (استخرِج، اقتدِر). هەمزە وەسڵەکەش ئەگەر لە دەرجدا نەبوو ئەوە شوێن حەرفە مەضمومەکە دەکەوێت.

لە موضاریعیشدا نیشانەی فیعلی مەبنی مەجهول ئەوەیە کە حەرفە موزارەعەکەی مەضموم بێت، و پێش کۆتاییەکەی مەفتوح بێت، وەك: (یُضرَب، یُستخرَج)، بێجگە لە بابەکانی: (مفاعلة، إفعال، تفعیل، فعللة) و مولحەقەکانیان، کە نیشانە تێیاندا تەنها بریتیە لە مەفتوح کردنی پێش کۆتاییەکانیان، وەك: (یُحاسَب، یُدحرَج).

لە فیعلی ئەجوەفیشدا نیشانەکەی ئەوەیە کە فاءالفعل ی ماضیەکەی مەکسور بێت، وەك: (قِیل، بِیع). لە موضاریعی ئەجوەفدا عەینەکەی دەکرێتە ئەلف، وەك:(یُقال، یُباع) هەروەك ئەلفەکەیشی لە ماضی مەجهولدا دەکرێتە واو لە بابی:(مفاعلة) و (تفاعل)دا، وەك: (قوتل، تعوهد)، دیارە کە لە زانستی صەرفدا ئەمەت زانیوە.

## اَلخُلاصَةُ:

فِعْلُ الأمْرِ: كَلِمَةٌ تَدُلُّ عَلى طَلَبِ الفِعْلِ.

ويُؤتَى بِهَمْزَةِ وَصْلٍ فِي أوَّلِهِ إذا كَانَ بَعْدَ حَرْفِ الْمُضَارَعَةِ ساكِنٌ والهَمْـزَةُ مَكْسُـورَةٌ ، إلاّ إذا كَانَ العَيْنُ فِي مُضارِعِهِ مَضْمُوماً ، فَتُضَمُّ.

الفِعْلُ المَجْهُولُ: فِعْلٌ حُذِفَ فَاعِلُهُ ، وأُقِيمَ المَفْعُـولُ بِـهِ مَقامَـهُ ، وعَلامَتُـهُ فِـي الماضِـي أنْ يَكُونَ كُلُّ حَرْفٍ مُتَحَرِّكٍ مِنْهُ مَضْمُوماً وما قَبلَ آخِرِه مَكْسُوراً.

وفِي المُضارِعِ أنْ يَكُونَ الحَرْفُ الأوَّلُ مَضْمُوماً ، وما قَبْلَ آخِرِهِ مَفْتُوحاً وتَبْقى بَقِيَّةُ حُرُوفِهِ عَلى حالِها.

---

## پوختە

فیعلی ئەمر: ووشەیەکە دەلالەت دەکات لەسەر داخوازی کردنی کارێك.

لەسەرەتاکەیەوە هەمزەیەکی وەسڵی بۆ دەهێنرێ ئەگەر حەرفی پێش حەرفە موزارەعەکە ساکین بوو، هەمزەکەش مەکسور دەبێت، لەکاتێکدا نەبێت (عین الفعل)ی موضاریعەکەی مەضموم بێت، ئەو کاتە ئەمیش مەضموم دەبێت.

فیعلی مەجهول: فیعلێکە فاعیلەکەی حەزف کراوە، و مەفعول بیهیەکەی لە جێگایدا دانراوە، نیشانەکەشی لە ماضیدا ئەوەیە کە هەموو حەرفە حەرەکەتدارەکانی مەضموم بن[1]، و پێش کۆتاییەکەیشی مەکسور بێت.

لە موضاریعیشدا ئەوەیە کە یەکەم حەرفی مەضموم بێت، و پێش کۆتاییەکەی مەفتوح بێت، ئیتر حەرفەکانی تری وەك خۆیان دەمێننەوە.

---

١ ئەم یاسایە بۆ دروستکردنی فیعلی بینا مەجهولی ماضی یاسایەکی گشتگیرتر و کورتترە لەو سێ یاسایەی کە پێشتر باسیان لێوەکرا.

**اسئلة:**

١-عَرِّفْ فِعْلَ الأمْرِ.

٢-بَيِّنْ كَيْفَ يُصاغُ فِعْلُ الأمْرِ ، ثمَّ أذكُر مَتى تزاد هَمزَة الوَصل وَمَثِّل لَهُ.

٣-بَيِّنْ عَلى مَ يُبْنى فِعْلُ الأمْرِ مَعَ ضرب الأمثلة.

٤-مَتى تُكْسَرُ هَمْزَةُ الوصْلِ فِي فِعْلِ الأمرِ وَمتى تُضَمُّ؟

٥-مِمَّ يُصاغُ الفِعْلُ الَّذِي لَمْ يُسَمَّ فاعِلُهُ؟

٦-مَا هُوَ الفِعْلُ المَجهُولُ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثال.

٧-كَيْفَ يُبْنى لِلمَجْهُولِ الفِعْلُ الماضِي فِي الأبْوابِ الَّتِي لَيْسَتْ فِي أوائِلِها هَمْزَةُ الوَصْلِ ، ولا تاءٌ زَائِدَةٌ؟ بَيِّنْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٨-كَيْفَ يُبْنى لِلمجهُولِ الفِعْلُ الماضِي الَّذي فِي أوَّلِهِ تاءٌ زائِدَةٌ؟ هَاتِ أَمْثِلَةً لِذلِك.

---

**پرسیار:**

١. پێناسەی فیعلی ئەمر بکە.

٢. ئەوە ڕوون بکەوە کە فیعلی ئەمر چۆن دروست دەکرێت، پاشان باسی ئەوە بکە کە چ کاتێك هەمزەی وەسڵی بۆ دێنین، نموونەشی بۆ بێنەوە.

٣. بە نموونەوە ڕوونی بکەوە کە فیعلی ئەمر لەسەر چی مەبنی دەبێت؟

٤. چ کاتێك هەمزەی وەسڵ لە فیعلی ئەمردا کەسرەی دەبێت و چ کاتێك ضەممە؟

٥. فیعلی مەجهول لە چی دروست دەکرێت؟

٦. فیعلی مەجهول چییە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٧. چۆن ئەو فیعلە ماضیانە دەکەینە مەجهول کە لەو بابانە نین کە لەسەرەتاوە هەمزەی وەسڵ یان تاءی زیادەیان هەیە؟ ئەمە بە نموونەی بەسوودەوە ڕوون بکەوە.

٨. چۆن ئەو فیعلە ماضیەی کە لەسەرەتایەوە تاءی زیادە هەیە دەکرێتە مەجهول؟ چەند نموونەیەکی بۆ بێنەوە.

٩-كَيْفَ يُبْنى لِلمجهُولِ الفِعْلُ الماضِي الَّذِي فِي أَوَّلِهِ هَمْزَةُ وَصْلٍ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

١٠-أُذكُرْ كَيْفِيَّةَ بِناءِ الَمجْهُولِ مِنَ الفِعْلِ الُمضارِعِ الُمجَرَّدِ؟ أُذكُرُ امْثِلَةً لِذلِك.

١١-كَيْفَ يُبْنى لِلمَجْهُولِ الفِعْلُ الُمضارِعُ مِنْ باب الإفعال والتفعيل والمفاعلة والفَعللة؟ مَثِّلْ لِذلِك.

١٢-كَيْفَ يُبْنى لِلمَجْهُولِ الفِعْلُ الماضِي الأَجْوَفُ؟

١٣-أُذكُرْ كَيْفِيَّةَ بِناءِ الَمجْهُولِ مِنَ الفِعْلِ الُمضارِعِ الأَجْوَفِ ومَثِّلْ لَهُ.

---

٩. چۆن ئەو فیعلە ماضیەی کە سەرەتاکەی هەمزەی وەسڵە دەکرێتە مەجهول؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٠. باسی بکە چۆن موضاریعی موجەڕەد دەکرێتە مەبنی مەجهول؟ چەند نموونەیەك بێنەوە.

١١. چۆن فیعلی موضاریع لە بابی: (إفعال، تفعیل، مفاعلة، فعللة) دەکەیتە مەبنی مەجهول؟ نموونەیان بۆ بێنەوە.

١٢. چۆن فیعلی ماضی ئەجوەف دەکەیتە مەبنی مەجهول؟

١٣. باسی چۆنیەتی دروستکردنی مەجهول بکە لە موضاریعی ئەجوەف، و نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ- فیعلە ئەمرەکان لەم ڕستانەدا دیاری بکە، و هۆی حەرەکەی هەمزە وەسڵەکەیشیان ڕوون بکەرەوە:

١-(اِعْمَلْ لِدُنْياكَ كَأَنَّكَ تَعِيشُ أَبَداً، وَاعْمَلْ لآخِرَتِك كَأَنَّك تَمُوتُ غَداً)[1].

٢-اُكْتُبِ الدَّرْسَ، وَاقرَأْ الَمجَلَّةَ.

---

١ - أصله حديث في السنن الكبرى للبيهقي وفي ذيله الجوهر النقي - (ج ٣ / ص ١٩) برقم(٤٩٣٢)عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ:« إِنَّ هَذَا الدِّينَ مَتِينٌ ، فَأَوْغِلْ فِيهِ بِرِفْقٍ ، وَلاَ تُبَغِّضْ إِلَى نَفْسِكَ عِبَادَةَ رَبِّكَ ، فَإِنَّ الْمُنْبَتَّ لاَ سَفَرًا قَطَعَ ، وَلاَ ظَهْرًا أَبْقَى ، فَاعْمَلْ عَمَلَ امْرِئٍ يَظُنُّ أَنْ لَنْ يَمُوتَ أَبَدًا ، وَاحْذَرْ حَذَرًا تَخْشَى أَنْ تَمُوتَ غَدًا . وفيه مبهم. والمقصود بالعمل هنا للآخرة.

٣-أَحْسِنْ إلى الفُقَراءِ، وتَواضَعْ لَهُمْ.

٤-أَيِّدِ العامِلِينَ فِي سَبِيلِ اللّهِ.

٥-اللّهُمَّ انْصُرِ الإسْلامَ وأَهْلَهُ.

٦-اِسْمَعْ نَصِيحَةَ أَبَوَيكَ.

ب- لەم فیعلانەی خوارەوە فیعلی ئەمر دروست بکە:

أَنْعَشَ، أهْمَلَ، نَهَضَ، اِسْتَسْلَمَ، صَعَدَ، صافَحَ، تَجاهَلَ، غَزا، رَكَضَ، أَكَّدَ.

ج- فیعلە مەبنی مەجهولەکان لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە، و جۆرەکەیان بڵێ:

١-أُدِّيَ الواجِبُ. ٢-كُتِبَ الدَّرسُ. ٣-أُدِّبَتِ البِنْتُ.

٤-نُظِّمَ العَمَلُ. ٥-اُسْتُجِيبَتْ دَعوَتُهُ ٦-يُنْظَرُ غَداً فِي الأَمْرِ.

٧- قال تعالى:﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ﴾(البينة/٥).

د- ئەم فیعلانەی خوارەوە بکە بە مەبنی مەجهول:

دَعَا، اسْتَنْصَرَ، اِنْقادَ، هَيَّأَ، دَبَّرَ، تَجاهَرَ، باعَ، ناجى، قَبِلَ.

هـ- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-إنَّها كَلِمَةُ حَقٍّ يُرادُ بِها باطِلٌ [١].

٢-اِسْتَنْزِلُوا الرِّزْقَ بالصَّدَقَةِ [٢].

٣-حاسِبوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحاسَبُوا [٣].

٤-بِيعَ الكِتابُ.

٥- قال تعالى:﴿يُنَبَّأُ الإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾(القيامة/١٣).

---

١ - هذه الكلمة لعلي رضي الله عنه ردا على الخوارج الذين قالوا لا حكم إلا لله.

٢ - حديث ضعيف السلسلة الضعيفة برقم(٢٧٥٤)

٣ - مصنف ابن أبي شيبة برقم(٣٤٤٥٣) موقوفا من قول عمر رضي الله عنه وهو حسن لغيره

## الدرس التاسع والثلاثون

## الفِعْلُ اللاَّزِمُ والمُتَعَدِّي

يَنْقَسِمُ الفِعْلُ إلى قِسْمَيْنِ:

١-الفِعْلُ اللاَّزِمُ ، وهُوَ ما يَدُلُّ عَلى مُجَرَّدِ وُقُوعِ الفِعْلِ مِنْ دُونِ التَّعَدِّي إلى المَفْعُولِ مِثْلُ (ذَهَبَ سَعِيدٌ).

٢-الفِعْلُ المُتَعَدِّي ، وهُوَ ما يَتعدَّى إلى المَفْعُولِ لِيَدُلَّ عَلى وُقُوعِ الفِعْلِ عَلَيهِ.

فَيَتعدَّى إلى: ١-مَفْعُولٍ واحدٍ ، نَحْوُ (نَصَرَ سَعِيدٌ جَعْفَراً).

٢-مَفْعولَيْنِ ، نَحْوُ (أَعْطى سَعِيدٌ جَعْفَراً دِرْهَماً) ، ويَجُوزُ فِيهِ الاقْتِصارُ على أَحَدِ مَفْعُولَيهِ نَحْوُ (أَعطَيْتُ زَيداً وأعْطَيْتُ دِرْهماً) بِخِلافِ بابِ (عَلِمْتَ).

---

## وانەی سی و نۆ

## فیعلی موتەعەدی و لازم (کاری تێپەڕ و کاری تێنەپەڕ)

فیعل دەکرێتە دوو بەشەوە:

١. فیعلی لازم: ئەوەیە کە تەنها دەلالەت لەسەر ڕوودانی فیعلەکە دەکات، بەبێ ئەوەی کە تێپەڕ بکات بۆ سەر مەفعولەکە، وەك: (ذهب سعید).

٢. فیعلی موتەعەدی: ئەوەیە کە تێپەڕ دەکاتە سەر مەفعول بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەوەی کە -کاریگەریی- فیعلەکەی بەسەردا کەوتووە.

ئەوکاتە تێپەڕ دەکات بۆ لای:

١. یەك مەفعول، وەك: (نصر سعید جعفرا)

٢.دوو مەفعول، وەك:(اعطی سعید جعفرا درهما) لەمەدا دروستە تەنها یەکێك لە مەفعولەکانی بڵێین، وەك: (اعطیت زیداً، اعطیت درهما) ئەمەش بە پێچەوانەی بابی (علمت)وەوە[1].

---

١ مەبەست ئەوەیە کە لە(اعطیت)دا ئەگەر مەفعولی دووەمی بۆ نەڵێین فیعلەکە هەر موتەعەدیە و لە ئیعرابدا دەڵێین مەفعولی دووەمی حەزف کراوە، بەڵام لە بابی(علمت)دا ئەو کارە فیعلەکە دەکاتە لازم و بەمانای ناسین دێت واتە:(عرفت) نەك بە مانای زانین.

٣- ثلاثةِ مَفاعِيلَ ، نَحْوَ: (أَعْلمَ اللّهُ رَسُولَهُ عَلِيّاً إماماً) ، ومِنْهُ (أَرَي ، وأَخْبَـرَ ، وخَبَّرَ ، وحَدَّثَ).

والمَفْعُولُ الأوَّلُ والأخيرُ فِي هذهِ الأفعالِ السِّتَّةِ كَمَفْعُولَيْ (أعْطَيْتُ) فِي جَوازِ الاقْتِصارِ عَلى أحَدِهِمَا، نَحْوُ (أَعْلَمَ اللّهُ سَعِيداً)، والثَّانِي مَعَ الثَّالِثِ كَمَفْعُولَي (عَلِمْتُ) فِي عَدَمِ جَوازِ الاقْتِصارِ عَلى أَحَدِهِما فَلا يُقالُ (أَعْلَمْتُ سَعِيداً خَيْرَ النَّاسِ) بَلْ يُقَالُ (أَعْلَمْتُ سَعِيداً عَلِيّاً خَيْرَ النَّاسِ).

### أفعالُ القُلُوب

وهِيَ أفْعالٌ تُفِيدُ اليَقِينَ أَوِ الرُّجْحَانَ وهِيَ سَبْعَةٌ: ١-عَلِمْتُ ٢ -ظَنَنْـتُ ٣-حَسِـبْتُ ٤-خِلْتُ ٥-رَأَيْتُ ٦-زَعَمْتُ ٧-وَجَدْتُ. وهِيَ تَدْخُلُ عَلى المُبْتَدَإ والخَبَـرِ فَتَنْصِـبُهُما عَلـى المَفْعُولِيَّةِ نَحْوُ (عَلِمْتُ زَيْداً فاضِلاً ، ظَنَنتُ عَمْرواً عالِماً).

---

٣. سێ مەفعول، وەك: (اعلم الله رسوله عليا إماما)، ئەم فیعلانە هەر لەم جۆرەی سێیەمن: (اری، انبأ، اخبر، خبّر، حدّث).

مەفعولی یەکەم و کۆتایی لەم شەش بابەدا هەر وەك دوو مەفعولەکەی(اعطیت)ـن، لەوەدا کە دروستە تەنها یەکێکیان بڵێین، وەك: (اعلم الله سعیداً)، دووەم و سێیەمیشیان وەك دوو مەفعولەکەی (علمت)ـن، لەوەدا کە دروست نیە تەنها یەکێکیانی بۆ بڵێین، کەواتە ناووترێت: (اعلمت سعیداً خیراً الناس)، بەڵکو دەڵێین: (اعلمت سعیداً علیاً خیرَ الناس).

### فیعلەکانی قلوب[1]

ئەو فیعلانەن کە واتای یەقین یان ڕوجحان -پێشتربوون- دەگەیەنن، ئەوانیش حەوتن:١.علمت ٢.ظننت ٣.حسبت ٤.خلت ٥.رایت ٦.زعمت ٧.وجدت. ئەمانە دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر، و مەنصوبیان دەکەن لەسەر ئەوەی کەمەفعولن، وەك: (علمت زیداً فاضلاً، ظننت عمرواً عالماً).

---

١ واتە: کارە دەروونیەکان. لە زمانی کوردیدا پۆلێنێکی تایبەت بۆ ئەم کارانە نییە، بەڵام زۆربەی جار لە چوارچێوەی ڕستەیەکی ئاوێتەدا دێن و، دەکەونە شارستەوە، وەك:(وامزانی، ئازاد زیرەکە).

وَلِهذِهِ الأفْعالِ خَواصٌّ ، نَذْكُرُ أَهَمَّها فِيما يَأتِي:

١-إنَّهُ لا يُقْتَصَرُ عَلى أحَدِ مَفْعُولَيْها بِخِلافِ بَابِ (أَعطَيْتُ) ، فَلا تَقُولُ (عَلِمْتُ زَيْداً).

٢-يَجوزُ إلغاؤُها إذا تَوَسَّطَتْ نَحْوُ(سَعِيدٌ ظَنَنْتُ عالِمٌ)أو تَأَخَّرَتْ نَحْوُ(سَعِيدٌ قَائِمٌ ظَنَنْتُ).

٣-إنَّها تُعَلَّقُ عَنِ العَمَلِ إذا وَقَعَتْ قَبْلَ الاسْتِفْهَامِ، نَحْوُ: (عَلِمْتُ أَسَعِيدٌ عِنْدَكَ أَمْ جَعْفَرٌ؟) أوْ قَبْلَ النَّفي ، نَحْوُ: (عَلِمْتُ ما سَعِيدٌ فِي الدَّارِ) ، أوْ قَبْلَ لامِ الابْتِداءِ ، نَحْوُ: (عَلِمْتُ لَسَعِيدٌ مُنطَلِقٌ).

ومَعْنى التَّعْلِيقِ أَنَّهُ لا تَعْمَلُ لَفْظاً بَلْ تَعْمَلُ مَعْنىً.

٤-يَجُوزُ أنْ يَكونَ فاعِلُها ومَفْعُولُها ضَمِيرَيْنِ مُتَّصِلَيْنِ مِنَ الشَّيءِ الواحِدِ نَحْوُ: عَلِمْتُنِي مُنطَلِقاً وظَنَنْتُكَ فاضِلاً.

---

ئەم فیعلانە چەند تایبەتمەندیەکیان هەیە، کە لە خوارەوە گرنگترینیان باس دەکەین:

١. بە پێچەوانەی بابی(اعطیت)وەوە ناتوانین تەنها یەك مەفعولی بۆ بڵێین، کەواتە ناتوانی بڵێیت: (علمت زیدا)[1].

٢. ئەگەر کەوتنە ناوەڕاستەوە دروستە لە عەمەلیان بخەین، وەك: (سعید ظننت عالم)، یان ئەگەر دواکەوتن: (سعید قائم ظننت).

٣. کارکردنیان تەعلیق دەکرێت -واتە:ڕادەگیرێت- ئەگەر کەوتنە پێش ئیستیفهام، وەك: (علمت اسعیدٌ عندك أم جعفرٌ؟)، یان پێش نەفی، وەك: (علمت ما سعیدٌ في الدار)، یان پێش لامی ئیبتیدا، وەك: (علمت لسعیدٌ منطلقٌ).

مەبەستیش لە تەعلیق ئەوەیە کە بە لەفزی کارناکات بەڵکو تەنها لە مەعنادا کاردەکات.

٤. دروستە فاعیل و مەفعولەکەیان هەردوو ضەمیری موتتەصیل بن و بۆ یەك شت بگەڕێنەوە، وەك: (علمتني منطلقا، ظننتك فاضلا)[2].

---

١ مەگەر بە مانای (عرفت)بێت، ئەوکات لە ئەفعالی قلوب نیە.

٢ نموونەی دووەم بۆ ئەم مەبەستە ناشێت، چونکە فاعیل و مەفعولی یەك کەس نین.

وقَدْ يَكُونُ (ظَنَنْتُ) بِمَعْنى (اتَّهَمْتُ) ، و (عَلِمْتُ) بِمَعْنى (عَرَفْتُ) ، و (رَأَيْتُ) بِمَعْنى (أَبْصَرْتُ) ، و (وَجَدْتُ) بِمَعنى (أَصَبْتُ الضَّالَّةَ) ، فَتَنْصِبُ مَفْعُولاً واحِداً فَقَطْ ، فَلا تَكُونُ حِينَئِذٍ مِنْ أفْعالِ القُلُوبِ ، مِثْلُ (وَجَدْتُ الكِتابَ).

**الخُلاصَةُ :**

الفِعْلُ يَنْقَسِمُ إلى: اللاَّزِمِ والمُتَعَدِّي.

الفِعْلُ الَّلازِمُ: فِعْلٌ لا يَتَجاوَزُ الفاعِلَ إلى المَفْعُولِ بِهِ.

الفِعْلُ المُتَعدِّي: فِعْلٌ يَتَجاوَزُ الفاعِلَ إلى المَفْعُولِ بِهِ وهُوَ يَتَعدَّى إلى:

١-مَفْعُولٍ وَاحِدٍ. ٢-مَفْعُولَيْنِ. ٣-ثلاثَةِ مَفاعِيلَ.

أفْعالُ القُلُوبِ: أفْعالٌ تُفِيدُ اليَقِينَ أوِ الرُّجْحانَ وتَدْخُلُ عَلى المُبْتَدَإِ والخَبَرِ فَتَنْصِبُهُما.

أفْعالُ القُلُوبِ قَدْ تُعَلَّقُ عَنِ العَمَلِ وقَدْ تُلْغى.

---

دەگونجێ (ظننت) بە مانای: (اتهمت)-تۆمەتبارم کرد- بێت، و (علمت) بە مانای:(عرفت)-ناسیم- بێت، و (رایت) بە مانای: (ابصرت)-بەچاو بینیم- بێت، و (وجدت) بەمانای:(اصبت) - وونبووەکەم دۆزیەوە- بێت، ئەوکاتانە تەنها یەك مەفعول مەنصوب دەکەن، و ئەوکاتانەش فیعلی قلوب نین، وەك: (وجدت الکتاب).

**پوختە**

فیعل دابەش دەبێت بۆ: موتەعەدی و لازم.

فیعلی لازم: فیعلێکە لە فاعیل تێناپەڕێت بۆ لای مەفعول بیهی.

فیعلی موتەعەدی: فیعلێکە لە فاعیلەوە تێپەڕ دەکات بۆ لای مەفعول بیهی.

و تێپەڕیش دەکات بۆلای:

١. یەك مەفعول. ٢. دوو مەفعول. ٣. سێ مەفعول.

فیعلەکانی قلوب: کۆمەڵە فیعلێکن یەقین یان ڕوجحان دەگەیەنن، دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر و هەردووانیان مەنصوب دەکەن.

فیعلەکانی قلوب دەگونجێ لە عەمەل بخرێن یان تەعلیق بکرێن.

والتَّعْلِيقُ: عَدَمُ إعْمَالِ الفِعْلِ لَفْظاً لا مَعْنىً.

والإلغاءُ: عَدَمُ إعْمالِها لَفْظاً ومَعْنىً.

أسئلة:

١–ما هُوَ الفِعْلُ اللاّزِمُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢–عَرِّفِ الفِعْلَ المُتَعَدِّيَ. ومَثِّلْ لَهُ.

٣–عَدِّدْ أنْواعَ المُتعدِّي. ومَثِّلْ لَهُ.

٤–عَدِّدِ الأفْعَالَ الَّتِي تَتَعَدّى إلى ثَلاثَةِ مَفاعِيلَ ، وبَيِّنْ أوْجُهَ الشَّبَهِ بَيْنَ مَفْعُولَيْها الأوَّلِ و الأخِيرِ مَعَ مَفْعُولَي أَعْطَيْتُ. وما شَبَهُ مَفْعُولَيْها الثَّاني والثَّالِثِ مَعَ مَفْعُولَيْ عَلِمْتُ؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ ذِكْرِ أمْثِلَتِها.

٥–عَدِّدْ أَفْعالَ القُلُوبِ ، وبَيِّنْ عَمَلَها بالمُبْتَدإ والخَبَرِ مَعَ ذِكْرِ مِثَالٍ.

٦–هَلْ يَجوز أن يَأتِي فاعلُ ومَفعولُ أفْعالِ القُلُوبِ ضَميرَيْن؟اشرَح ذلك مع ذكر مثال له.

---

تەعلیق: کارنەکردنی فیعلەکەیە لە لەفزدا نەك لە مانادا.

ئیلغا: کارنەکردنی فیعلەکەیە لە لەفز و ماناشدا.

پرسیار:

١. فیعلی لازم چییە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. پێناسەی فیعلی موتەعەدی بکە، و نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. جۆرەکانی فیعلی موتەعەدی بژمێرە، و نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. ئەو فیعلانە بژمێرە کە تێپەڕ دەکەن بۆ سێ مەفعول، و لێکچوونی نێوان مەفعولی یەکەم و کۆتاییان لەگەڵ دوو مەفعولەکەی (اعطیت)دا ڕوون بکەرەوە، لەگەڵ لێکچوونیان لەگەڵ دوو مەفعولەکەی (علمت)دا، ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٥. فیعلەکانی قلوب بژمێرە، و عەمەلیان لە موبتەدا و خەبەردا بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٦. ئایا دروستە فاعیل و مەفعولی فیعلەکانی قلوب هەردوویان ضەمیر بن. ئەمە ڕوون بکەرەوە و نموونەیەکیشی بۆ بڵێ.

٧-مَتى تُعَلَّقُ أفعالُ القُلُوبِ عَنِ العَمَلِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٨-مَتى تُعَلَّقُ أفْعالُ القُلُوبِ عَنِ العَمَلِ ولِمَاذا؟ بَيِّنْ ذلِك مَعَ ذِكْرِ مِثالٍ.

٩-مَتى تَتَعَدّى أفْعَالُ القُلُوبِ إلى مَفْعُولٍ واحدٍ فَقَطْ؟ وَهَلْ تَكُونُ حِينَئِذٍ مِنْ القُلُوبِ؟ اِشْرَحْ ذلِك ووضِّحْهُ بِأمْثِلَةٍ.

---

٧. کەی فیعلەکانی قلوب لە عەمەل دەکەون؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٨. کەی فیعلەکانی قلوب تەعلیق دەکرێن، و بۆچی؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٩. کەی فیعلەکانی قلوب تێدەپەڕن تەنها بۆ لای یەك مەفعول؟ ئایا ئەو کاتەش هەر لە فیعلەکانی قلوبن؟ ئەمە شی بکەوە و ڕوونی بکەوە بە نموونەوە.

١٠. جیاوازی چیە لە نێوان تەعلیقکردن و لەعەمەل خستن دا؟

## ڕاهێنان:

أ- فیعلی موتەعەدی و لازم لەم ڕستانەدا دەربهێنە، و ئەگەر موتەعەدی بوون ئەوا مەفعولەکەیان دیاری بکە:

١-أنْبَأ زَيْدٌ عَمْراً سَعِيداً نَاجِحاً.

٢-أعْطَيْتُ الفَقِيرَ ثَوْباً.

٣-ظَنَنْتُ سَعِيداً واقِفاً.

٤-فَرِحَ الطِّفْلُ.

٥-عَلِمْتُ الخَبَرَ.

ب- لەم ڕستانەی خوارەوەدا جۆری فیعلەکان دیاری بکە:

١-نَظَمْتُ قَصِيدَةً فِي مَدحِ الرسولِ صلى الله عليه وسلم.

٢-رَأيْتُ الوَلَدَ فِي المَدْرَسَةِ.

٣-جَلَسَ الطّالِبُ عَلى رَحْلَتِهِ.

٤-أعْلَمَ اللّهُ رَسُولَهُ صلى الله عليه وسلم عن استشهادِ قادةِ مؤتةَ.

٥-رَأَيْتُ العِلْمَ نَافِعاً.

٦-خِلْتُكَ مُسافِراً.

٧-سَعِيدٌ ناجِحٌ وَجَدْتُ.

د- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي﴾(الأنعام / ٧٨).

٢- قال تعالى: ﴿فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً﴾(النمل / ٤٤).

٣-وَجَدْتُ الإسْلامَ دِيناً كَامِلاً.

٤-ظَنَنْتُكَ شُجَاعاً.

٥-حَسِبْتُ الدَّرْسَ صَعْباً.

## الدرس الأربعون
## الأفْعَالُ النَّاقصَةُ وأفْعَالُ المُقارَبَة
### أ-الأفْعَالُ النَّاقصَةُ :

أَفْعالٌ وُضِعَتْ لِتَقْرِيرِ الفاعِلِ عَلى صِفَةٍ غَيْرِ صِفَةِ مَصْدَرِها ، وهِيَ(كَانَ وصارَ وأَصْبَحَ وأمْسى.. إلخ) ، وتَدْخُلُ عَلى المُبْتَدأِ والخَبَرِ فَتَرْفَعُ الأوَّلَ اسْماً لَها وتَنْصِبُ الثّاني خَبَراً لَها ، فَتَقُولُ: كَانَ سَعِيدٌ قَائِماً.

و (كَانَ) عَلى ثَلاثَةِ أقْسام:

١-نَاقِصَةٌ ، وهِيَ تَدُلُّ عَلى ثُبُوتِ خَبَرِها لِفاعِلِها فِي الماضِي ، إمّا دائِماً، نَحْوُ قولـه تعالى:﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾(النساء/١٧)., أوْ مُنْقَطِعاً ، نَحْوُ (كَانَ زَيْدٌ شابّاً).

---

## وانەی چل
## فیعلە ناقیصەکان و فیعلەکانی موقارەبە
### أ. فیعلە ناقیصەکان (کارە ناتەواوەکان)

کۆمەڵێك فیعلن دانراون بۆ دامەزراندنی فاعیلەکە لەسەر صیفەتێك کە صیفەتی مەصدەرەکەیان نیە[1]، ئەوانیش بریتین لە: (کان، صار، اصبح، امسی،....هتد)، ئەمانە دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر، یەکەمیان مەرفوع دەکەن و دەیکەنە ئیسمیان، و دووەمیان مەنصوب دەکەن و دەیکەنە خەبەریان، دەڵێیت: (کان سعیدٌ قائما).

سێ جۆر (کان) هەیە:

١. ناقیص: ئەوەیە کە دەلالەت دەکاتە سەر چەسپانی خەبەرەکە بۆ فاعیلەکەی لە ڕابردوودا، بە هەمیشەیی، وەك: ﴿ وكان الله عليماً حكيماً﴾ ، یان بە پچڕاوی، وەك: (کان زید شابا).

---

١ مەبەست ئەوەیە کە ئەو فیعلانە ئەو ناوەی کە دەبوایە ببوایەتە فاعیلیان ئەمان دەیکەنە ئیسمی خۆیان و لەبری ئەوەی کە خۆیان بدرێنە پاڵ ئەو فاعیلە، شتێکی تر دەدەنە پاڵی، وەك: (کان زید قائما)، کە لەبری ئەوەی نیسبەتی (کون)واتە: بوون -کە مەصدەری (کان)ە- بدەنە پاڵ (زید) نیسبەتی (قیام)ی دەدەنە پاڵ.

٢–تَامَّةٌ ، وهِيَ بِمَعْنى (ثَبتَ ، وحَصَلَ) نَحْوُ (كَانَ القِتالُ) ، أيْ حَصَلَ القِتَالُ ، فَهِيَ هُنا تُفيدُ مَعْناها اللُّغَوِيَّ.

٣–زَائدَةٌ ، وهُوَ ما لا يَتَغيَّرُ المَعْنى بِحَذْفِها ، كَقَوْلِ الشّاعِرِ :

جِيادُ بَنِي أَبِي بَكْرٍ تَسَامَى... على "كَانَ" المُسَوَّمَةِ العِرابِ[1]

و (صَارَ) للانْتِقَالِ ، نَحْوُ (صَارَ زَيْدٌ غَنِيّاً). و (أَصْبَحَ) و(أَمْسَى) و (أَضْحَى) ، تَدُلُّ عَلى اقْتِرانَ مَعْنَى الجُمْلَةِ بِتِلْكَ الأوْقَاتِ ، نَحْوُ (أَصْبَحَ زَيْدٌ ذاكِراً) ، أي كَانَ ذَاكِراً فِي وَقْتِ الصُّبْحِ ، وبِمَعْنَى دَخَلَ فِي الصَّباحِ مِثْلُ قوله تعالى: ﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ﴾ (١٧) سورة الروم.

---

٢. تام -واتە: تەواو-: ئەوەیە کە بە مانای چەسپان یان ڕوودان دێت، وەك: (كان القتال)، واتە: شەڕ ڕووی دا، لەم شوێنەدا ئەو مانا لوغەویەکەی[2] دەبەخشێ.

٣. زیادە: ئەوەیە کە بە لابردنی، مانای ڕستەکە ناگۆڕێ، وەك ووتەی شاعیر:

جياد بني ابي بكر تسامى　　على كان المسومة العراب

(صار) بۆ گواستنەوە -لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر- دەبێت، وەك: (صار زيد غنيا).

(اصبح) و (امسى) و (اضحى) دەلالەت دەکەنە سەر پەیوەست[3] بوونی مانای ڕستەکە بەو کاتانەوە، وەك: (اصبح زيد ذاكرا)، واتە: بوویە زیکرکەر لە کاتی بەیانیدا، وە بە مانای چوونە ناو کاتی بەیانیەوە دێت، وەك: ﴿ حين تمسون وحين تصبحون﴾.

---

١ - لمْ يُسَمَّ قائِلُهُ ، جِيادُ مِثْلُ ( كِتاب ) جَمْعُ جَوادٍ وهُوَ الفَرَسُ النَّفيسُ ، وَأبو بَكْرٍ كُنْيَةُ رَجُلٍ ، وتَسامَى : أصلُهُ تَتَسامَى وهُوَ مُضارِعٌ مِنَ السُمُوِّ ، والمُسَوَّمَةُ بالسينِ المُهْمَلَةِ والواوِ المُشَدَّدَةِ بِصيغَةِ اسْمِ المَفْعُولِ ، هِيَ الدّابَّةُ الّتي جُعِلَتْ عليها سِمَةٌ أيْ عَلامَةٌ ، وتُرِكَتْ في المَرْعَى ، والعِرابُ مِثْلُ ( كِتاب ) وهُوَ كُلُّ ما يُخْبِرُ العَرَبَ . والشّاهِدُ فيهِ ( كان ) حَيْثُ وَقَعَتْ زائِدَةً لا يَتَغَيَّرُ بِها المَعْنى .

٢ واتە: ئەو مانایەی کە لە ئەصڵی زمانی عەرەبیدا بۆی دانراوە، کە بە مانای ڕوودانە.

٣ ئەگەر بە مانای پەیوەست بون بوون ئەوە ناقیصن بەڵام ئەگەر بە مانای چوونەناو کات بوون ئەوە تەواون وەك نایەتەکە.

وكَذلِكَ (ظَلَّ وبَاتَ) يَدُلاّنِ عَلى اقْتِران مَعْنَى الجُمْلَةِ بِوَقْتِهِما ،وقَدْ يَأتِي بِمَعْنى (صَارَ) ، نَحْوُ قوله تعالى: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنْثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا﴾(النحل/٥٨).

و (مازَالَ ، وما بَرِحَ ، ومَا فَتِئَ ، ومَا انْفَكَّ) تَدُلُّ عَلى ثُبُوتِ خَبَرِهَا لِفاعِلِها ، ويَلْزَمُها حَرْفُ النَّفي ، نَحْوُ (ما زَالَ زَيْدٌ أَمِيراً) . و (مَا دَامَ) تَدُلُّ عَلى تَوْقِيتِ أَمْرٍ بِمُدَّةِ ثُبُوتِ خَبَرِهَا لِفاعِلِها[1]، نَحْوُ(أَقُومُ مَادَامَ الأَمِيرُ جَالِساً).

و (لَيْسَ) تَدُلُّ عَلى نَفْي الجُمْلَةِ حالاً وقِيلَ مُطْلَقاً ، نَحْوُ (لَيْسَ زَيْدٌ قائِماً) وقَدْ عَرَفْتَ بَقِيَّةَ أَحْكَامِها فِي القِسْمِ الأَوَّلِ فَلا نُعِيدُها.

## ب-أفعالُ المُقَارَبَة

أفْعَالُ المُقَارَبَةِ: أَفْعالٌ وُضِعَتْ لِلدَّلالَةِ عَلى دُنُوِّ الخَبَرِ لِفاعِلِها وَهِيَ عَلى ثَلاثَةِ أَقْسامٍ:

---

هەروەها(ظل)و(بات)دەلالەت دەکەنە سەر پەیوەست بوونی مانای ڕستەکە بە کاتەکەیانەوە ، لەوانەیە بەمانای (صار)یش بێن، وەك:﴿وإذا بشر أحدهم بالأنثى ظل وجهه مسودًا﴾.

(مازال) و (مابرح) و (مافتيء) و (ماانفك)دەلالەت دەکەنە سەر چەسپانی خەبەرەکە بۆ فاعیلەکەیان، هەمیشە حەرفی نەفیشیان لەگەڵدایە، وەك: (مازال زيد اميرا).

(مادام) دەلالەت دەکاتە سەر بەستنەوەی کارێك بەو کاتەوە کە خەبەرەکەی تێدا چەسپاوە بۆ فاعیلەکەی، وەك: (اقوم مادام الأمير جالسا).

(ليس) دەلالەت دەکاتە سەر نەفیکردنی ڕستەکە لە ئێستادا، هەندێکیش ووتویانە بەبێ قەید، وەك: (ليس زيد قائما). حوکمەکانی تری ئەم فیعلانەت لە بەشی یەکەمدا زانی و ئێستا دووبارەیان ناکەینەوە.

## ب- فیعلەکانی موقارەبە[2]

کۆمەڵە فیعلێکن دانراون بۆ ئەوەی دەلالەت بکەنە سەر نزیکبوونەوەی خەبەرەکە بۆ فاعیلەکەیان. ئەمانیش دەکرێنە سێ بەشەوە:

---

١ - أي : اسنها .

٢ -واتە: نزیکیی- لە ڕێزمانی کوردیدا پۆلێنی تایبەتم بۆ ئەم کارانە بەرچاو نەکەوت.

الأوَّلُ: مَا يَدُلُّ عَلى الرَّجاءِ ، وهُوَ (عَسى) ولا يُسْتَعْمَلُ مِنهُ غَيْرُ الماضِي لِكَوْنِهِ فِعْلاً جَامداً وهُوَ فِي العَمَلِ ، مِثْلُ كَانَ ، نَحْوُ (عَسى زَيْدٌ أَنْ يَقُومَ) ، إلاّ أَنَّ خَبَرَهُ فِعْلُ المُضارِعِ مَعَ (أَنْ) ، نَحو (عَسى زَيْدٌ أَنْ يَخرُجَ) ، وَيَجُوزُ تَقْدِيمُهُ ، نَحْوُ (عَسى أَنْ يَخرُجَ زَيْدٌ) ، وقَدْ تُحْذَفُ (أَنْ) نَحْوُ (عَسى زَيْدٌ يَقُومُ).

الثَّانِي: مَا يَدُلُّ عَلى الحُصُولِ ، وهُوَ (كَادَ) وخَبَرُهُ مُضارِعٌ دُونَ (أَنْ) ، نَحْوُ (كَادَ زَيْدٌ يَقُومُ) ، وقَدْ تَدْخُلُ (أَنْ) عَلى خَبرِهِ ، نَحْوُ (كَادَ زَيْدُ أَنْ يَخرُجَ).

الثَّالِثُ: ما يَدُلُّ عَلى الأخذِ والشُّروعِ فِي الفِعْلِ ، وهُوَ (طَفِقَ ، وجَعَلَ ، وكَرَبَ ، وأَخَذَ) واسْتِعْمَالُها مِثْلُ (كَادَ) ، نَحْوُ (طَفِقَ زَيْدٌ يَكْتُبُ... إلخ) و (أَوْشَكَ) ، واسْتِعْمَالُهُ مِثْلُ (عَسى ، وكَادَ).

---

یەکەم: ئەوانەی دەلالەت دەکەنە سەر ڕەجا -واتە: بەهیوابوون-، کە بریتیە لە (عسى)، کە تەنها بە ماضی بەکاردێت، چونکە فیعلێکی جامیدە، لەکاردا وەك (کان) وایە، وەك: (عسى زید ان یقوم)، بەڵام ئەوە هەیە کە خەبەرەکەی فیعلێکی موضاریعە و (ان)ی لەگەڵدایە، وەك: (عسى زید أن یخرج)، دروستیشە پێش بخرێت، وەك: (عسى ان یخرج زید)، هەندێ جار(ان) حەزف دەکرێت، وەك: (عسى زید یقوم).

دووەم: ئەوانەی کە دەلالەت دەکەنە سەر حوصول -واتە:پەیدابوون-، کە بریتیە لە (کاد)، خەبەرەکەشی موضاریعە و (ان)ی پێوە نیە، وەك: (کاد زید یقوم)، هەندێ جار (ان) دەچێتە سەر خەبەرەکەی، وەك: (کاد زید أن یخرج).

سێیەم: ئەوانەن دەلالەت دەکەنە سەر دەستپێکردن یان دەستدانە کارێك، کە بریتین لە (طفق) و (جعل) و (کرب) و (اخذ)، بەکارهێنانیشیان وەك(کاد) وایە، وەك: (طفق زید یکتب..... هتد)، هەروەها (اوشك) کە بەکارهێنانی وەك (عسى) و (کاد)یە.

### الخُلاصَةُ:

الأفعالُ النَّاقِصَةُ: أَفْعَالٌ تَدْخُلُ عَلى المُبْتَدَأِ والخَبَرِ ، فَتَرْفَعُ الأوَّلَ ويَكُونُ اسْمَها ، وتَنْصِبُ الثَّانِي ويَكُونُ خَبَرَها ، وهِيَ كَانَ وأَخَواتُها.

أَفْعالُ المُقارَبَةِ: أفْعالٌ وُضِعَتْ لِتَدُلَّ عَلى قُرْبِ حُصُولِ الخَبَرِ لِفاعِلِها أوْ شُرُوعِ الفاعِلِ فِيهِ ، أوْ رَجاءِ حُصولِهِ لَهُ

### أسئِلَةٌ:

١-عَرِّفْ الفِعْلَ النَّاقِصَ ، واذكُرْ عَمَلَهُ إذا دَخَلَ عَلى المُبْتَدَأِ والخَبَرِ.

٢-عَدِّدْ أَقْسامَ (كَانَ) واذكُر معانيها واستعملها في جُمل مفيدة.

٣-اُذكُرْ مَعانِيَ أَخواتِ كان واسْتَعْمِلْها فِي جُمَلٍ مُفِيدَةٍ.

٤-عَرِّفْ فِعْلَ المُقارَبَةِ.

---

### پوختە

فیعلە ناقیصەکان: کۆمەڵە فیعلێکن دەچنە سەر موبتەدا و خەبەر، یەکەمیان مەرفوع دەکەن و دەبێتە ئیسمیان، دووەمیان مەنصوب دەکەن و دەبێتە خەبەریان.

ئەوانیش بریتین لە (کان) و خوشکەکانی.

فیعلەکانی موقارەبە: کۆمەڵێك فیعلن دانراون بۆ ئەوەی دەلالەت بکەنە سەر نزیکبوونەوەی ڕوودانی خەبەرەکە بۆ فاعیلەکەیان، یان دەستکردنی فاعیلەکە بە خەبەرەکە، یان هیوابوون بە ڕوودانی خەبەرەکە بۆ فاعیلەکە.

### پرسیار:

١. فیعلی ناقیص پێناسە بکە، و عەمەلەکەی بڵێ کاتێك دەچێتەسەر موبتەدا و خەبەر.

٢. جۆرەکانی (کان) بژمێرە، و ماناکانیان بڵێ، و لە ڕستەی بەسوددا بەکاریان بهێنە.

٣. خوشکەکانی (کان) بژمێرەو ماناکانیان بڵێ و لە ڕستەی بە سوددا بەکاریان بهێنە.

٤. فیعلی موقارەبە پێناسە بکە.

٥-ما هِيَ أَنْوَاعُ أَفْعَالِ المُقَارَبَةِ؟ عَدِّدْهَا ومَثِّلْ لَها.

٦-ما نَوْعُ خَبَرِ أَفْعالِ المُقارَبَةِ؟

٥. جۆرەکانی فیعلی موقارەبە کامانەن؟ بیانژمێرە و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٦. جۆری خەبەری فیعلەکانی موقارەبە کامەیە؟

## ڕاهێنان

أ- فیعلی ناقیص و ئیسمەکەی لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیاری بکە:

١-كَانَ وِنامٌ بَيْنَ القَومِ. ٢-أَصْبَحَ الرَّجُلُ كَاتِباً. ٤-ما بَرِحَ سَعِيدٌ جالِساً.

٣-ظَلَّ الوَلَدُ ماشِياً. ٥-ما زَالَ الطَّالِبُ مُجِدّاً. ٦-باتَ الرَّجُلُ ساهِراً.

ب- خەبەری (كاد) و خوشکەکانی لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١-كَادَ الطِّفْلُ يَقِفُ. ٢-أَوْشَكَ الجُنْدِيُّ يَنْتَصِرُ.

٣-أَخَذَ الشَّاعِرُ يُنْشِدُ قَصِيدَتَهُ. ٤-عَسَى أَنْ يَدْرُسَ الطَّالِبُ.

٥-طَفِقَ الخَطِيبُ يَخطبُ. ٦-جَعَلَ سَعِيْدٌ يُنَظِّفُ ثِيابَهُ.

٧-كَادَتِ الحَرْبُ تَقَعُ.

ج- ئەم ڕستانەی خوارەوە ئیعراب بکە:

١-كَادَ الفَقْرُ انْ يَكُوْنَ كُفْراً [1].

٢- قال تعالى:﴿وَطَفِقَا يَخصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾(الأعراف / ٢٢).

٣- قال تعالى:﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾(البقرة/٢١٦).

٤-أَوْشَكَ النَّصْرُ يَلُوحُ.

٥-ما زَالَ المُسْلِمُونَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ.

---

١ - حديث شريف حلية ٥٣/٣ و١٠٩ و٢٥٣/٨ و٢٧٢/٩ وهو حسن لغيره.

## الدرس الحادي والأربعون

## فعلُ التَّعَجُبِ وأفعالُ المَدْحِ والذَّمِّ

أ-فِعْلُ التعَجُّبِ مَا وُضِعَ لإنْشَاءِ التَّعَجُّبِ ، ولَهُ صِيغَتَان.

١-مَا أَفْعَلَهُ ، نَحْوُ (مَا أَحْسَنَ سَعِيداً) ، أَيْ: أَيُّ شَيءٍ أَحْسَنَ سَعِيداً ، وفِي (أَحْسَنَ) ضَمِيرٌ مُسْتَتِرٌ ، وهُوَ فَاعِلُهُ.

٢-أَفْعِلْ بِهِ ، نَحْوُ (أَحْسِنْ بِزَيْدٍ).

ولا يُبْنَيانِ إلاّ مِمّا يُبْنى مِنْهُ افْعَلُ التَّفْضِيلِ بِأَنْ يَكُونَ فِعْلاً ثُلاثِيّاً مُتَصَرِّفاً قابلاً لِلتَّفاضُلِ ، ويُتَوَصَّلُ فِي الفاقِدِ لِلشَّرائِطِ بِمِثْلِ (ما أَشَدَّ) كَما عَرَفْتَ.

ولا يَجُوزُ التَّصْرِيفُ فِيهِ ، ولا التَّقْدِيمُ ، ولا التَّأخِيرُ ، ولا الفَصْلُ ، وأَجازَ المازِنِي الفَصْلَ بِالظَّرْفِ ، نَحْوُ (مَا أَحْسَنَ اليَوْمَ زَيْداً).

---

### وانەی چل و یەك

**فیعلی تەعەجوب** (کاری سەرسوڕمان[1]) و **فیعلەکانی مەدح و زەم** (کاری ستایش و داشۆرین)

أ- فیعلی تەعەجوب: ئەوفیعلەیە دانرابێت بۆ ئەنجامدانی سەرسوڕمان، دوو صیغەیشی هەیە:

١. (ماافعله)، وەك: (مااحسن سعیدا)، واتە: چ شتێك سەعیدی بەچاك گێڕاوە! لە (احسن)دا ضەمیرێکی شاراوە هەیە، کە فاعیلیەتی.

٢. (افعل به)، وەك: (احسن بزید).

ئەم دووانە دروست ناکرێن لە شتێك نەبێت کە (افعل)ی تەفضیلی لێ دروست بکرێت، وەك ئەوەی فیعلێکی سێ حەرفی موتەصەریف بێت و قەبوڵی زیاد و کەمی بکات، لە هەر چیەکیشدا کە مەرجەکانی تێدا نەبێت بەشتێکی وەك: (مااشد) دەیگەینێ، وەك پێشتر زانیت.

تەصریف -واتە گۆڕینی صیغەکەی بەپێی ضەمیرەکان- تێیدا دروست نیە، هەروەها پێشخستن، و دواخستن، و لێك پچڕانیش دروست نیە، بەڵام (مازنی) مۆڵەتی ئەوەی داوە بپچڕێت بەهۆی زەرفەوە، وەك: (مااحسن الیوم زید).

---

[1] لە کوردیدا ئەو کارەیە کە لە چوارچێوەی ڕستەیەکی سەرسوڕماندا بەکار دەهێنرێت.

## ب-أفعَالُ المَدْحِ والذَمِّ

فِعْلُ المَدْحِ والذَّمِ: ما وُضِعَ لإنْشَاءِ مَدْحٍ أَوْ ذَمٍّ.

وَلِلْمَدْحِ فِعْلان:

١.(نِعْمَ) وفاعله اسم مُعرَّفٌ باللام ، نحو: (نِعمَ الرّجلُ حميدٌ)أو مُضافٌ إلى المَعَرَّفِ بِاللَّامِ ، نَحْوُ (نِعْمَ غُلامُ الرَّجُلِ حَميدٌ) ، وقَدْ يَكُونُ فَاعِلُهُ مُضمَراً ، فَيَجِبُ تَمْيِيزُهُ بِنَكِرَةٍ مَنْصُوبَةٍ ، نَحْوُ (نِعْمَ رَجُلاً حَمِيدٌ) ، أوْ بِـ(ما) نَحْوُ قَوْلِهِ تَعالى: ﴿إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ..﴾ (البقرة/ ٢٧١)، أيْ: نِعْمَ ما هِيَ ، وَ(حَمِيدٌ) يُسَمَّى: المَخصوصَ بِالمَدْحِ.

٢-(حَبَّذا)، نَحْوُ (حَبَّذا رَجُلاً سَعِيدٌ) ، فَإنَّ (حَبَّ) فِعْلُ المَدْحِ وفَاعِلُهُ (ذا) و (رَجُلا) تَمْيِيزٌ و المَخصُوصُ (سَعِيد).

ويَجُوزُ أَنْ يَقَعَ قَبْلَ مَخصُوصِ (حَبَّذا) أوْ بَعْدَهُ تَمْيِيزٌ ، نَحْوُ (حَبَّذا رَجُلاً سَعِيدٌ ، وحَبَّذا سَعِيدٌ رَجلاً) ، أو حَالٌ ، نَحْوُ (حَبَّذا رَاكِباً جَعْفَرٌ ، وحَبَّذا جَعْفَرٌ راكِباً).

---

## ب- فیعلەكانی مەدح و زەم

فیعلی مەدح و زەم: ئەوەیە كە دانراوە بۆ ئەنجامدانی مەدح یان زەم.

مەدح دوو فیعلی هەیە:

١. (نِعمَ) فاعیلەكەی ئیسمێكی مەعریفەیە بە لام، وەك:(نعم الرجل حمید)، یان ئیزافە كراوە بۆ لای مەعریفەیەك بە لام، وەك:(نِعمَ غلام الرجل حمید)، هەندێ جار دەگونجێت فاعیلەكەی ضەمیر بێت، ئەوكاتەش پێویستە بە ئیسمێكی نەكیرەی مەنصوب تەمیزێكی بۆ بهێنینەوە، وەك:(نِعمَ رجلاً حمید)، یان بەهۆی (ما)وە، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ﴾واتە: (نعم ما هی)، بە (حمید)یش دەوترێت: مخصوص بالمدح -تایبەتكراو بە مەدح.

٢. (حَبّذا)، وەك: (حبّذا رجلا سعید)، لێرەدا (حبّ) فیعلی مەدحە و فاعیلەكەی (ذا)یە و (رجلا) تەمییزە و مەخصوص بە مەدحەكەش(سعید)ە.

دروستە تەمییزێك لە پێش مەخصوصەكەی(حبذا)وە بێت یان لە دوایەوە، وەك: (حبذا رجلا سعید)، و (حبذا سعید رجلا)، یان حاڵێك، وەك: (حبّذا راكبا جعفر) و (حبذا جعفر راكبا).

وللذَّمِّ أيْضاً فِعْلان:

١-(بِئْسَ) ، نَحْوُ (بِئْسَ الرَّجُلُ زَيْدٌ وبِئْسَ غُلامُ الرَّجُلِ زَيْدٌ ، وبِئْسَ رَجُلاً زَيْدٌ).

٢-(ساءَ) نَحْوُ (سَاءَ الرَّجُلُ حامدٌ ، وسَاءَ غُلامُ الرَّجُلِ حامدٌ وسَاءَ رَجُلاً حامدٌ).

و(ساءَ) مثلُ (بِئْسَ).

**الخُلاصَةُ:**

فِعْلُ التَّعَجُّبِ: فِعْلٌ وُضِعَ لإنْشَاءِ التَّعَجُّبِ ، ولا يُبْنى إلاّ مِمّا يُبْنى مِنهُ أَفْعَلُ التَّفْضِيلِ ، وَصِيغَتُهُ (مَا أَفْعَلَهُ ، وأَفْعِلْ بِهِ).

أَفْعَالُ المَدْحِ والذَّمِّ: أَفْعَالٌ وُضِعَتْ لإنْشَاءِ المَدْحِ أوِ الذَّمِّ وصِيغَتُهُ (نِعْمَ ، حَبَّذا) لِلمَدْحِ ، و(ساءَ ، بِئْسَ) لِلذَّمِّ.

---

هەروەها زەمیش دوو فیعلی هەیە:

١. (بئس)، وەك: (بئس الرجل زید) و (بئس غلام الرجل زید) و (بئس رجلا زید)[1].

٢. (ساء)، وەك: (ساء الرجل زید) و (ساء غلام الرجل خالد) و (ساء رجلا خالد).

(ساء)ـەش هەر وەك (بئس)وایە.

**پوختە**

فیعلی تەعەجوب: فیعلێکە دانراوە بۆ ئەنجامدانی سەرسوڕمان، دروستیش ناکرێت لەو شتانە نەبێت کە (افعل)ی تەفضیلیان لێ دروست دەکرێت، صیغەکەیشی بریتیە لە: (ما افعله، افعل به).

فیعلەکانی مەدح و زەم: کۆمەڵە فیعلێکن دانراون بۆ ئەنجامدانی مەدح یان زەم، صیغەکەشی بریتیە لە (نعم) و (حبذا) بۆ مەدح و (ساء) و (بئس)ـەش بۆ زەم.

---

١ لە نمونەی یەکەمدا فاعیلەکە معریفەیە بە(ال) و لە دووەمیاندا موزافە بۆ لای مەعریفە و لە سێیەمیاندا ضەمیرە .

## أَسْئلَةٌ:

١-عَرِّفْ فِعْلَ التَّعَجُّبِ؟

٢-كَمْ صِيغَةً لِفِعْلِ التَّعَجُّبِ؟ اُذكُرها ومَثِّلْ لَها.

٣-كَيْفَ تُبْنى صِيغَةُ فِعْلِ التَّعَجُّبِ؟ وما هِيَ شُرُوطُهُ؟

٤-هَلْ يَجُوزُ التَّصْرِيفُ والتَّقْدِيمُ والتَّأخِيرُ فِي صِيغَةِ فِعْلِ التَّعَجُّبِ؟

٥-لأيِّ شَيءٍ وُضِعَ فِعْلُ المَدْحِ والذَّمِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٦-ما هِيَ أَفْعالُ المَدْحِ؟ اُذكُرْها ومَثِّلْ لَهَا.

٧-ما هُوَ المَخصُوصُ بالمَدْحِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٨-عَرِّفْ فَاعِلَ (نِعْمَ) ومَثِّلْ لِذلِك.

٩-إذا كَانَ فَاعِلُ (نِعْمَ) مُضْمَراً فَمَا هُوَ تَمْيِيزُهُ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

---

## پرسیار:

١. پێناسەی فیعلی تەعەجوب بکە.

٢. فیعلی تەعەجوب چەند صیغەی هەیە؟ بیانڵێ و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٣. صیغەی فیعلی تەعەجوب چۆن دروست دەکرێت؟ مەرجەکانیشی کامانەن؟

٤. ئایا گۆڕانکاری بەپێی ضەمیرەکان و پێشخستن و دواخستن لە صیغەی فیعلی تەعەجوبدا دروستە؟ ئەمە ڕوون بکەوە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. فیعلی مەدح و زەم بۆ چی دانراوە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. فیعلەکانی مەدح کامانەن؟ بیانڵێ و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٧. مەخصوص بە مەدح چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨. پێناسەی فاعیلی (نعم) بکە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. ئەگەر فاعیلی (نعم) ضەمیر بوو تەمییزەکەی چی دەبێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

١٠-هَلْ يَجُوزُ أَنْ يَقَعَ قَبْلَ مَخصُوصِ(حَبَّذا) أو بَعْدَهُ، تَمْييزٌ أَوْ حالٌ؟ إشْـرَحْ ذلِـك مَـعَ ذِكْرِ مِثالٍ.

١١-ما هِيَ أَفْعالُ الذَّمِّ؟ مَثِّلْ لَها.

---

١٠. ئایا دروستە تەمییزێك یان حاڵێك لەپێش یان لەپاش مەخصوصەکەی (حبذا)وە بێت؟ ئەمە ڕوون بکەوە بە نموونەوە.

١١. فیعلەکانی زەم کامانەن؟ نموونەیان بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ-فیعلی مەدح و زەم و مەخصوصەکەیان و فیعلی تەعەجوب لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١-ما أَجْمَلَ الحَدِيقَةَ.

٢-أَكْرِمْ بِهِ صَدِيقاً.

٣-أَنْعِمْ بِسَعِيدٍ أَخاً.

٤-ما أَكْثَرَ الوَرْدَ فِي الحَدِيقَةِ.

٥-حَبَّذا أَخاً سَعِيدٌ.

٦- قال تعالى:﴿نِعْمَ العَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾(ص/٣٠)

٧-بِئْسَ الرَّجُلُ فرعونُ.

٨-ساءَ رَجُلاً أبو جهلٍ.

ب-فیعلێکی مەدح یان زەم یان تەعەجوبی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-............ الشَّرَابُ الخَمْرُ.

٢-............ فَقِيهاً الإمامُ الغزاليُّ.

٣-............ وَضَّاعاً، لِلحَديثِ لوطُ بنُ يحيى.

٤-............ الرَّبيعَ.

٥-............ رَجُلاً عمارٌ.

٦-............ الدّارُ الآخرةُ.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى:﴿بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا﴾(الكهف/٢٩).

٢- قال تعالى:﴿نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا﴾(الكهف/٣١).

٣- قال تعالى:﴿ وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾(آل عمران/١٧٣).

٤- « نِعْمَ الإِدَامُ الْخَلُّ » [١].

٥-نِعْمَ الفَاكِهَةُ العِنَبُ.

---

١ - اخرجه مسلم برقم(٥٤٧١ ) وابى داود برقم( ٣٨٢٢ )

## الدرس الثاني والأربعون

## القِسمُ الثالثُ- في الحَرْف

وقَدْ مَضى تَعْرِيفُهُ ، وأَقسامُهُ سَبْعَةَ عَشَرَ:

١-حُرُوفُ الجَرِّ. ٢-الحُرُوفُ المُشَبَّهَةُ بالفِعْلِ. ٣-حَرُوفُ العَطْفِ.

٤-حُرُوفُ التَّنْبِيه. ٥-حُرُوفُ النِّداءِ. ٦-حُرُوفُ الإيجابِ.

٧-حُرُوفُ الزِّيادَةِ. ٨-حَرْفا التَّفْسِيرِ. ٩-حُرُوفُ المَصْدَرِ.

١٠-حُرُوفُ التَّحْضِيض. ١١-حَرفُ التَّوَقُّعِ. ١٢-حُرُوفُ الاسْتِفْهام.

١٣-حُرُوفُ الشَّرْطِ. ١٤-حَرْفُ الرَّدْعِ. ١٥-تَاءُ التَّأنِيثِ.

١٦-نُونُ التَّنْوينِ. ١٧-نُونُ التَّاكِيدِ.

ونَشْرَحُها بِالتَّرْتِيبِ كَما يَأتِي:

---

## وانەی چل و یەك

## بەشی سێیەم: سەبارەت بە حەرف (پیت یان ئامراز)

کە پێشتر پێناسەکرا، ئەمانیش دەکرێنە حەڤدە بەشەوە:

١. حەرفەکانی جەڕ ٢. حەرفە موشەببەهـ بە فیعلەکان ٣. حەرفەکانی عەتف

٤. حەرفەکانی تەنبیهـ. ٥. حەرفەکانی نیدا ٦. حەرفەکانی ئیجاب

٧.حەرفە زیادەکان ٨. حەرفەکانی تەفسیر ٩. حەرفەکانی مەصدەر

١٠.حەرفەکانی تەحضیض ١١. حەرفەکانی تەوەقوع ١٢.حەرفەکانی ئیستیفهام

١٣. حەرفەکانی شەرت ١٤. حەرفەکانی ڕەدع ١٥.تاءی تەئنیس

١٦. نونی تەنوین ١٧. نونی تەئکید

لەمەودوا هەموویان بە هەمان ڕیزبەندی ڕوون دەکەینەوە:

## حُرُوفُ الجَرِّ

حُرُوفُ الجَرِّ:حُرُوفٌ وُضِعَتْ لإيصالِ فِعْلٍ وشِبْهِهِ أوْ مَعْناهُ إلى الاسْمِ الَّذي يَلِيهِ ، مِثْلُ (مَرَرْتُ بزَيْدٍ ، وأنا مارٌّ بزيدٍ) ومِثْلُ (هذا فِي الدّارِ أَبُوكَ) ، أَيْ: الّذِي أُشِيرُ إِلَيْهِ فِي الدّارِ ، فَفِيهِ مَعْنَى الفِعْلِ.

وهِيَ تِسْعَةَ عَشَرَ حَرْفاً كَمَا يَلِي:

١-(مِنْ) وتُسْتَعْمَلُ:

أ-لابْتداءِ الغَايَةِ: وعَلامَتُهُ أَنْ يَصِحَّ تَقَابُلُهُ لِلانْتِهاءِ، نَحْوُ (سِرْتُ مِنَ البَصْرَةِ إلى الكُوفَةِ).

ب-لِلتَّبْيِيْنِ: وعَلامَتُهُ أَنْ يَصِحَّ وَضْعُ (الّذِي هُوَ) مَكانَهُ ، كَقَوْلِهِ تَعالى: (فاجْتَنِبوا الرِّجْسَ مِنَ الأوْثانِ)(الحج / ٣٠) أَي الرِّجسَ الّذِي هُوَ الأوْثانُ.

ج-لِلتَّبْعيضِ: وعَلامَتُهُ أَنْ يَصِحَّ وَضْعُ (بَعْض) مَكانَهُ نَحْوُ: (أَخَذْتُ مِنَ الدَّراهِمِ) أَيْ بَعْضَ الدَّراهِمِ.

---

### حەرفەكانی جەڕ (ئامرازی پەیوەندی)

حەرفەكانی جەڕ: كۆمەڵە حەرفێكن دانراون بۆ گەیاندنی فیعل و شێوە فیعل یان مانا فیعل بەو ئیسمەی كە بەدوایاندا دێت، وەك: (مررت بزيدٍ، انا مارٌ بزيدٍ)، و وەك: (هذا في الدارِ ابوك)، واتە: ئەوەی كە من ئاماژەی پێدەكەم لە خانوەكەدا، كە دیارە ئەمەش مانای فیعلی تێدایە.

ئەم حەرفانە نۆزدە حەرفن بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. (من) كە بەكاردێت بۆ:

أ. ئیبتیدای غایە -سەرەتای مەبەست-: نیشانەكەیشی ئەوەیە كە دروست بێت بەرامبەری بكەین لەگەڵ كۆتایی مەبەستەكەدا، وەك: (سرت من البصرة الى الكوفة).

ب. بۆ تەبیین-ڕونكردنەوە-: نیشانەكەیشی ئەوەیە كە دروستبێت (الذي هو) بخەینە جێگاكەی، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ فاجتنبوا الرجس من الأوثان﴾ واتە: لەو پیسیەی كە بتەكانن.

ج. بۆ تەبعیض -بە هەندكردن-: نیشانەكەیشی ئەوەیە كە دروست بێت (بعض) بخەینە جێگاكەیەوە، وەك: (اخذت من الدراهم) واتە: (بعضا من الدراهم) -هەندێ لە درهەمەكان-.

د-زائِدَةً ، وَعَلامَتُهُ أَنْ لا يَخْتَلَّ الْمَعْنى بِحَذْفِهِ نَحْوُ: (مَا جاءَنِي مِنْ أَحَدٍ) ، ولا تُزادُ فِي الكَلامِ الْمُوجَبِ خِلافاً لِلْكُوفِيِّنَ.

٢-(إلى) وَهِيَ لِإنْتِهاءِ الغَايَةِ كَمَا مَـرَّ ، وبِمَعْنـى (مَـعَ) قَلِـيلاً ، كَقَوْلِـهِ تَعـالى: (فاغسِـلُوا وُجُوهُكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إلى المَرافِقِ)(المائدة / ٦) ، أيْ مَعَ المَرافِقِ.

٣-(حَتى) وهِيَ مِثْلُ (إلى) نَحْوُ (نِمْتُ البَارِحَةَ حَتّى الصَّباحِ) وبِمَعْنى (مَعَ) كَـثِيراً ، نَحْـوُ (قَدِمَ الحَاجُّ حَتّى الْمُشَاةِ) ولا تَدْخُلُ عَلى الضَّمِيرِ ، فَلا يُقَالُ (حَتَّاهُ) خِلافـاً لِلمُبَـرِّدِ. وأَمَّـا قَوْلُ الشَّاعِرِ:

فَلا وَاللّهِ لا يُلْفِي أُناسٌ     فَتًى حَتّاكَ يا ابن أَبِي زِيَادِ [1]

فشاذٌ.

---

د. بۆ زیادە، نیشانەکەیشی ئەوەیە کە بە لابردنی ماناکە تێك نەچێت، وەك: (ماجائني من احد)، ناتوانین لە قسەیەکدا کە موجەب بێت زیادی بکەین ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەوە کە کوفیەکان دەیڵێن.

٢. (الی) ئەمیش وەك باسکرا بۆ نینتیهای غایە -کۆتایی مەبەست- دەبێت، بە کەمییش بە مانای (مع) -واتە لەگەڵ- دێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ فاغسلوا وجوهكم وايديكم الى المرافق﴾ ، واتە: لەگەڵ ئانیشکەکاندا.

٣. (حتى) ئەمیش وەك (الی) وایە، وەك: (نمت البارحة حتى الصباح)، بەزۆریش بە مانای(مع) دێت، وەك: (قدم الحاج حتى المشاة)، هەروەها ناچێتە سەر ضەمیر، ناوترێ (حتاه) بە پێچەوانەی ڕای موبەڕەد، بەڵام گوتەی شاعیر:

فلا والله لا يلفي أناس     فتى حتاك ياابن أبي زياد

ئەوە شازە.

---

١ - لم يسم قائله(لا) زائدة قبل القسم تمهيداً لنفى جواب القسم و( يبقى) مضارع من البقاء و (الفتى) الشاب الفتى ، اي لا يبقى شخص حتى انت يا ابن ابى زياد . والشاهد فيه دخول حتى على الضمير .

٤-(فِي) لِلظَّرْفِيَّةِ ، نَحْوُ (سَعِيدٌ فِي الدّارِ، والماءُ فِي الكُوزِ). وبِمَعْنَى (عَلى) قَلِيلاً كَقَوْلِهِ تَعالى: (وَلأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ)(طه / ٧١).

**الخُلاصَةُ:**

الحَرْفُ: كَلِمَةٌ لا تَدُلُّ عَلى مَعْنَى إلاّ مَعَ غَيْرِها.

حُرُوفُ الجَرِّ: حُرُوفٌ وُضِعَتْ لإِيْصَالِ الفِعْلِ وشِبْهِهِ إلَى الاسْمِ.

وتُسْتَعْمَلُ (مِنْ): ١-لابتِداءِ الغَيَةِ.

٢-لِلتَّبْيِين.

٣-لِلتَّبْعِيضِ.

٤-زَائِدَةً.

وتُسْتَعْمَلُ (إلى) لانْتِهاءِ الغَايَةِ ، وبِمَعْنى (مَعَ) قليلا ،وتُستعمل(حتّى) بمعنى (الى) وبمعنى (مع)كثيرا، ولا تَدْخُلُ عَلى الضَّميرِ. وتُسْتَعْمَلُ (فِي) للظَّرْفِيَّةِ ، وبِمَعْنى (عَلى) قَلِيلاً.

---

٤. (في) بۆ زەرفیەت دێت، وەك: (سعيد في الدار، الماء في الكوز). بە مانای (على)ش بەکەمی دێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ ولأصلبنكم في جذوع النخل﴾.

**پوختە**

حەرف: ووشەیەکە لەگەڵ غەیری خۆیدا نەبێت دەلالەت ناکاتە سەر مانا.

حەرفەکانی جەڕ: کۆمەڵە حەرفێکن دانراون بۆ گەیاندنی فیعل و شێوە فیعل بە ئیسمێك.

(من) بەکاردێت: ١. بۆ ئیبتیدای غایە.

٢. بۆ تەبیین.

٣. بۆ تەبعیض.

٤. بۆ زیادە.

(الى) بەکاردێت بۆ ئینتیهای غایە، بەمانای (مع)ش بەکەمی، (حتى) بەکاردێت بە مانای (الى)، بە مانای (مع)ش بە زۆری، ناشچێتە سەر ضەمیر. (ف) بەکاردێت بۆ زەرفیەت، و بەمانای (على) دێت بەکەمی.

أَسْئِلَةٌ :

١-عَدِّدْ أَقْسَامَ الحُروفِ.

٢-لأيِّ فَائِدَةٍ وُضِعَتْ حُرُوفَ الجرِّ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-عَدِّدْ مَعانِيَ (مِنْ) مَعَ أَمْثِـلَةٍ.

٤-لأيِّ المَعانِيَ تُسْتَعْمَلُ (إلى)؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٥-أُذكُرْ مَعَانِيَ (حَتَّى) ومَثِّلْ لَها.

٦-هَلْ تَدْخُلُ (حَتّى) عَلى الضَّمائِرِ أَمْ لا؟

٧-ما هِيَ مَعَانِي (فِي)؟ مَثِّلْ لَها.

---

پرسیار:

١. بەشەکانی حەرف بژمێرە.

٢. سودی دانانی حەرفەکانی جەڕ چییە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. ماناکانی (من) بژمێرە بە نموونەوە.

٤. (الى) بۆ چ مانایەك بەکاردێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٥. ماناکانی (حتی) بژمێرە و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٦. ئایا (حتی) دەچێتە سەر ضەمیرەکان یان نا؟

٧. ماناکانی (في) کامانەن؟ نموونەیان بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان

أ- لەم ڕستانەی خوارەوەدا حەرفەکانی جەڕ دەربهێنە و ماناکەیان ڕوون بکەوە:

١-جَاءَ الوَلَدُ مِنَ المَدْرَسَةِ.

٢-احْذَرُوا الشَّرَّ مِنْ أعْمَالِ السُّفَهَاءِ.

٣-اِشْتَرَيْتُ قِسْماً مِنَ المَجَلاَّتِ.

٤-ما شَاهَدْتُ مِنْ أَحَدٍ.

٥-ذَهَبَ سَعِيدٌ إلَىَ الصَّفِّ.

٦-الزُّبْدُ فِي الثَّلاجَةِ.

٧-سَهَرْتُ البَارِحَةَ حَتَّى الصَّبَاحِ.

٨-رَأَيْتُ المُسافِرِينَ حَتّى أَمتِعَتِهِم.

ب-حەرفێکی جەڕی گونجاو بخەرە هەریەك لەم بۆشاییانەوە و ماناکەی ڕوون بکەوە:

١-خَرَجَ سَعِيدٌ............ الصَّفِّ.

٢-أَكْثِرُوا البِرَّ............ إعْطَاءِ المَسَاكِينَ.

٣-سافَرَ خَالِد..... مَكَّةَ.

٤-اشْتَرَيْتُ خَاتَما..... ذَهَبٍ.

٥-قَرَأتُ.... مُنتَصَفِ اللَّيْلِ.

٦-وَضَعْتُ الكُتُب.....المَحفَظَةِ.

٧-رَأَيْتُ خالِداً...... السّاحَةِ.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-قال تعالى:﴿نُسـقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَناً خالِصاً﴾(النحل/ ٦٦)

٢- قال تعالى:﴿أَنْزَلَ مِنْ السَّماءِ مَاءً فَسالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِها﴾(الرعد / ١٧)

٣- قال الشاعرُ:

لا يَسْلَمُ الشّرفُ الرّفِيعُ منَ الأذى حتّى يراقَ على جوانبِهِ الدّمُ

٤-نُجاهِدُ فِي سَبِيل اللّهِ حَتّى آخِرِ قَطْرَةٍ مِنْ دِمائِنا.

٥-الغِنى فِي الغُرْبَةِ وَطَنٌ، والفَقْرُ فِي الوَطَنِ غُرْبَةٌ.

## الدرس الثالث والأربعون
## تَتِمَّةُ حُرُوفِ الجَرِّ

٥- (البَاءُ) وهِيَ:

أ- لِلإلْصاقِ:

حَقِيقَةً ، نَحْوُ: بِهِ دَاءٌ.

أوْ مَجازاً ، نَحْوُ (مَرَرْتُ بِسَعِيدٍ) إذا قَرُبَ مُرُورُكَ مِنْ سَعِيدٍ.

ب- لِلاسْتِعانَةِ ، نَحْوُ (كَتَبْتُ بِالقَلَمِ).

ج- لِلتَّعْدِيَةِ ، نَحْوُ (ذَهَبْتُ بِزَيْدٍ).

د- لِلظَّرْفِيَّةِ ، نَحْوُ (جَلَسْتُ بِالمَسْجِدِ).

هـ- لِلمُصاحَبَةِ ، نَحْوُ (اِشْتَرَيْتُ الفَرَسَ بِسَرْجِهِ).

و- لِلمُقابَلَةِ ، نَحْوُ (بِعْتُ هذا بِهذا).

---

## وانەی چل و سێ:
## پاشماوەی حەرفە جەڕەکان

٥. (باء) ئەمیش دێت بۆ:

أ. ئیلصاق -پێوە نووسان-:

بە حەقیقەت، وەك: (بە داء).

یان بە مەجازی، وەك: (مررت بسعید) ئەگەر تێپەڕبوونەکەت لە سەعیدەوە نزیك بوو.

ب. بۆ ئیستیعانە -کۆمەك-، وەك: (کتبت بالقلم).

ج. بۆ تەعدیە، وەك: (ذهبت بزید).

د. بۆ زەرفیەت، وەك: (جلست بالمسجد).

ه. بۆ موصاحەبە-لەگەڵبوون-، وەك: (اشتریت الفرس بسرجە).

و. بۆ موقابەلە -بەرامبەرکردن-، وەك: (بعت هذا بهذا).

ز- زائِدَةٌ قِياساً فِي الخَبَرِ المَنْفِيِّ ، نَحْوُ (مَا زَيدٌ بقَائِمٍ). وفِي الاسْتِفْهامِ ، نَحْوُ (هَلْ زَيْدٌ بقائِمٍ) ، وسَمَاعاً فِي المَرْفُوعِ ، نَحْوُ (بحَسْبِكَ دِرْهَمٌ) ،كقولـه تعالى: ﴿ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً﴾(الفتح / ٤٨) ، وفِي المَنْصُوبِ ، نَحْوُ (أَلْقَى بِيَدِهِ).

٦- (اللامُ) ، وهِيَ:

أ- لِلاخْتِصَاصِ ، نَحْوُ (الجُلُّ لِلفَرَسِ ، والمالُ لِزَيْدٍ).

ب-لِلتَعْلِيلِ ، نَحْوُ (ضَرَبْتُهُ لِلتَّأْدِيبِ).

ج-زائِدَةٌ كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿قُلْ عَسَى أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ﴾ (النمل/ ٧٢)،أيْ رَدفَكُم.

د-بِمَعْنى ( عَنْ ) إذا اسْتُعْمِلَ مَعَ القَوْلِ كَقَولِهِ تَعالى : ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا

---

ز. بۆ زیادە، ئەمەش قیاسیە لە خەبەری نەفیکراودا، وەك: (مازید بقائم). هەروەها لە ئیستیفهامدا، وەك: (هل زید بقائم)، هەروەها بە سەماعی لە مەرفوعدا، وەك: (بحسبك درهم)، ﴿ وکفی بالله شهیدا﴾ لە مەنصوبیشدا، وەك: (القی بیده). [1]

٦. (لام)، ئەمیش دێت بۆ:

أ. ئیختیصاص -تایبەتکردن- وەك: (الجل للفرس، المال لزید).

ب. تەعلیل -هۆهێنانەوە- وەك: (ضربته للتأدیب).

ج. زیادە، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ ردف لکم﴾ واتە: (ردفکم).

د. بە مانای (عن) ئەگەر لەگەڵ (قول)دا بەکارهات، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿وقال اللذين کفروا للذين آمنوا

---

١ ئەم دەربڕینە هەندێك ئاڵۆزی تێدایە، بەلام مەبەستی نوسەر ئەوەیە کە (باء) زیاد دەکرێت:

أ.بە قیاسی لە خەبەری نەفی کراو و ئیستیفهامدا.

ب. بە سەماعیش زیاد دەکرێت و دەچێتە سەر ناوێکی مەرفوع یان مەنصوب وەك ئەو نموونانەی باسکران.

لَوْ كَانَ خَيْراً مَا سَبَقُونَا إِلَيهِ ﴾(الأحقاف / ٦) وفِيهِ نَظَرٌ.

هـ- بِمَعْنى (الواو) فِي القَسَمِ لِلتَّعَجُّبِ ، نَحْوُ (لِلّهِ لا يُؤَخَّرُ الأَجَلُ).

٧-(رُبَّ)وهِيَ لِلتَّقْلِيلِ[1] كَمَا أَنَّ(كَمْ)الخَبَرِيَّةَ للتَّكْثِير،وتَسْتَحِقُّ(رُبَّ)صَدْرَ الكَلامِ، ولاتَدْخُلُ إلاّ عَلى النَّكِرَةِ، نَحْوُ (رُبَّ رَجُلٍ لَقِيتُهُ) أَوْ مُضمَرٍ مُبْهَمٍ مُفْرَدٍ مُذكَّرٍ مُمَيَّزٍ بنَكِرَةٍ مَنصُوبَةٍ ،

---

لو كان خيراً ماسبقونا إليه﴾ بەڵام ئەمە جێگای تێڕوانینە[2].

هـ. بە مانای (واو) لە سوێندا بۆ تەعەجوب، وەك: (لله لا يؤخر الأجل).

٧.(ربَ) بۆ تەقليل -کەمکردنەوە- دێت، هەر چۆن (کم)ی خەبەری بۆ زۆرکردن دێت.(ربَ) شايەنی سەرەتای ڕستەيە، ناچێتەسەر شتێك جگە لە نەکيرە، وەك:(ربَ رجل لقيته)، يان جگە لە ضەميرێکی موبهەمی[3]-ناڕوون- موفرەدی موزەکەر کە تەمييزی نەکيرەی مەنصوبی هەبێت ،

---

١ - واستعملت في معنى التكثير حتى صارت في معنى التكثير كالحقيقة وفي التقليل كالمجاز المحتاج إلى القرينة .

٢ ئەو هۆيەی کە وای کردوە مانای (ل) بە (عن) بکرێت ئەوەيە کە لە ئايەتە پيرۆزەکەدا هاتووە کە بێباوەڕان دەڵێن ئەگەر ئەوە -مەبەست ئيمانە- خەير بوايە (ئەوان) پێش ئێمە نەدەکەوتن لە دەستکەوتنيدا. جا ئەگەر (ل) بە مانای ئيختيصاص بێت ئەو کاتە دەيانگوت (ما سبقتمونا) واتە:(ئێوە) پێش ئێمە نەدەکەوتن، بەڵام کاتێك فەرموويەتی (ئەوان) پێش ئێمە نەدەکەوتن، کەواتە دەبێت قسەکەی يەکەمجار ڕووبەڕووی باوەڕداران نەگوترابێت بەڵکو سەبارەت بەوان گوترابێت و گفتوگۆکە لە نێوان بێباوەڕان خۆياندا بووبێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت (ل)ەکە بە مانای(عن) بێت ئەو کاتە مانای ئايەتەکە دەبێتە: بێباوەڕان (لەبارەی) باوەڕدارانەوە دەڵێن .... هتد.

بەڵام پێويست ناکات لە مانای ئەصڵی (ل) لابدەين -وەك نووسەر گوتوويەتی-، چونکە دەگونجێت بێباوەڕان ئەو گفتوگۆيەيان لەگەڵ هەندێ باوەڕدارانـدا کردبێت بۆ ئەوەی پەشيمانيان بکەنەوە و ئامـاژەيان بۆ هەندێکی تريان -بەتايبەت هەژارەکان- کردبێت.

٣ موبهەم بوونی ئەم ضەميرە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو کەسەی بەکاری دەهێنێت مەبەستی لە کەسێکی دياريکراو نيە، بۆ نموونە لەکاتێکدا دەڵێت:(ربه رجلا) کە شتێك ببينێت و گومانی هەبێت لەوەی کە پياوە يان شتێکی ترە، بۆيە دەڵێت: پێدەچێت ئەو شتە پياو بێت.

نَحْوُ (رُبَّهُ رَجُلاً ، ورُبَّهُ رَجُلَيْنِ ، ورُبَّهُ امـرَأَةً ، ورُبَّـهُ امْـرَأَتَيْنِ) ، وعِنْـدَ الكُـوفِيِّيْنَ تَجِـبُ المُطَابَقَةُ ، نَحْوُ (رُبَّهُما رَجُلَيْنِ ، ورُبَّهُمَا امْرَأَتَيْنِ).

وقَدْ تَلْحَقُها (ما) الكَافَّةُ فَتَكُفُّها عَنِ العَمَلِ ، وتَدْخُلُ عَلى الجُمْـلَةِ ، نَحْوُ (رُبَّما قَامَ زَيـدٌ ، ورُبَّما زَيْدٌ قائِمٌ)

ولابُدَّ لَها مِنْ فِعْلٍ مَاضٍ ، لأنَّ التَّقْلِيلَ يَتَحقَّقُ فِيهِ ، ويُحْذَفُ ذلِك الفِعْلُ غالِبـاً ، كَقَوْلِـهِ (رُبَّ رَجُلٍ أَكْرَمَنِي) فِي جَوابِ مَـنْ قَـالَ (هَـلْ رَأَيْـتَ مَـنْ أَكْرَمَـكَ؟) ، أيْ (رُبَّ رَجُـلٍ أَكْرَمَنِي لَقِيتُهُ) ، فإنَّ (أَكرَمَنِي) صِفَةٌ لـ (رَجُلٍ) و (لَقِيتُ) فِعْلُها وهُوَ مَحذوفٌ.

**الخُلاصَةُ:**

تُستَعْمَلُ (البَاءُ) فِي المَعانِي التَّالِيَةِ:

١-الإلصاقُ. ٢-الاسْتِعانَةُ. ٣-التَّعدِيَةُ. ٤-الظَّرْفِيَّةُ. ٥-المُصاحَبَةُ. ٦-المُقابَلَةُ. ٧-زَائِدَةً.

---

وەك: (ربه رجلا، ربه رجلين، ربه امراة، ربه امراتين)، لێرەدا بەلای کوفیەکانەوە پێویستە موتابیق بن، وەك: (ربهما رجلين، ربهما امراتين).

هەندێ جار (ما)ی کافەی پێوە دەنووسێت و لەکاری دەخات، و ئەوکات دەچێتە سەر ڕستە، وەك: (ربما قام زيد، ربما زيد قائم).

پێویستیشی بە فیعلێکی ماضی هەیە، چونکە لەودا کەمکردنەوە دێتەدی، زۆربەی جاریش ئەو فیعلە حەزف دەکرێت، وەك: (رب رجل اكرمني) لە وەڵامی کەسێکدا کە دەڵێت: (هل رايت من اكرمك؟) -واتە: ئایا کەسێکت دیوە ڕێزی لێنابێت؟-، واتەی وەڵامەکە بریتیە لە: (رب رجل اكرمني لقيته)، لێرەدا (اكرمني) صیفەتە بۆ (رجل)، و (لقيت) فیعلەکەیەتی کە حەزف کراوە.

**پوختە**

(باء) بەکاردێت لەم مانایانەی خوارەوەدا:

١.ئیلصاق. ٢. ئیستیعانە. ٣. تەعدیە. ٤. زەرفیەت. ٥. موصاحەبە. ٦. موقابەلە. ٧. زیادە.

وتُستَعْمَلُ (اللّامُ) فِي المَعانِي التّالِيَةِ:

١- الاختِصاصُ. ٢- التَّعْلِيلُ. ٣- بِمَعْنى (عَنْ) ٤- بِمَعْنى(واوِ)القِسَمِ مَعَ التَّعَجُّبِ. ٥- زَائِدَةً.

وَتُستَعمَلُ (رُبَّ) لِلتَّقْلِيلِ ، ولا تَدْخُلُ إلاّ عَلى النَّكِرَةِ ، أوْ ضَميرٍ مُبْهَمٍ مُفرَدٍ مُذَكَّرٍ مُمَيَّزٍ بِنَكِرَةٍ مَنصُوبَةٍ ، وقدْ تَلْحَقُها (ما) الكافَّةُ فَتَكُفُّها عَنِ العَمَلِ ، وتَجْعَلُها صَالِحَةً لِلدُّخُولِ عَلى الجُمْلَةِ.

## أسئلة:

١-عَدِّدْ مَعانِيَ الباءِ ، ومَثِّلْ لَها.

٢-أُذكُرْ أقْسامَ الإلصاقِ ومَثِّلْ لَها.

٣-مَتَى تُزادُ الباءُ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٤- أُذكُرْ مَعانِيَ اللاّمِ ومَثِّلْ لَها.

---

(لام)یش بۆ ئەم مانایانە بەکاردێت:

١. ئیختیصاص. ٢. تەعلیل. ٣. بەمانای(عن). ٤. بەمانای(واو)ی سوێند بۆ تەعەجوب. ٥. زیادە.

(رب)ش بەکاردێت بۆ تەقلیل، تەنها سەر نەکیرە دەچێت، یان سەر ضەمیرێکی موبهەمی موفرەدی موزەکەر کە تەمییزەکەی نەکیرەیەکی مەنصوب بێت، هەندێ جاریش (ما)ی کاففەی دەچێتە سەر و لە عەمەلی دەخات، و دەیکاتە ئەوەی کەڵکی هەبێت بچێتە سەر ڕستە.

## پرسیار:

١. ماناکانی (باء) بژمێرە، و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٢. بەشەکانی ئیلصاق بڵێ، و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٣. کەی (باء) زیاد دەکرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. ماناکانی لام بژمێرە و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٥- عَلامَ تَدْخُلُ (رُبَّ)؟ مَثِّلْ لِذلِك بِجُمَلٍ مُفِيدَةٍ.

٦- لِأيِّ مَعْنَى تُسْتَعْمَلُ (رُبَّ)؟ مَثِّلْ لَهَا.

٧- مَتَى تَدْخُلُ (رُبَّ) عَلى الجُمْلَةِ؟ ومَا شَرْطُ تِلْكَ الجُمْلَةِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ مُفِيـدَةٍ.

---

٥. (ربّ ) دەچێتە سەر چی؟ بە ڕستەیەکی بەسوود نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. (ربّ) بۆ چ مانایەك بەکاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٧. کەی (ربّ) دەچێتە سەر ڕستە؟ مەرجی ئەو ڕستەیە چییە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

## ڕاهێنان:

أ- حەرفەکان دیاری بکە، و ماناکانیان لەم ڕستانەدا دیاری بکە:

١- وَجَدْتُ الرَّجُلَ بِقَلْبِهِ رَحْمَةٌ.

٢- ذَكَرْتُ بِمَجِيئِكَ الكَرَمَ.

٣- قَرَأتُ بِضَوْءِ الفانُوسِ.

٤- رَجَعْتُ بِسَعِيدٍ.

٥- اِشْتَرَيْتُ الدّارَ بِأَفْرِشَتِها.

٦- قال تعالى:﴿و كَفَى بِاللّهِ حَسِيباً ﴾(النساء / ٦).

٧- هَلْ سَعِيدٌ بِراكِبٍ؟.

٨- قال تعالى:﴿ الحَمْدُ للهِ ربِّ العالَمِينَ ﴾(الفاتحة / ١).

٩- أعْطَيْتُهُ الكِتابَ لِلأمانَةِ.

١٠- لِلّهِ ماذا فَعَلْتَ !

١١- رُبَّ أَكْلَةٍ مَنَعَتْ أَكَلاتٍ.

١٢- اَلْكَرِيمُ أعْطى لَكَ هذا.

ب- وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەرەوە:

١- سێ ڕستە بهێنەوە کە تێیاندا (باء) بە مانای ئیلصاق و تەعدیە و زیادە بێت.

٢- سێ ڕستە دروست بکە کە (لام) تێیاندا بە مانای ئیختیصاص و تەعلیل وبە مانای (عن) بێت.

٣- ڕستەیەك بێنەوە کە (رب) تێیدا ڕۆشتبێتە سەر ڕستە.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- (بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ).

٢- قال تعالى:﴿ لِمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ، لِلّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴾(غافر / ١٦).

٣- قال تعالى:﴿ سُبْحَانَ الّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً... ﴾(الإسراء / ١).

٤- رُبَّ أَخٍ لَكَ لَمْ تَلِدْهُ أُمُّكَ.

## الدرس الرابع والأربعون

## بَقِيَّةُ حُرُوفِ الجَرِّ

٨- واوُ (رُبَّ) وهِيَ الواوُ الَّتِي يُبْتَدَأُ بها فِي أَوَّلِ الكَلامِ ، كَقَوْلِ الشّاعِرِ:

وبَلْدَةٍ لَيْسَ بِها أَنِيسُ　　　　إلاّ اليَعَافِيرُ وإلاّ العِيسُ [1]

٩- (واوُ) القَسَمِ ، وهِيَ مُخْتَصَّةٌ بِالاسْمِ الظّاهِرِ ، ولا تَدْخُلُ عَلى الضَّمِيرِ ، فَلا يُقالُ (وَكَ) ويُقالُ (واللّهِ ، والشَّمْسِ).

١٠- (تَاءُ) القَسَمِ ، وهِيَ مُخْتَصَّةٌ بِلَفْظِ الجَلالَةِ (اللّه) وحْدَهُ ، فَلا يُقالُ (تَالرَّحْمنِ) وقَوْلُهُمْ (تَرَبِّ الكَعْبَةِ) شاذٌّ.

١١- (باءُ) القَسَمِ ، وهِيَ تَدْخُلُ عَلَى الظّاهِرِ والمُضْمَرِ ، نَحْوُ (بِاللّهِ وبِالرَّحْمنِ ، وبِكَ).

---

## وانەی چل و چوار

## پاشماوەی حەرفەکانی جەڕ

٨. واوی (ربّ)، ئەویش ئەو واوەیە کە قسەی پێ دەستپێدەکرێت لە سەرەتای ڕستەوە[2]، وەك گووتەی شاعیر:

وبلدة ليس فيها أنيس　　إلا اليعافير وإلا العيس

٩. واوی سوێند، ئەمیش تایبەتە بە ئیسمی ئاشکراوە، و ناچێتە سەر ضەمیر، ناوترێت: (وَ كَ)، بەڵام دەگوترێت: (والله، والشمس).

١٠. تاءی سوێند، ئەمیش تایبەتە تەنها بە ناوی خوای مەزنەوە کە(الله)یە، ناوترێت: (تالرحمن)، بەڵام گووتەی عەرەب کە دەڵێن: (تربِّ الكعبة) ئەوە شازە.

١١. باءی سوێند، ئەمەیان دەچێتە سەر ئیسمی ئاشکراو ضەمیریش، وەك: (بالله، بالرحمن، بك).

---

١ -الواوُ بِمَعْنى(رُبَّ) و (بَلْدَةٍ) مَجْرورٌ بِها، والجُمْلةُ صِفَةٌ لَها ، والأنيس بمعنى الوَحْشَةِ. و (اليَعافِيرُ) جَمْعُ يَعفورٍ ، وَلَدُ البَقَرِ الوَحْشِيَةِ ، و(العِيسُ) بكسر العين (عَيْساءَ) وهِيَ (الإبِلُ البِيضُ) حَلَطَ بَياضَها شُقْرَةٌ.

٢ وا بزانم لە کوردیدا شتێکمان نیە هاوشێوەی ئەم واوە بێت، بەڵام دەکرێت بە ووشەی : (واپێدەچێت) مانای بکەین.

وَلابُدَّ لِلقَسَمِ مِنْ جَوابٍ أوْ جَزاءٍ ، وهِيَ الجُمْلَةُ الّتِي يُقْسَمُ عَلَيْهـا ، فَـإنْ كَانَـتْ مُوجَبَـةً يَجِبُ دُخُولُ اللاّمِ فِي الاسْمِيَّةِ والفِعْلِيَّةِ ، نَحْوُ (وَاللّهِ لَزَيْدٌ عَادِلٌ ، و واللّهِ لأفعَلَـنَّ كَـذا) كَما يَأتِي (إنَّ) فِي الجُمْلَةِ الاسْمِيَّةِ المُجابِ بِها القَسَمُ نَحْوُ (واللّهِ إنَّ زَيْداً لَعادِلٌ).

وَإنْ كانَتْ مَنفِيّةً يَجِبُ دُخُولُ (ما) أوْ (لا) عَلَيْها ، نَحْوُ (وَاللّهِ ما زَيْـدٌ عـادِلٌ ، وَاللّـهِ لا يَقُومُ زَيْدٌ). وَقَدْ يُحْذَفُ حَرْفُ النَّفْيِ لِوُجُودِ القَرِينَةِ ، كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿قَالُواْ تَاللهِ تَفتَأُ تَـذْكُرُ يُوسُفَ ﴾ (٨٥) سورة يوسف ، أيْ لا تَفْتَأُ.

وقَدْ يُحْذَفُ جَوابُ القَسَمِ إنْ تَقَدَّمَ ما يَدُلُّ عَلَيْهِ ، نَحْوُ (زَيْدٌ عَادِلٌ وَاللّهِ) ، أوْ تَوَسَّطَ القَسَمُ بَيْنَ جُزْأَيْ الجَوابِ ، نَحْوُ (زَيْدٌ واللّهِ عَادِلٌ).

١٢- (عَنْ) وهِيَ للمُجاوَزَةِ ، نَحْوُ (رَمَيْتُ السَّهْمَ عَنِ القَوسِ).

١٣- (عَلى) وهِيَ للاستِعْلاءِ ، نَحْوُ (زَيْدٌ عَلى السَّطْحِ).

---

سوێندیش پێویستە وەڵام یان جەزای هەبێت، کە ئەویش ئەو ڕستەیەیە کە سوێندەکەی لەسەر خوراوە، خۆ ئەگەر ئەو ڕستەیە موجەب بوو ئەوە پێویستە (لام)ی بچێتە سەر چ ڕستەی ئیسمی بێت چ فیعلی، وەك: (والله لزيد عادل، والله لأفعلنَ كذا)، هەر وەك چۆن (إنّ) لە ڕستەی ئیسمی دا دێت لە وەڵامی سوێنددا، وەك: (والله إنَ زيداً لعادل).

خۆ ئەگەر ڕستەکەمان نەفیکراو بوو ئەوە پێویستە (ما) یان (لا) بچێتە سەری، وەك: (والله مازيد عادل، والله لا يقوم زيد). هەندێ جاریش حەرفی نەفیەکە حەزف دەکرێت ئەگەر قەرینە هەبێت لەسەری، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ تالله تفتأ تذكر يوسف﴾. واتە: (لا تفتا).

هەندێ جاریش وەڵامی سوێندەکە حەزف دەکرێت ئەگەر شتێك لە قسەکەدا پێش کەوتبێت کە ببێتە بەڵگە لەسەری، وەك: (زيد عادل والله)، یان ئەگەر سوێندەکە کەوتە نێوان هەردوو بەشی وەڵامەکەیەوە، وەك: (زيد والله عادل).

١٢. (عن) ئەمیش بۆ موجاوەزە -تێپەڕبوون- بەکاردێت، وەك: (رميت السهم عن القوس).

١٣. (على) ئەمیش بۆ ئیستیعلاء -لەسەرەوە بوون- بەکاردێت، وەك: (زيْد على السطح).

وقَدْ يَكُونُ(عَنْ وعَلى) اسْمَيْنِ، وذلِكَ إذا دَخَلَ عَلَيْهِما(مِنْ)، فَيَكونُ (عَنْ) بِمَعْنى الجانِبِ، مِثْلُ (جَلَسْتُ مِنْ عَنْ يَمِينِهِ). ويَكُونُ (عَلى) بِمَعْنى فَوْقَ، مِثْلُ (نَزَلْتُ مِنْ عَلى الفَرَسِ).

١٤- (الكافُ) وهِيَ لِلتَّشْبِيهِ ، نَحْوُ (زَيْدٌ كَعَمْرٍو) ، وزائِدَةٌ ، كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيءٌ ﴾(الشورى / ١١).

وقَدْ يَكُونُ اسماً كَقَوْلِ الشّاعِرِ:

يَضْحَكْنَ عَنْ كَالبَرَدِ المُنْهَمِّ    تَحْتَ عَواصِيفِ الأُنوفِ الشُّمِّ [١]

١٥- ١٦- (مُذْ ومُنْذُ) وهُمَا لِابْتِداءِ الزَّمانِ فِي الماضِي ، كَما تَقُولُ فِي شَعْبانَ (ما رَأَيْتُهُ مُذْ رَجَبٍ).

---

هەندێ جار (عن) و (على) بە نیسم دێن، ئەمیش ئەگەر بەدوای (من)دا هاتن، ئەوکاتە (عن) بەمانای تەنیشت دێت، وەك: (جلست من عن يمينه)، هەروەها (على) بەمانای سەر دێت، وەك: (نزلت من على الفرس).

١٤. کاف، ئەمیش بۆ تەشبیه بەکاردێت، وەك: (زيد كعمرو)، بە زیادەش دێت، وەك: ﴿ ليس كمثله شيء﴾ [٢] .

هەندێ جار دەشێت نیسم بێت، وەك گووتەی شاعیر:

يضحكن عن كالبرد المنهمّ    تحت عواصيف الأنوف الشمّ

١٥، ١٦ (مذ، منذ) ئەمانیش بۆ دەستپێکردنی کاتی ماضي دەبن، وەك ئەوەی دەڵێیت: (مارأيته مذ رجب).

---

١ - هو لِعَبْدِ اللهِ بن رُؤْبة التميمي، و(يَضْحَكْنَ) خَبَرٌ لِمُبْتَدأٍ تقدَّمَ في البيتِ الَّذي قَبْلَهُ، و(البَرَد) كـ( فَرَسٍ) ، الثلجُ المتساقِطُ من الغمامِ و ( المُنْهَمُّ ) الذائِبُ ، ومعناهُ أنَّ أُلئكَ النسوةَ يَضْحَكْنَ عَنْ أسنانٍ كالبَرَدِ الذائِبِ في اللطافةِ والنظافةِ . والشاهِدُ فيهِ الكافُ في قولِهِ ( كالبَرَدِ ) حَيْثُ وقَعَتْ اسماً بمعنى ( مِثْلِ ) قد أُضيفَتْ إلى ما بعدَها .

٢ واتە: (ليس مثله شيء)، بەڵام ئەمە بینا لەسەر ئەوە کراوە کە (مثله) ئەداتی تەشبیهە و ئەو کاتە کافەکە بە زیادە دەرچووە، بەڵام ئەم نایەتە زانایان قسەی تریان لەسەر کردووە کە ئێرە جێگای نیە.

ولِلظَّرْفِيَّةِ فِي الحاضِرِ ، نَحْوُ (ما رَأَيْتُهُ مُذْ شَهْرِنا ، ومُنْذُ يَوْمِنا) ، أَيْ فِي شَهْرِنا وفِي يَوْمِنا.

١٧- ١٨- ١٩- (حَاشَا وعَدا وخَلا) وهِيَ للاسْتِثْناءِ ، نَحْوُ (جاءَنِي القومُ خَلا زَيْـدٍ ، وعَدا عَمْرٍو ، وحَاشا شاكِرٍ).

## الخُلاصَةُ:

بَقِيَّةُ حُرُوفِ الجَرِّ

واوُ (رُبَّ) وتُسْتَعْمَلُ فِي أَوَّلِ الكَلامِ بِمَعْنى (رُبَّ).

(واوُ) القَسَمِ ، وتُسْتَعْمَلُ لِلقَسَمِ ، وتَخْتَصُّ بِالاسْمِ الظَّاهِرِ ، ولا تَدْخُلُ عَلى الضَّمِيرِ.

(تاءُ) القَسَمِ وتُسْتَعْمَلُ لِلقَسَمِ ، وهِيَ مُخْتَصَّةٌ بِلَفْظِ الجَلالَةِ (اَللّه).

(باءُ) القَسَمِ وتُسْتَعْمَلُ لِلقَسَمِ ، وهِيَ تَدْخُلُ عَلى الاسْمِ الظَّاهِرِ والضَّمِيرِ.

(عَنْ) تُسْتَعْمَلُ للمُجاوَزَةِ ، وبِمَعْنى الجَانِبِ إذا دَخَلَتْ عَلَيْها (مِنْ).

(عَلى) تُسْتَعْمَلُ للإستعلاء، وبمعنى فوق إذا دخلت عليها (من).

---

هەروەها بۆ زەرفیەتی ئێستا، وەك: (ما رايته مذ شهرنا، و منذ يومنا)، واتە: (في شهرنا) و (في يومنا).

١٧، ١٨، ١٩. (حاشا، عدا، خلا)، ئەمانیش بۆ ئیستیسنا -جیاکردنەوە- دەبن، وەك: (جاءني القوم خلا زيد، و عدا عمرو، و حاشا شاكر).

## پوختە

پاشماوەی حەرفەکانی جەڕ:

واوی (ربّ)لەسەرەتای قسەوە بەکاردێت بەمانای (ربّ).

واوی قەسەم، بەکاردێت بۆ سوێند، تایبەتە بە ئیسمی ئاشکراوە، ناشچێتە سەر ضەمیر.

تاءی سوێند، بەکاردێت بۆ سوێند، تایبەتە بە ووشەی ناوی خوای مەزنەوە(الله).

باءی سوێند بەکاردێت بۆ سوێند، دەچێتە سەر ئیسمی ئاشکراو ضەمیر.

(عن) بەکاردێت بۆ موجاوەزە، ئەگەریش (من) چووە سەری بەمانای تەنیشت دێت.

(على) بەکاردێت بۆ ئیستیعلا، بەمانای سەریش دێت ئەگەر (من)ی چووە سەر.

(الكاف) تُسْتَعْمَلُ لِلتَّشْبِيهِ ، وزَائِدةً.

(مُذْ ومُنْذُ) تُسْتَعْمَلانِ لِابْتِداءِ الزَّمانِ فِي الماضِي.

(حَاشا وعَدا وخَلا) تُسْتَعْمَلُ للاسْتِثْناءِ.

## أسْئِلَة :

١- مَا هِيَ واوُ (رُبَّ)؟ مَثِّلْ لَها.

٢- بِماذا تَخْتَصُّ واوُ القَسَمِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٣- بِمَ تَخْتَصُّ (تاءُ القَسَمِ)؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٤- عَلامَ تَدْخُلُ (بَاءُ القَسَمِ)؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٥- ماذا يَجِيءُ بَعْدَ القَسَمِ؟ وماذا يُسَمَّى؟ اِشْرَحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٦- مَتى تَدْخُلُ الَّلامُ عَلى جُملَةِ القَسَمِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٧- مَتَى يَجِبُ دُخُولُ (مَا) و (لا) عَلى جُمْلَةِ القَسَمِ؟ اُذكُرْ ذلِك ومَثِّلْ لَهُ.

---

(كاف) بەکاردێت بۆ تەشبیه -لێکچواندن-، و بەزیادەش دێت.

(مذ، منذ) بەکاردێن بۆ دەستپێکردنی کاتی ماضی.

(حاشا، عدا، خلا) بەکاردێت بۆ ئیستیسنا.

## پرسیار:

١. واوی (رب) چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. واوی سوێند تایبەتە بە چی؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. تاءی سوێند تایبەتە بە چی؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. باءی سوێند دەچێتە سەر چی؟ نموونە بۆ ئەمە بێنەوە.

٥. لە دوای سوێندەوە چی دێت؟ پێی دەووترێت چی؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٦. کەی لام دەچێتە سەر ڕستەی سوێند؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٧. کەی پێویستە (ما) و (لا) بچێتە سەر ڕستەی سوێند؟ ئەمە باس بکەو نموونەی بۆ بێنەوە.

٨- هَلْ يُحْذَفُ جَوابُ القَسَمِ؟ ومَتَى؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٩- مَا هُوَ مَعْنَى (عَنْ)؟ هَاتِ مِثَالاً عَلى ذلِك.

١٠- لِأيِّ مَعْنىً تُستَعْمَلُ (عَلى)؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثال.

١١- مَتى يَكُونُ (عَنْ ، وعَلى) اسْمَيْنِ؟ بَيِّنْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

١٢- لِأيِّ مَعْنىً تُستَعْمَلُ (الكافُ)؟ مَثِّلْ لِذلِك.

١٣- لِأيِّ مَعْنىً تُستَعْمَلُ (مُذْ ، ومُنْذُ)؟ هَاتِ أَمْثِلَةً عَلى ذلِك.

١٤- لِأيِّ شَيءٍ تُستَعْمَلُ (حَاشَا وعَدا)؟ مَثِّلْ لَهُما.

---

٨. ئایا وەڵامی سوێند حەزف دەكرێت؟ كەی؟ نموونە بۆ ئەمە بێنەوە.

٩. مانای (عن) چیە؟ نموونەیەكی بۆ بێنەوە.

١٠. (علی) بۆ چ مانایەك بەكاردێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.

١١. كەی (عن) و (علی) ئیسم دەبن؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.

١٢. كاف بۆ چ مانایەك بەكاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٣. (مذ) و (منذ) بۆ چ مانایەك بەكاردێن؟ نموونە بۆ ئەمە بێنەوە.

١٤. (حاشا) و (عدا) بۆ چ مانایەك بەكاردێن؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ- حەرفەکان دەربهێنەو ماناکانیان ڕوون بکەوە لەم ڕستانەی خوارەوەدا:

١- قال تعالى: ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا﴾(الشمس/١).

٢- قال تعالى: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾(التين/١).

٣- تَاللهِ لَأَنْصُرَنَّكَ.

٤- باللهِ عَلَيْكَ لا تَقُلْ هذا.

٥- بأبيكَ هَلْ هذا صَحِيحٌ؟

٦- بأَخِيكَ لَسْتُ بنَادِمٍ.

٧- أبعَدتُ الشَّرَّ عَنِ الرَّجُلِ.

٨- اَلْكِتَابُ عَلى الْمَنْضَدَةِ.

٩- وَقَفْتُ مِنْ عَنْ يَسارِهِ.

١٠- أَبْعَثُ إلَيْكَ سَلامِي مِنْ عَلى هَضَبَاتِ تُرْكِيا.

١١- سَعِيدٌ كَالْأَسَدِ.

١٢- مَا تَكَلَّمْتُ مَعَهُ مُذْ شَهْرٍ.

١٣- لَمْ أَرَهُ مُنْذُ سَنَتَيْنِ.

١٤- جاءَ الأولادُ حَاشَا خَالِدٍ.

١٥- رَأَيْتُ الطلاّبَ عَدا سَعِيدٍ.

ب- وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەرەوە:

١-لە ڕستەیەکی بە سووددا بە واو و تاء و باء سوێند بخۆ.

٢-دوو ڕستە بێنەوە کە (على) تێیاندا بـە مانـای ئیستیعلا، و سـەر، ببەخشێت، هەروەها دوو ڕستەش بێنەوە کە تێیاندا (عن) بە مانای موجاوەزە و تەنیشت بێت

٣-بە هۆی کافەوە تەشبیهێك دروست بکە لە ڕستەیەکی بەسووددا.

٤-دوو ڕستە بێنەوە کە تێیاندا (مُذ) و(مُنذ) بە مانای زەرفیەت بێت.

٥- بە هۆی (حاشا) و(عدا)وە ئیستیسنا دروست بکە لە ڕستەیەکی بەسووددا.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى ﴾(الضحى / ١- ٢).

٢-فُزْتُ وَرَبِّ الكَعْبَةِ [١]

٣- قال تعالى: ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾(المؤمنون / ٢٢).

٤- مَا رَأَيْتُهُ مُذْ يَوْمَيْنِ.

٥- اِسْتَغْفِرْ لَهُم عَدَا الْمُنَافِقِينَ.

---

١ - روى البخاري برقم( ٢٨٠١ ) عَن أنسٍ - رضى الله عنه - قالَ بَعَثَ النَّبىُّ - صلى الله عليه وسلم - أقوامًا من بَنى سُلَيمٍ إلى بَنى عامرٍ فى سَبعينَ ، فلمَّا قدِموا ، قالَ لهُمْ خالى أتقدَّمُكُمْ ، فإن أمَّنونى حتى أبلِّغَهُمْ عَن رَسولِ اللهِ - صلى الله عليه وسلم - وإلا كُنتُمْ مِنى قريبًا . فتقدَّمَ ، فأمَّنوه ، فبَينَما يُحدِّثُهُمْ عَنِ النَّبىِّ - صلى الله عليه وسلم - إذْ أوْمَئوا إلى رَجُلٍ مِنهُمْ ، فطعنَهُ فأنفذَه فقالَ اللهُ أكبَرُ ، فُزتُ ورَبِّ الكَعبَةِ . ثمَّ مالوا على بَقيَّةِ أصحابِهِ فقتلوهُمْ ، إلا رَجُلاً أعرَجَ صَعِدَ الجَبَلَ .

## الدرس الخامس والأربعون

## الحُرُوفُ المُشَبَّهَةُ بِالفِعْلِ

الحُرُوفُ المُشَبَّهَةُ بِالفِعْلِ: حُرُوفٌ تَدْخُلُ عَلى الجُمْلَةِ الاسْمِيَّةِ ، فَتَنْصِبُ الاسْمَ وتَرْفَعُ الخَبَرَ كَمَا عَرَفْتَ ، وهِيَ سِتَّةٌ: إنَّ ، وأنَّ ، وكَأنَّ ، ولَيْتَ ، وَلكنَّ ، ولَعَلَّ.

وقَدْ تَلْحَقُها(ما)الكافَةُ فَتَكُفُّها عَنِ العَمَلِ،وحينَئِذٍ تَدْخُلُ عَلى الأفْعَال،تَقُولُ(إنّما قَامَ زَيْدٌ).

وَاعْلَمْ أَنَّ (إنَّ) المَكسورةَ لا تُغَيِّرُ مَعْنى الجُمْلَةِ بَلْ تُؤَكِّدُها.

و (أَنَّ) المَفْتُوحَةَ مَعَ الاسْمِ والخَبَرِ ، فِي حُكْمِ المُفْرَدِ ، ولِذلِك يَجِبُ كَسْرُ (إنَّ) فِيما يَأتِي:

١-إذا كَانَتْ فِي ابْتِداءِ الكَلامِ ، نَحْوُ (إنَّ زَيداً قَائِمٌ).

---

## وانەی چل و پێنج

## حەرفە موشەببەهـ بە فیعلەکان [1]

حەرفە موشەببەهـ بە فیعلەکان: کۆمەڵە حەرفێکن دەچنە سەر ڕستەی ئیسمی، ئیسمەکە مەنصوب دەکەن و خەبەرەکە مەرفوع دەکەن هەروەك پێشتر زانیت، ئەوانیش شەشن: ان، أن، کأن، لیت، لکن، لعلّ.

هەندێ جار (ما)ی کافەیان پێوە دەنوسێت و لە عەمەلیان دەخات، ئەو کات دەچنە سەر فیعل، دەڵێیت: (إنّما قام زید).

بزانە کە (إن)ی مەکسور مانای ڕستە ناگۆڕێت بەڵکو تەئکیدی ماناکەی دەکاتەوە. و (أن)ی مەفتوحیش لەگەڵ ئیسم و خەبەرەکەیدا، لە حوکمی ئیسمێکی موفرەدذان، هەر لەبەر ئەوەیە کە پێویستە (إن) لەم جوملانەدا کەسرەی بدرێتێ[2]:

١. ئەگەر لەسەرەتای ڕستەدا بوو، وەك: (إن زیدا قائم).

---

١ لە ڕێزمانی کوردیدا لە شێوەی کاردا نین بەڵکو لە شێوەی ئامرازی لێکدەردا دێن.

٢ چونکە ئەگەر لەگەڵ ئیسم و خەبەرەکەیدا جوە تەئویلی مەصدەرەوە، ئەو کات لە حوکمی ئیسمێکی موفرەددایە و پێویستە محەلی ئیعرابی هەبێت وەك هەر ئیسمێکی موفرەد، بۆیە لە هەر جێگایەك ئەدەکرا ئیسمی موفرەد بچێتە جێگاکەیەوە ئەوە دروست نیە مەفتوح بکرێت.

٢ -بَعْدَ القَولِ ، كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ ﴾(البقرة / ٦٨ ، ٦٩ ، ٧١).

٣ -بَعْدَ المَوْصُولِ نَحْوُ:(جَاءَ الّذي إنَّهُ مُجتَهِدٌ ).

٤-إذا كَانَتْ فِي خَبَرِها الّلامُ ، نَحْوُ:(إنَّ زَيداً لقَائِمٌ).

ويَجِبُ فَتْحُ هَمْزَةِ (إنَّ) فِيما يَأتِي:

١-إذا وَقَعَتْ فَاعِلاً [1] ، نَحْوُ (بَلَغَنِي أَنَّ زَيْداً عَالِمٌ).

٢-إذا وَقَعَتْ مَفْعُولاً ، نَحْوُ (كَرِهْتُ أنَّكَ قائِمٌ).

٣-إذا وَقَعَتْ مُضَافاً إلَيهِ ، نَحْوُ (أَعْجَبَنِي اشْتِهارُ أنَّكَ فَاضِلٌ).

٤-إذا وَقَعَتْ مُبْتَدأً نَحْوُ (عِنْدِي أنَّكَ قَائِمٌ).

٥-إذا وَقَعَتْ مَجْرُورَةً ، نَحْوُ (عَجِبْتُ مِنْ أنَّ زَيْداً قائِمٌ).

---

٢. دوابەدوای (قول)، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ﴾ .

٣. پاش ئیسمی مەوصول، وەك: (جاء الذي إنه مجتهد).

٤. ئەگەر لە خەبەرەكەیدا لام[2] هەبوو، وەك: (إن زيدا لقائم).

هەروەها پێویستە هەمزەی (ان) فەتحەی بدرێتێ لەم شوێنانەی خوارەوەدا:

١. ئەگەر فاعیل بوو، وەك: (بلغني ان زيدا عالم).

٢. ئەگەر مەفعول بوو، وەك: (كرهت انك قائم).

٣. ئەگەر موزاف ئیلەیهی بوو، وەك: (اعجبني اشتهار انك فاضل).

٤. ئەگەر موبتەدا بوو، وەك: (عندي انك قائم).

٥. ئەگەر مەجرور بوو، وەك: (عجبت من ان زيدا قائم).

---

١ - المقصود من ( فاعلا ) هو المصدر المؤول من ( ان ومعموليها ) في محل رفع فاعل ، وكذلك المفعول وغيره .

٢ مەبەست لامی ئیبتیدایە.

٦-بَعْدَ (لَوْ) ، نَحْوُ (لَوْ أَنَّكَ عِنْدَنا لأَخْدِمُكَ).

٧-بَعْدَ (لَوْلا) ، نَحْوُ (لَوْلا أَنَّهُ حاضِرٌ لَأَعْلَمْتُكَ).

ويَجُوزُ العَطْفُ عَلى اسْمِ (إنَّ) المَكْسُورَةِ بالرَّفْعِ والنَّصْبِ ، بِاعتِبارِ المَحَلِّ واللَّفْظِ ، نَحْوُ (إنَّ سَعِيْداً صَائِمٌ ، وجَعْفَرٌ ، وجَعْفَراً).

## الخُلاصَةُ:

الحُرُوفُ المُشَبَّهَةُ بِالفِعْلِ سِتَّةٌ ، وهِيَ (إنَّ ، وأَنَّ ، وكَأَنَّ ، ولَيْتَ ، ولكِنَّ ، ولَعَلَّ).

وهذِهِ الحُرُوفُ تَدْخُلُ عَلى الجُمْلَةِ الاسْمِيَّةِ ، فَتَنْصِبُ الاسْمَ ، وتَرْفَعُ الخَبَرِ.

وقَدْ تَلْحَقُها (ما) الكافَّةُ ، فَتَكُفُّها عَنِ العَمَلِ.

يَجِبُ كَسْرُ هَمْزَةِ إنَّ فِي أَرْبَعَةِ مَواضِعَ:

١-إذا كَانَتْ فِي ابتِداءِ الكَلامِ.

---

٦. له پاش (لو)، وەك: (لو انك عندنا لأخدمك).

٧. پاش (لولا)، وەك: (لولا أنه حاضر لأعلمتك).

دروستە عەتف بكەینە سەر ئیسمی (إن)ی مەكسور، بە ڕەفع و نەصب، بە لەبەرچاو گرتنی مەحەلەكەی یان لەفزەكەی[1]، وەك: (إن سعیدا صائم و جعفر) یان (و جعفرا).

## پوختە

حەرفە موشەبەهـ بە فیعلەكان شەشن، ئەوانیش: (إن، أن، كأن، لیت، لكن، لعل)ـن.

ئەم حەرفانە دەچنە سەر ڕستەی ئیسمی، ئیسمەكە مەنصوب، و خەبەرەكە مەرفوع دەكەن.

هەندێ جار (ما)ی كافەیان دەچێتە سەر، ئەوكات لەكاریان دەخات.

پێویستە هەمزەی (إن) لە چوار شوێندا كەسرەی بدرێتێ:

١. ئەگەر لەسەرەتای قسەوە بوو.

---

١ مەبەست ئەوەیە كە ئەگەر بە ڕەفع عەتفمان كردە سەری ئەوە حساب بۆ مەحەلی ئیسمەكەی دەكەین كە لە ئەسڵدا موبتەدایە و مەرفوعە، بەڵام ئەگەر بە نەصب عەتفمان كردە سەری ئەوە لەسەر لەفزی ئیسمەكە عەتفمان كردوە كە مەنصوبە.

٢-بَعْدَ القَوْلِ.

٣-بَعْدَ المَوْصُولِ.

٤-إذا كَانَتْ الّلامُ فِي خَبَرِهَا.

ويَجِبُ فَتْحُهَا فِي سَبْعَةِ مَواضِع: ١-إذا وَقَعَتْ فَاعِلاً.

٢-إذا وَقَعَتْ مَفْعُولاً.

٣-إذا وَقَعَتْ مُضَافاً إلَيْه.

٤-إذا وَقَعَتْ مُبْتَدأً

٥-إذا وَقَعَتْ مَجْرُورَةً.

٦-بَعْدَ لَوْ.

٧-بَعْدَ لَوْلا.

ويَجُوزُ فِي المَعْطُوفِ عَلى اسْمِ (إنَّ) الرَّفْعُ والنَّصْبُ بِاعْتِبَارِ المَحَلِّ واللّفْظِ.

---

٢. پاش (قول).

٣. پاش مەوصول.

٤. ئەگەر خەبەرەکەی لامی پێوەبێت.

پێویستە فەتحەی بدرێتێ لە حەوت شوێندا: ١. ئەگەر فاعیل بوو.

٢. ئەگەر مەفعول بوو.

٣. ئەگەر موزاف ئیلەیهی بوو.

٤. ئەگەر موبتەدا بوو.

٥. ئەگە مەجرور بوو.

٦. لە پاش (لو).

٧. لە پاش (لولا).

ڕەفع و نەصب دروستە لەو ئیسمەدا کە عەتف دەکرێتە سەر ئیسمی (إن)، بە لەبەرچاوگرتنی محەلەکەی لە ڕستەدا یان لەفزەکەی.

أسئلة :

١-ما هِيَ الحُرُوفُ المُشَبَّهَةُ بِالفِعْلِ؟ وما هُوَ عَمَلُها؟

٢-مَتى تُكَفُّ الحُرُوفُ المشَبَّهَةُ بِالفِعْلِ عَنِ العَمَلِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٣-هَلْ (إنَّ) المَكْسُورَةُ تُغَيِّرُ مَعْنى الجُملَةِ أَمْ لا؟ ائْتِ بِمِثالٍ يُوَضِّحُ ذلِك.

٤-عَدِّدْ مَواضِعَ كَسْرِ هَمْزَةِ (إنَّ) ومَثِّلْ لَها.

٥-اُذكُرْ مَتَى تُفْتَحُ هَمْزَةُ (أنَّ) مُوَضِّحاً ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

---

پرسیار:

١. حەرفە موشەبەهـ بە فیعلەکان کامانەن؟ کارەکەیان چیە؟

٢. چ کاتێك حەرفە موشەبەهـ بە فیعلەکان لەعەمەل دەخرێن؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٣. ئایا (إن)ی کەسرەدار مانای ڕستە دەگۆڕێت یان نا؟ نموونەیەك بێنەوە ئەمە ڕوون بکاتەوە.

٤. شوێنەکانی کەسرەدارکردنی هەمزەی (إن) بژمێرە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. چ کاتێك هەمزەی (أن) فەتحەدار دەکرێت؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

راهێنان:

أ- ئیسمی (إن) و خەبەرەکەی لەم ڕستانەدا دەربهێنە، و هۆی فەتحەدارکردن و کەسرەدارکردنی هەمزەی (ان) ڕوون بکەرەوە:

١-إنَّ الوَلَدَ يَأكُلُ.

٢- قال تعالى: ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴾(مريم / ٣٠).

٣-بَلَغَنِي أَنَّكَ مُسَافِرٌ.

٤-عَجِبْتُ مِنْ أَنَّ سَعِيداً حاضِرٌ.

٥-لَوْ أَنَّكَ فَهِمْتَ لاتَّعَظْتَ.

٦-عَلِمْتُ أَنَّهُ مَوْجُودٌ.

ب-

١. سێ ڕسته بێنەوه که هەمزەی (إن) تێیاندا کەسرەی هەبێت.

٢. سێ ڕسته بێنەوه که هەمزەی (أن) تێیاندا فەتحەی هەبێت.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوه بکه:

١-قال تعالى: ﴿ إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ ﴾(آل عمران / ١٩).

٢- قال تعالى: ﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ (الأنفال / ٢٤).

٣- قال تعالى: ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾(الشورى / ١٧).

٤-كَأَنَّ العِلْمَ نُورٌ.

٥-لَيْتَ الْمُسْلِمِينَ يَفْهَمُونَ الإِسْلاَمَ حَقّاً.

## الدرس السادس والأربعون

## بَقِيَّةُ الحُرُوفِ المُشَبَّهَةِ بِالفِعْلِ

قَدْ تُخَفَّفُ(إنَّ) المَكْسُورَةُ، ويَلْزَمُ الّلامُ حينَئِذٍ فِي خَبَرِها فَرْقاً بَيْنَها وبَيْنَ(إنْ) النّافِيَةِ، كَقَوْلِهِ تَعالى:﴿وَإِنَّ كُلاًّ لَمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾(هود/١١١)، وحِينَئِذٍ يَجُوزُ إلغَاؤُها، كَقَوْلِهِ تَعَالى:﴿ وَإِنْ كُلٌّ لَمَّا جَمِيعٌ لَدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾[1](يس / ٣٢).

وتَدْخُلُ عَلى الأفعالِ النّاسِخَةِ غالِباً ، كَقَوْلِهِ تَعَالى: ﴿ وَإِنْ كُنتَ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ﴾(يوسف / ٣) و قوله تعالى: ﴿ وَإِنْ نَظُنُّكَ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ ﴾(الشعراء / ١٨٦).

وكَذا المَفْتُوحَةُ قَدْ تُخَفَّفُ ويَجِبُ إعْمالُها فِي ضَمِيرِ شَأنٍ مُقَدَّرٍ ، فَتَدْخُلُ عَلى الجُمْلَةِ ،

---

## وانەی چل و شەش

## پاشماوەی حەرفە موشەبەهە بە فیعلەکان

هەندێ جار (إن)ی کەسرەدار تەخفیف دەکرێت -شەددەکەی لادەبرێت-، ئەوکات لە خەبەرەکەیدا پێویستە لام هەبێت بۆ ئەوەی جیای بکاتەوە لە (إن)ی نافیە، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿ وَإِن كُلاًّ لَمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ ، ئەوکات دروستە لە عەمەل بخرێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿ وإنْ كلّ لما جميع لدينا محضرون﴾.

زۆربەی جاریش دەچێتە سەر فیعلە ناسیخەکان، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿ وإنْ كنت من قبله لمن الغافلين﴾ ، ﴿ وإنْ نظنك لمن الكاذبين﴾.

فەتحەداریش بەهەمان شێوە هەندێ جار تەخفیف دەکرێت، ئەوکات پێویستە عەمەل بکات لە ضەمیرێکی شەئنی تەقدیرکراودا، ئەوسا دەچێتە سەر ڕستە،

---

١ - وفي تفسير أبي السعود - (ج ٥ / ص ٤١٢): { وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ } بيانٌ لرجوعِ الكلِّ إلى المحشرِ بعد بيان عدمِ الرُّجوعِ إلى الدُّنيا وأن نافية وتنوينُ كلٌ عِوضٌ عن المضافِ إليهِ ولمّا بمعنى إلاّ ، وجميعٌ فعيلٌ بمعنى مفعولٍ ، ولدينا ظرفٌ له أو لما بعده . والمعنى ما كلُّهم إلاّ مجموعون لدينا مُحضرون للحساب والجزاء وقيل : محضرُون معذَّبون فكل ذلك عبارةٌ عن الكَفَرة . وقُرىء لما بالتَّخفيفِ على أنْ إنْ مخففةٌ من الثقيلة واللاّمُ فارقةٌ وما مزيدةٌ للتأكيد والمعنى أنّ كلَّهم مجموعون الخ .

اسْمِيَّةً كَانَتْ ، نَحْوُ (بَلَغَنِي أَنْ زَيْدٌ عَالِمٌ) ، أَيْ (أَنَّهُ) ، أَوْ فِعلِيَّةً ، ويَجِبُ دُخولُ (السِّين) أَوْ (سَوفَ) أَوْ (قَدْ) أَوْ حَرْفِ النَّفي عَلى الفِعْلِ ، كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿ عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنكُمْ مَرْضَى﴾(المزمل / ٢٠) ، فَالضَّمِيرُ المُسْتَتِرُ اسمُ (أَنْ) والجُمْلَةُ خَبَرُها.

و (كَأَنَّ) لِلتَّشْبِيهِ ، نَحْوُ (كَأَنَّ زَيْداً أَسَدٌ) قِيلَ: وهِيَ مُرَكَّبَةٌ مِنْ كَافِ التَّشْبِيهِ و (إِنَّ) المَكْسورَةِ وإنَّما فُتِحَتْ لِتَقْدِيمِ الكافِ عَلَيْها ، وتَقْدِيرُهَا (إِنَّ زَيْداً كالأَسَدِ).

وقَدْ تُخَفَّفُ ، فَتُلْغَى عَنِ العَمَلِ ، مِثْلُ (كَأَنْ زَيْدٌ أَسَدٌ).

و (لكِنَّ) لِلاسْتِدْراكِ ، وتَتَوَسَّطُ بَيْنَ كَلامَيْنِ مُتَغَايِرَيْنِ فِي اللَّفْظِ و المَعْنى ، نَحْوُ (مَا جَاءَنِي سَعِيدٌ لكِنَّ خالداً جَاءَ ، وغَابَ حَمِيدٌ ، ولكِنَّ مَحْمُوداً حَاضِرٌ).

---

ئیسمیی بێت، وەك: (بلغني أن زيدٌ عالمٌ)، واتە: (أنه)، یان فیعلیی بێت، پێویستیشە (سين) یان (سوف) یان (قد) یان حەرفی نەفی بچێتە سەر فیعلەکە، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿ علم أن سيكون منكم مرضى﴾ ، لێرەدا ضەمیرە شاراوەکە ئیسمی (أن)ـە و ڕستەکەش خەبەریەتی.

(كأنّ)ش بۆ تەشبیه -لێکچواندن- دەبێت، وەك: (كأنّ زيدا أسد)، هەندێك گووتویانە: ئەو پێك هاتووە لە کافی تەشبیه و (إن)ـەی کەسرەدار، بۆیەش فەتحەی دراوەتێ چونکە کاف پێشی کەوتووە، تەقدیرەکەشی بریتیە لە: (إن زيداً كالأسد).

هەندێ جار تەخفیف دەکرێت، ئەوکات لە عەمەل دەخرێت، وەك: (كأن زيدٌ أسدٌ).

(لكنّ)ش بۆ ئیستیدراك -فریاکەوتن[1]- دەبێت، و دەکەوێتە نێوان دوو قسەی جیاواز لە لەفز و مانادا، وەك: (ماجائني سعيد لكنّ خالداً جاء) و (غاب حميد لكنّ محمودا حاضر).

---

١ مەبەست لە فریاکەوتن لێرەدا ئەوەیە کاتێك خەبەرێك لە بارەی کەسێکەوە دەدەین و بەرامبەرەکە خۆی چاوەڕێی ئەوە دەکات هەمان خەبەر کەسێکی تر بگرێتەوە، بۆیە فریای دەکەوین و بۆچوونەکەی بۆ ڕاست دەکەینەوە بە هۆی (لكن)ەوە و پێی دەڵێین کە وانیە، ئەوەش بزانین بەرامبەرەکە هیچی نەگوتووە بەڵام بە لێکدانەوەی خۆمان وا دەزانین کە پێدەچێت شتی وا بێت بە خەیاڵیدا و هەر خۆیشمان بۆی ڕاست دەکەینەوە.

ويَجُوزُ مَعَها الواوُ ، نَحْوُ (قَامَ أحْمَدُ ولكِنَّ حَمِيداً قَاعِدٌ) وتُخَفَّفُ فَتُلْغَى ، نَحْـوُ (ذَهَـبَ أَحْمَدُ ولكِنْ حَمِيدٌ عِنْدَنا).

و (لَيْتَ) لِلتَّمَنِّي ، نَحْوُ (لَيْتَ خَالِداً يُؤْمِنُ بِاللهِ) بِمَعْنى أَتَمَنّى.

و (لَعَلَّ) للتَرَجِّي نَحْوُ قَوْلِ الشَّاعِرِ :

أُحِبُّ الصَّالِحِينَ وَلَسْت مِنهُمْ....وَلَكِنِّي بِهِمْ أَرْجُو الشَّفَاعَةْ

وشَذَّ الجَرُّ بِهَا نَحْوُ (لَعَلَّ زَيْدٍ قَائِمٌ).

وفِي (لَعَلَّ) لُغَاتٌ: (عَلَّ وعَنَّ وأَنَّ ولَأَنَّ ولَعَنَّ) وعِندَ المُبَرِّدِ أَصْلُها (عَلَّ) زِيدَتْ فِيها الَّـلامُ والبَواقِي فُرُوعٌ .

**الخلاصة:**

إذا خُفِّفَتْ (إنَّ) المَكْسُورَةُ تَلْزَمُ فِي خَبَرِها الّلامُ فَرْقـاً بِيْنَهـا وبَـيْنَ (إنْ) النَّافِيَـة ، ويَجُـوزُ حِينَئِذٍ إلغاؤُها عَنِ العَمَلِ ، ودُخولُهَا عَلَى الأفعَال.

---

دروستیشە واوی لەگەڵدا بەکار بهێنرێت، وەك: (قام احمد ولكن حميدا قاعد)، هەروەها تەخفيف دەكرێت ئەوكات لە عەمەل دەخرێت، وەك: (ذهب احمد لكن حميد عندنا).

(ليت) بۆ تەمەننی -خۆزگە خواستن- دەبێت، وەك: (ليت خالدا يؤمن بالله) واتە: خۆزگە دەخوازم.

(لعل) بۆ تەرەجی -بەهیوابوون- دەبێت، وەك گووتەی شاعیر:

أحب الصالحين ولست منهم    لعل الله يرزقني صلاحا

مەجرور کردن بەهۆی (لعل)ەوە شازە، وەك: (لعل زيدٍ قائم).

هەروەها لە (لعل)دا چەند لوغەتێك هەیە کە بریتین لە: (عل، عن، أن، لأن، لعن)، بەلای موبەڕەدەوە بنچینەکەی (عل)ە و لامی بۆ زیاد کراوە، ئەوانی تریشیان هەموو لقی ئەون.

**پوختە**

ئەگەر (إن)ی کەسرەدار تەخفیف کرا پێویستە لە خەبەرەکەیدا لام هەبێت بۆ ئەوەی جیای بکاتەوە لە (إن)ی نافیە، ئەوکاتەش دروستە لەعەمەل بخرێت، و بچێتە سەر فیعل.

وإذا خُفِّفَتْ (أَنَّ) المَفْتُوحَةُ يَجِبُ إعْمالُهَا فِي ضَـمِيرِ شَـأْنٍ مُقَـدَّرٍ ، وتَـدْخُلُ حِينَئِـذٍ عَلـى الجُمْلَةِ الاسْمِيَّةِ والفِعْلِيَّةِ.

وإذا دَخَلَتْ (أنْ) المفْتُوحَةُ عَلى الجُملَةِ الفِعْلِيَّةِ يَجِبُ دخُولُ (السِّينِ) أوْ (سَـوْفَ) أوْ (قَدْ) أوْ حَرْفِ النَّفي عَلى الفِعْلِ.

و (كَأَنَّ) لِلتَّشْبِيهِ ، وقَدْ تُخَفَّفُ ، فَتُلْغى عَنِ العَمَلِ.

و (لكِنَّ) للاسْتِدْراكِ وتَقَعُ بَيْنَ كَلامَيْنِ مُتَغايِرَينِ فِي اللَّفْظِ والمَعْنَى ، وإذا خُفِّفَت تُلْغى عَنِ العَمَـلِ.

و (لَيْتَ) لِلتَّمَنِّـي.

وَ (لَعَلَّ) لِلتَّرجِّيْ ، وشَذَّ الجَرُّ بِها.

---

ئەگەر (ان)ی فەتحەدار تەخفیف کرا ئەوە پێویستە لە ضەمیرێکی تەقدیرکراوی شەئندا عەمەل بکات، ئەوکات دەشچێتە سەر ڕستەی ئیسمی و فیعلی.

ئەگەر (ان)ی فەتحەدار ڕۆشتە سەر ڕستەی فیعلی ئەوە پێویستە (سین) یان (سوف) یان (قد) یان حەرفی نەفی بە فیعلەکەوە بێت.

(کأن) بۆ تەشبیه دەبێت، هەندێ جاریش تەخفیف دەکرێت، ئەوکات لە عەمەل دەخرێت.

(لكن) بۆ ئیستیدراك دەبێت، و دەکەوێتە نێوان دوو قسەی جیاوازەوە لە لەفز و مانادا، ئەگەریش تەخفیف کرا ئەوە لە عەمەل دەخرێت.

(لیت) بۆ تەمەننی دەبێت.

(لعل) بۆ تەرەجی دەبێت، و جەڕ کردنیش بەهۆیەوە شازە.

## أسئلة:

١-هَلْ تُخَفَّفُ (إنَّ) المَكْسُورَةُ؟ ومَا يَلْزَمُها إنْ خُفِّفَتْ؟

٢-هَلْ يَجُوزُ إلغاءُ (إنَّ) بَعْدَ التَّخفِيفِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-أَتَدْخُلُ (إنْ) المُخَفَّفَةُ عَلى الأفعالِ أمْ لا؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثال.

٤-هَلْ تُخَفَّفُ (أَنَّ) المَفْتُوحَةُ أمْ لا؟ وفِي أيِّ شَيْءٍ يَجِبُ إعْمالُها؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٥-إذا دَخَلَتْ (أَنْ) المُخَفَّفَةُ عَلى الجُمَلِ الفِعْلِيَّةِ ، فَمَاذا يَجِبُ أنْ يَدْخُلَ عَلى الفِعْلِ؟ اِشْرَحْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٦-هَلْ تُخَفَّفُ (لكنَّ)؟ ومَا حُكْمُها إنْ خُفِّفَتْ؟

٧-أُذكُرْ مَعانِيَ (لكِنَّ ، لَيْتَ ، لَعَلَّ) ومَثِّلْ لَها.

---

## پرسیار:

١. ئایا (إن)ی کەسرەدار تەخفیف دەکرێت؟ ئەگەر تەخفیف کرا چیی پێویستە بکرێت؟

٢. ئایا دروستە (إن) لەکار بخرێت دوای تەخفیف کردنی؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. ئایا (إن)ی تەخفیف کراو دەچێتە سەر فیعل یان نا؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. ئایا (أن)ی فەتحەدار تەخفیف دەکرێت یان نا؟ ئەی پێویستە عەمەل لە چیدا بکات؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. ئەگەر (أن)ی تەخفیف کراو ڕۆشتە سەر ڕستەی فیعلی، ئەوکات پێویستە چیی بچێتە سەر فیعلەکە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٦. ئایا (لکن) تەخفیف دەکرێت؟ ئەگەر تەخفیف کرا حوکمەکەی چیی دەبێت؟

٧. ماناکانی (لکن) و (لیت) و (لعل) بڵێ و نموونەیان بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ- لەم ڕستانەدا حەرفە موشەبەهـ بە فیعلەکان دیاری بکەو ماناکانیان ڕوون بکەوە:

- قال تعالى: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ﴾ (يوسف/٣ )

٢-إنَّ سَعِيداً قَائِمٌ.

٣-هذا عَالِمٌ لكِنَّهُ وَضِيعٌ.

٤-كَأنَّ زَيْداً أَسَدٌ.

٥- قال تعالى: ﴿ قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ (٢٧) ﴾ ﴿يس/٢٦، ٢٧﴾.

٦-سَلمَانُ يَدْرُسُ ولكِنْ سَعِيدٌ يَلْعَبُ.

ب- وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەرەوە:

١. سێ ڕستە بێنەوە کە تییاندا (إنّ) تەخفیف کرابێت.

٢. دوو ڕستە بێنەوە کە لە یەکەمیاندا (لكنّ) شەددەی هەبێت و لە دووەمیاندا تەخفیف کرابێت.

٣. (كأنّ)ی تەخفیف کراو لە ڕستەیەکی بەسووددا بەکار بێنە.

٤.سێ ڕستە دروست بکە کە (ليت) و (لعلّ) و (لكنّ)یان تێدا بێت.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿يَا لَيتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ (النساء /٧٣).

٢- قال تعالى: ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى ﴾(عبس / ٣).

٣- قال تعالى: ﴿ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ ﴾(المنافقون / ٤).

## الدرس السابع والأربعون

### حُرُوفُ العَطْف - ١

حُرُوفُ العَطْفِ عَشرَةٌ: الواوُ، والفاءُ، وثُمَّ، وحَتّى، و أوْ، وإمّا، وأَمْ، ولا، وبَـلْ، ولكِنْ.

فـ(الواوُ) لِلجَمْعِ مُطْلَقاً نَحْو (جاءَ سَعِيدٌ وحَميدٌ) ، سَواءٌ كَانَ سَعيدٌ مُقَدَّماً فِـي المَجِـيءِ ، أمْ حَمِيدٌ.

و (الفَاءُ) لِلتَّرْتِيبِ بِمُهْلَةٍ ، نَحْوُ (قَامَ سَعِيدٌ فَحَمِيدٌ) إذا كَانَ سَعِيدٌ مُقَدَّماً بِلا مُهْلَةٍ.

و(ثُمَّ) لِلتَّرتِيبِ بِلا مُهْلَةٍ، نَحْوُ(دَخَلَ زَيدٌ ثُمَّ خَالِدٌ)، إذا كَانَ زَيْدٌ مُقَدَّماً بالدُّخُولِ وَبَيْنَهُما مُهْلَةٌ.

وَ (حَتّى) مِثْلُ (ثُمَّ) فِي التَّرْتِيبِ والمُهْلَةِ إلاّ أَنَّ مُهْلَتَها أَقَلُّ مِنْ مُهْلَةِ (ثُمَّ).

---

## وانەی چل و حەوت

### حەرفەکانی عەتف[1]-١

حەرفەکانی عەتف دە دانەن: واو، فاء، ثمَ، حتی، او، إمَا، ام، لا، بل، لكن.

(واو) بۆ جەمع دەبێت بە موتڵەقی[2] -ڕەهایی-، وەك: (جاء سعيد وحميد)، ئیتر یەکسانە سەعید پێشتر هاتبێت یان حەمید.

(فاء) بۆ تەرتیب دێت بەبێ مۆڵەت، وەك: (قام سعيد فحميد)، ئەگەر سەعید پێشکەوتبێت بەبێ مۆڵەت[3].

(ثمَ) بۆ تەرتیب دێت بەمۆڵەتەوە، وەك: (دخل زيد ثم خالد)، ئەگەر زید پێشتر هاتبێتە ژوورەوە، و مۆڵەتیش لە نێوان هاتنەکەیاندا هەبێت.

(حتی) وەك(ثمَ)یە لە تەرتیب و مۆڵەتدا، بەڵام مۆڵەتی ئەم کەمترە لە مۆڵەتی (ثمَ).

---

١ لە ڕێزمانی کوردیدا لە شێوەی ئامرازی لێکدەردا دێن.

٢ واتە تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو دوانە بەشدارن لە هەمان حوکمدا ئیتر کامیان پێشتر هاتووە یان بەینیان هەبوە یان نا لێرەدا باسی لێوە ناکرێت و واو دەلالەت ناکاتە سەری.

٣ دەقە عەرەبییەکە بەوجۆرەیە، بەڵام باشتر وابوو نوسەر گووتبای:(ئەگەر سەعید پێش کەتبوو لەهەستاندا و پاشان بەبێ مۆڵەت حەمیدیش بەدوایدا هەستابوویەوە)، کە هەرئەمەش مەبەستەکەیە.

ويُشْتَرَطُ أَنْ يَكُونَ مَعْطُوفُها داخِلاً فِي المَعْطوفِ عَلَيْهِ. وهِيَ تُفِيدُ قُوَّةَ المَعْطُوفِ ، نَحْوُ (مَاتَ النَّاسُ حَتّى الأنْبِياءُ) ، أوْ ضَعْفَهُ ، نَحْوُ (قَدِمَ الحاجُّ حَتَّى المُشاةُ).

و (أوْ وإمّا وأَمْ) لِثُبُوتِ الحُكْمِ لِأحَدِ الأمْرَيْنِ لا بِعَيْنِهِ ، (مَرَرْتُ بِرَجُلٍ أوْ امْرَأَةٍ). و (إمّا) إنَّما تَكونُ حَرْفَ عَطْفٍ إذا تَقَدَّمَ عَلَيْها (إمّا) أُخرى ، نَحْوُ (اَلْعَدَدُ إمّا زَوْجٌ ، وإمّا فَرْدٌ) ، ويَجُوزُ أنْ يَتَقَدَّمَ (إمّا) عَلى (أوْ) نَحْوُ (زَيْدٌ إمّا كَاتِبٌ أوْ لَيْسَ بِكاتِبٍ).

**اَلـخُلاصَةُ:**

حُرُوفُ العَطْفِ هِيَ: الواوُ، و أو، والفاءُ، وثُمَّ، وحَتّى، وإمّا، وأمْ، ولا، وبَلْ، ولكِنْ.

(الواوُ) لِلجَمْعِ مُطْلَقاً.

(الفاءُ) لِلجَمْعِ مَعَ التَّرتِيبِ بِلا مُهْلَةٍ.

(ثُمَّ) لِلتَّرْتِيبِ مَعَ مُهْلَةٍ.

---

بەمەرجیش گیراوە کە مەعتوفەکەی لەناو مەعتوف علیه یەکەدا بێت، و مانای بەهێزی مەعتوفەکە دەبەخشێت، وەك: (مات الناس حتى الأنبياء)، یان لاوازی دەبەخشێت، وەك: (قدم الحاج حتى المشاة).

(او) و(إما) و(ام) بۆ چەسپانی حوکمەکە دەبێت بۆ یەکێك لە دووشت بەبێ دەستنیشانکردنی ، وەك: (مررت برجل او امراة).

(إما) کاتێك دەبێتە حەرفی عەتف ئەگەر (إما)یەکی تر بەسەریدا پێش کەوتبێت، وەك: (العدد إما زوج وإما فرد)، دروستیشە (إما) پێشکەوێت بەسەر (او)دا، وەك: (زيد إما كاتب او ليس بكاتب).

**بە کورتی:**

حەرفەکانی عەتف بریتین لە: واو، او، فاء، ثم، حتى، إما، أم، لا، بل، لكن.

(واو) بۆ جەمع دەبێت بە موتڵەقی.

(فاء) بۆ جەمع دەبێت لەگەڵ تەرتیب بە بێ مۆڵەت.

(ثم) بۆ تەرتیب لەگەڵ مۆڵەتدا.

و (حَتّى) مِثْلُ (ثُمَّ) فِي التَّرْتِيبِ والمُهْلَةِ إلاّ أنَّ مُهْلَتَها أَقَلُّ. و (أوْ ، وإمّا ، وأمْ) لِثُبُوتِ الحُكْمِ لِأحَدِ الأمْرَيْنِ لا بِعَيْنِهِ.

وَسَيَأْتِي الحَدِيثُ عَنْ (أم ، لا ، بَلْ ، ولكِنْ) في الدَّرْسِ القَادِمِ إنْ شَاءَ اللهُ تَعالى.

**أسْئلة :**

١-عَدِّدْ حُرُوفَ العَطْفِ وأَدْخِلْها فِي جُمَلٍ مُفِيدَةٍ.

٢-مَتَى تُسْتَعْمَلُ (الواوُ)؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-لأيِّ شيءٍ تُسْتَعْمَلُ (الفاءُ ، وَثُمَّ) فِي العَطْفِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٤-مَاذا تُفِيدُ (حَتّى) فِي العَطْفِ؟ ومَا الفَرْقُ بَيْنَهـا وبَـيْنَ (ثُـمَّ)؟ اِشْـرَحْ ذلِـك مَـعَ أمْثِلَـةٍ مُفِيدَةٍ.

٥-مَاذا تُفِيدُ (أوْ ، إمّا ، أمْ) فِي العَطْفِ؟ مَثِّلْ لَهَا.

٦-مَتَى تَكُونُ (إمّا) حَرْفَ عَطْفٍ؟

---

(حتى) وەك (ثمَ)یە لە تەرتیب و مۆڵەتدا بەڵام ئەوە هەیە کە مۆڵەتەکەی ئەم کەمترە.

(او) و(إما) و(أم) بۆ چەسپانی حوکم دەبێت بۆ یەکێك لە دوو شت بەبێ دەستنیشانکردنی.

پاشتر باسکردن سەبارەت بە: (أم، لا، بل، لکن)دێت، لە وانەی داهاتوودا بەویستی خودا.

**پرسیار:**

١. حەرفەکانی عەتف بژمێرەو بیانخەرە ڕستەی بەسوودەوە.

٢. چ کاتێك واو بەکاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. (فاء)و (ثمَ) لە عەتفدا بۆ چی بەکاردەهێنرێن؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. لە عەتفدا (حتی) چ مانایەك دەبەخشێت؟ جیاوازیەکەی لەگەڵ (ثمَ)دا چییە؟ ئەمە بە نموونەی بەسوودەوە ڕوون بکەوە.

٥. (أو)و(إما)و(أم) لە عەتفدا چی دەگەیەنێت؟ نموونەیان بۆ بێنەوە.

٦. کەی (إما) دەبێتە حەرفی عەتف؟

## ڕاهێنان:

أ- لەم ڕستانەدا حەرفەکانی عەتف دەربهێنە و سوودەکەیان ڕوون بکەوە:

١-سَافَرَ سَعِيدٌ وخَالِدٌ.

٢- قال تعالى:﴿ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا ﴾(المائدة / ٩٥).

٣-دَخَلَ خَالِدٌ ثُمَّ سَعِيدٌ.

٤- قال تعالى: ﴿ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾(الإنسان / ٣).

٥-أَقَرَأْتَ هذا الكِتابَ، أمْ ذاكَ؟

٦-خُذِ الكِتابَ، أوِ المَجَلَّةَ.

٧-إمّا أنْ تُسافِرَ أوْ أنْ تَذْهَبَ إلى عَمَلِكَ.

ب- حەرفێکی عەتفی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-رَأَيْتُ الصُّفوفَ.....السّاحَةَ. ٢-أَدَيْتُ عَمَلِي...... ذَهَبْتُ.

٣-قَرَأْتُ الكِتابَ...... المَجَلَّةَ. ٤-هذا الرَّجُلُ...... مُوظَّفٌ كَبِيرٌ...... تاجِرٌ.

٥- أَطالِبٌ أَنتَ...... مُدَرِّسٌ. ٦- ياسَعِيدُ....أنْ تَكْتُبَ....أنْ تقرَأَ، لا تُضَيِّعْ وَقْتَكَ.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-اَلعِلْمُ عِلْمانِ: مَطْبُوعٌ ومَسْمُوعٌ.

٢- قال تعالى: ﴿ أَمَّنْ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ﴾(النمل / ٦٤).

٣-لا يَدْرِي أَلَهُ مَا يأتِي امْ عَلَيهِ؟

٤- قال تعالى:﴿ فَمَنْ كَانَ مِنكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾(البقرة/١٨٤).

٥-اِخْتَرْ إمَّـا التِّجَارَةَ وإمَّـا التَّعَلُّـمَ.

## الدرس الثامن والأربعون
## حُرُوفُ العَطفِ -٢

(أمْ) عَلى قِسْمَيْنِ:

١-مُتَّصِلَةٌ: وهِيَ مَا يُسْأَلُ بِهَا عَنْ تَعيينِ أَحَدِ الأمْرَينِ ، والسَّائِلُ عَـالِمٌ بِثُبُـوتِ أحَـدِهِمَا مُبْهَماً ، بِخِلافِ (أوْ ، وإمّا) فَإنَّ السَّائِلَ بِهِما لا يَعْلَمُ بِثُبوتِ احَدِهِما أصْلاً.

ويُشْتَرَطُ فِي اسْتِعْمَالِها ثَلاثَـةُ أُمُورٍ:

الأوَّلُ: أنْ تَقَعَ قَبْلَها هَمْزَةٌ ، نَحْوُ (أسَعِيدٌ عِنْدَكَ أمْ حَمِيدٌ؟).

الثَّانِي: أنْ يَكُونَ مَا بَعْدَها مُمَاثِلاً لِمَا بَعْدَ الهَمْزَةِ ، أعْنِي إنْ كَانَ بَعْدَ الهَمْزَةِ اسْـمٌ فَكَـذلِك بَعْدَ (أمْ) كَمَا مَرَّ ، وإنْ كَانَ فِعْـلٌ فَكَذلِك ، نَحْوُ (أَقَامَ خَالِـدٌ أمْ قَعَدَ عَـادِلٌ؟) فَلا يُقَـالُ: (أرَأيْتَ سَعِيداً أمْ مَجِيداً؟)

---

## وانەی چل و هەشت
## حەرفەکانی عەتف – ٢

(أم) دوو جۆرە:

١. موتتەصیل -پەیوەست-: ئەوەیە کە پرسیاری پێدەکرێت سەبارەت بە دیاریکردنی یەکێك لە دوو شت، پرسیارکەرەکەش دەزانێت بەوەی کەیەکێك لەو دوانە بە شێوەیەکی دەستنیشان نەکراو بوونی هەیە، بە پێچەوانەی (او) و (إما)وە کە پرسیارکەرەکە بە هیچ شێوەیەك زانیاری نیە سەبارەت بە بوونی یەکێکیان.

ئەم جۆرەیان لە بەکارهێنانیدا سێ شت پێویستن:

یەکەم: لە پێشیەوە هەمزە هەبێت، وەك: (اسعید عندك ام حمید).

دووەم: پێویستە ئەوەی کە لە پاشیەوە دێت وەك ئەوە بێت کە لەپاش هەمزەکەوە دێت، مەبەست ئەوەیە ئەگەر پاش هەمزەکە ئیسم بێت ئەوە پێویستە پاش (ام)یش بەهەمان شێوە بێت وەك باسکرا، خۆ ئەگەر فیعل بوو ئەمیش بەهەمان شێوە، وەك: (اقام خالد ام قعد عادل؟) کەواتە ناتوانین بڵێین: (ارایت سعیدا أم مجیدا؟).

الثَّالِثُ: أنْ يَكونَ ثُبُوتُ أَحَدِ الأمْرَيْنِ مُحَقَّقاً لَدى السّائِلِ ، وإنَّما يَكُونُ الاسْتِفْهامُ عَنِ التَّعْيِينِ ، ولِذلِك وَجَبَ أنْ يَكُونَ جَوابُ (أمْ) بالتَّعْيِينِ ، دُونَ (نَعَمْ) أوْ (لا) ، فَإذا قِيلَ (أَجَعْفَرٌ عِنْدَكَ أمْ خَالِدٌ؟) فَجَوابُهُ بِتَعْيِينِ أحَدِهِمَا ، أمّا إذا سُئِلَ بِـ (أوْ ، وإمَّا) فَجَوابُهُ (نَعَمْ) أوْ (لا).

٢-مُنْقَطِعَةٌ ، وهِيَ مَا يَكُونُ بِمَعْنى (بَلْ) مَعَ الهَمْزَةِ ، نَحْوُ (إنَّها لَإبِلٌ أمْ هِيَ شِياةٌ؟) ، وذِلك كَمَا لَوْ رَأيْتَ شَبَحاً مِنْ بَعِيدٍ ، وقُلْتَ: (إنَّها لَإبِلٌ) عَلى سَبِيْلِ القَطْعِ ، ثُمَّ حَصَلَ الشَّكُّ فِي أنَّها شِياةٌ ، فَقُلْتَ: (أَمْ هِيَ شِياةٌ) وتَقْصُدُ الإعراضَ عَنِ الإخْبَارِ الأوَّلِ ، وَاسْتِئْنَافَ سُؤالٍ آخَرَ مَعْنَاهُ (بَلْ أَهِيَ شِياةٌ؟).

ولا تُسْتَعْمَلُ (أَمْ) المُنْقَطِعَةُ إلاّ فِي الخَبَرِ كَما مَرَّ، وفِي الاسْتِفهامِ ، نَحْوُ (أَعِنْدَكَ أَحْمَدُ أَمْ عِنْدَكَ مَحْمودٌ).

---

سێیەم: بوونی یەکێك لە دوو شتەکە بەلای پرسیارکەرەکەوە بەدی هاتبێت، پرسیارکردنەکەیش بۆ دیاریکردنی یەکێکیان بێت، هەر لەبەر ئەوە پێویستە وەڵامی (ام) بە دیاریکردنی یەکێکیان بێت، نەك بە (نعم) یان (لا)، کەواتە ئەگەر ووترا: (اجعفر عند ام خالد؟) وەڵامەکەی بە دیاریکردنی یەکێکیان دەبێت، بەڵام ئەگەر بە (او) یان(اما) پرسیار کرا ئەوە وەڵام بە (نعم) یان (لا) دەدرێتەوە.

٢. مونقەتیع -پچڕاو-: ئەویش ئەوەیە کە بە مانای (بل) –بەڵکو- دێت و لەگەڵ هەمزەدا بەکار دەهێنرێت، وەك: (إنها لإبل ام هي شياه؟)، ئەمەش لە کاتێکدایە کە تارماییەکت لە دوورەوە بینی و گووتت: (إنها لإبل)- ئەوانە ووشترن- بە بێ دوودڵی، پاشان گومانت بۆ دروست بوو کە ئەوانە مەڕبن، و گووتت: (ام هي شياه) –بەڵکو ئەوانە مەڕن- مەبەستیشت لێرەدا ئەوەیە کە پشت لە خەبەرەکەی یەکەمجار هەڵکەیت، و پرسیارێکی تر دەست پێ بکەی، کە ماناکەی بریتیە لە: (بل اهي شياه؟) –واتە: بەڵکو ئایا ئەوانە مەڕن؟-.

(ام)ی مونقەتیع بەکارنایەت لە خەبەردا نەبێت وەك باسکرا، و جگە لە پرسیاردا، وەك: (اعندك احمد ام عندك محمود؟).

وتُستَعْمَلُ (لا ، وبَلْ ، ولكِنْ) لِثُبُوتِ الحُكْمِ لِاَحَدِ الأمْرَيْنِ مُعَيَّناً.

فَإنَّ (لا) تَنْفِي ما وَجَبَ لِلأوَّلِ عَنِ الثَّانِي ، نَحْوُ (جَاءَنِي سَعِيدٌ لا مَجِيدٌ) و (بَلْ) تُفِيدُ الإضرابَ عَنِ الأوَّلِ ، نَحْوُ (جَاءَنِي أحْمَدُ بَلْ مَحمودٌ) ومَعْنَاهُ بَلْ جَاءَ مَحْمُودٌ ، و (لكِنْ) لِلإسْتِدْرَاكِ ، نَحْوُ (قَامَ سَعِيدٌ ولكِنْ خَالِدٌ لَمْ يَقُمْ).

**اَلخُلاصَةُ:**

تَتِمَّةُ حُروفِ العَطْفِ

(أَمْ) عَلى قِسمَيْنِ: مُتَّصِلَةٌ ، ومُنْقَطِعَةٌ

ويُشْتَرطُ فِي اسْتِعْمالِ المُتَّصِلَةِ ثَلاثَةُ أمُورٍ.

١-أنْ تَتَقَدَّمَها هَمْزَةٌ.

٢-أنْ يَكونَ مَا بَعْدَهَا مُمَاثِلاً لِما بَعْدَ الهَمْزَةِ.

٣-أنْ يَكُونَ ثُبُوتُ أَحَدِ الأمْرَيْنِ مُحَقَّقاً لَدى السَّائِلِ.

---

(لا)و (بل)و (لكن) بەکاردەهێنرێن بۆ چەسپاندنی حوکم بۆ یەکێك لە دووشت بە دیاریکراوی.

چونکە(لا) ئەوشتەی کە دراوە بەیەکەمیان نەفی دەکات و بۆ دووەمی بڕیاردەدات، وەك: (جاءني سعيد لا مجيد)، (بل)یش مانای پشت هەڵکردن لە یەکەم دەگەیەنێت، وەك:(جاءني احمد بل محمود) ماناکەشی بریتیە لە: (بل جاء محمود)، (لكن)یش بۆ ئیستیدراك دەبێت، وەك: (قام سعيد ولكن خالد لم يقم).

**پوختە**

پاشماوەی حەرفەکانی عەتف

(ام) دوو جۆرە، موتتەصیل، و مونقەتیع.

بۆ بەکارهێنانی موتتەصیل سێ شت بەمەرج گیراون:

١. هەمزەیەك لە پێشیەوە بێت.

٢. پاشەوەی هاوشێوەی ئەوەبێت کە بەدوای هەمزەکەدا دێت.

٣چەسپانی یەکێك لە دوو شتەکە بەلای پرسیارکەرەکەوە هاتبێتە بوون.

ولا تُستَعْمَلُ (أَمْ) المُنقَطِعَةُ إلاّ فِي الخَبَرِ أوِ الاستِفْهَامِ.

وتُستَعْمَلُ (لا ، بَلْ ، لكِنْ) لِثُبُوتِ الحُكْمِ لأحَدِ الأمْرَينِ مُعَيَّناً.

أسئلة :

١-عَنْ أيِّ شيءٍ يُسأَلُ بِـ (أَمْ) المُتصِلَةِ؟ ومَا الفَرْقُ بَيْنَها وبَينَ (أَمْ) المنقَطِعَةِ؟

٢-مَا هِيَ شُرُوطُ استِعْمَالِ (أَمْ)؟ اشْرَحْ ذلِك ، ومَثِّلْ لَها.

٣-مَا هُوَ المُستَفْهَمُ عَنْهُ فِي (أَمْ)؟ ومَاذا يَجِبُ فِيهِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأَمْثِلَةٍ.

٤-مَا هُوَ الجَوابُ إذا سُئِلَ بِـ (أَوْ ، وإمَّا)؟

٥-مَا هِيَ (أَمْ) المُنقَطِعَةُ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٦-لِأيِّ شَيءٍ تُستَعْمَلُ (أَمْ) المُنْقَطِعَةُ؟ بَيِّنِ ذلِك ومَثِّلْ لَهَا.

٧-لِأيِّ شَيءٍ تُستَعْمَلُ (لا ، بَلْ ، لكنْ)؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٨-مَا هُوَ عَمَلُ (لا)؟ هَاتِ مِثَالاً عَلى ذلِك.

---

(ام)ی مونقەتیعیش لە خەبەر و پرسیاردا نەبێت بەکار نایەت.

(لا)و(بل)و(لکن) بەکاردێن بۆ چەسپانی حوکمەکە بۆ یەکێك لە دوو شت بە دیاریکراوی.

پرسیار:

١.بە(ام)ی موتتەصیل پرسیار لە چی دەکرێت؟ جیاوازیشی چیە لەگەڵ (ام)ی مونقەتیعدا.

٢. مەرجەکانی بەکارهێنانی (ام) چین؟ ئەمە ڕوون بکەوە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. ئەو شتەی کە پرسیاری لەبارەوە دەکرێت بە(ام) چیە؟ ئەی پێویستە چی تێدا بێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. وەڵام چییە ئەگەر بە (او) یان(اما) پرسیار کرا؟

٥. (ام)ی مونقەتیع کامەیە؟ ئەمە بە نموونە ڕوون بکەوە.

٦. (ام)ی مونقەتیع بۆ چی بەکاردەهێنرێت؟ ئەمە ڕوون بکەوە و نموونەی بۆ بێنەوە.

٧. (لا، بل، لکن) بۆ چی بەکاردەهێنرێن؟ نموونە بێنەوە.

٨. کاری (لا) چییە؟ نموونەیەك لەسەر ئەمە بێنەوە.

## ڕاهێنان:

ا- حەرفەكان لەم ڕستانەدا دەربهێنە و ماناكەیان ڕوون بكەوە:

١-أَفِي الدّارِ سَعِيدٌ أَمْ خَالِدٌ؟

٢-إِنَّهُم لَذاهِبُونَ أَمْ رَاجِعُونَ؟

٣-سَافَرَ سَعِيدٌ لا خَالِدٌ.

٤- قال تعالى: ﴿ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَكِنْ كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾(البقرة / ٥٧).

٥- قال تعالى: ﴿ إِنْ هُمْ إِلاَّ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً ﴾(الفرقان / ٤٤).

ب- حەرفێكی گونجاو بخەرە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە:

١-اشْتَرَيْتُ كِتَاباً...... مَجَلَّةً.

٢-جَاءَ حَمِيدٌ...... سَعِيدٌ.

٣-هَلْ هُوَ مُسافِرٌ؟...... لا.

٤-هُمْ لا يَفْعَلُونَ...... لا يَفْهَمُونَ.

٥-هذا رَأيٌ جَدِيدٌ...... لا تَفْهَمُونَ.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بكە:

١- قال تعالى: ﴿ أَأَنْتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا﴾(النازعات / ٢٧).

٢- قال تعالى: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ بَلْ جَاءَهُمْ بِالْحَقِّ ﴾(المؤمنون / ٧٠).

٣-أَكْرِمِ الْمُؤمِنِينَ لا الْمُنَافِقِينَ.

٤-قَرأَ سَعِيدٌ الكِتَابَ لكِنْ حامدٌ لَمْ يَقْرَأه.

٥-أَفَهْمُكَ مِيْزانٌ أَمْ مَا وَرَدَ عَنِ الرسولِ صلّى اللّه عليهِ وسلّمَ؟

## الدرس التاسع والأربعون

### حُرُوفُ التَّنْبِيه

حُرُوفُ التَّنْبِيهِ: حُرُوفٌ وُضِعَتْ لِتَنْبِيهِ الْمُخَاطَبِ، لَئَلاَّ يَفُوتَهُ شَيْءٌ مِنَ الحُكْمِ، وهِـيَ ثَلاثَـةٌ: (أَما، أَلا، ها).

ولا تَدْخُلُ (ألا و أمَا) إلاّ عَلى الجُملَةِ ،اسْمِيَّةً كَانَتْ ، نَحْوُ قَوْلِـهِ تَعَـالى: ﴿ أَلاَ إِنَّ حِـزْبَ اللَّهِ هُمْ الْمُفْلِحُونَ﴾(المجادلة / ٢٢) ، أوْ فِعْلِيَّةً ، نَحْوُ (ألاَ لاَ تَفْعَلْ ، وأمَا لا تَضرِبْ).

و (هَا) تَدخُلُ عَلى: الجُمْلَةِ ، نَحْوُ (هَا زَيْدٌ قَائِمٌ). والمُفْرَدِ نَحْوُ (هذا وهؤُلاءِ).

### حُرُوفُ النِّـداء

حُرُوفُ النِّدَاءِ خَمْسَةٌ: ١و٢-(الهَمْزَةُ المَفْتُوحَةُ) و (أيْ) وهُمَا لِلقَرِيبِ.

٣و٤-(أيَا وهَيَا) وهُـمَا لِلبَعِيدِ.

٥-(يَا) وهِيَ لِلقَرِيبِ والبَعِيدِ والمُتَوَسِّطِ وقَدْ مَرَّتْ أَحْكَامُهَا.

---

## وانەی چل و نۆ

### حەرفەکانی تەنبیه[1] (ئامرازی ورياكردنەوە)

حەرفەكانی تەنبیه: كۆمەڵە حەرفێكن دانراون بۆ ئاگاداركردنەوەی گوێگر، بۆ ئەوەی هیچ شتێك لە حوكمەكەی لەدەست نەچێت، ئەوانیش سیانن: (اما، الا، ها).

(الا)و (اما) تەنها سەر ڕستە دەچن، ئیتر ڕستەی ئیسمی بێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ألا إن حزب الله هم المفلحون﴾. یان فیعلی، وەك: (الا لا تفعل)یان(اما لا تضرب).

(ها)یش دەچێتە سەر: ڕستە، وەك: (ها زيد قائم)، و تاك، وەك: (هذا) و (هؤلاء).

### حەرفەكانی نیدا (ئامرازی بانگكردن)

حەرفەكانی نیدا پێنجن:١، ٢.هەمزەی فەتحەدار و(اي)، ئەم دووانە بۆ بانگكردنی كەسی نزیكن.

٣،٤. (ايا) و(هيا) ئەم دوانەش بۆ دوور دەبن.

٥. (يا) بۆ دوور و نزیك و ناوەندی، پێشتریش حوكمەكانیان باسكرا.

---

[1] لە ڕێزمانی كوردیدا لە چوارچێوەی ئامرازەكانی بانگكردندا باس كراون.

## حُرُوفُ الإيجَـاب

حُرُوفُ الإيجابِ سِتَّةٌ: (نَعَمْ ، و بَلى ، و إي ، و أَجَلْ ، و جَيْرِ ، و إنَّ).

أمّا (نَعَمْ) فَلِتَقْرِيرِ كَلامٍ سَابِقٍ ، مُثْبَتاً كَانَ أوْ مَنفِيّاً.

و(بَلى) تَخْتَصُّ بِإيجَابِ النَّفْي، سَواءٌ كَانَ مَعَ الاسْتِفْهامِ كَقَوْلِهِ تَعالى:﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى ﴾(الأعراف/١٧٢)، أوْ مُجَرَّداً عَنْهُ كَمَا يُقَالُ: (لَمْ يَقُمْ زَيْدٌ ، قُلْتُ بَلى) أيْ قَدْ قَامَ.

و (إي) حَرْفُ جَوابٍ بِمَعْنى (نَعَمْ) ولا يُسْتَعْمَلُ إلاّ مَعَ القَسَمِ ، كَمَا إذا قِيـلَ لَـكَ (هَـلْ كَانَ كَذا؟) تَقُولُ: (إي وَاللّهِ).

و (أَجَلْ ، وجَيْرِ ، وإنَّ) ، أيْ أُصَدِّقُكَ فِي هذا الخَبَرِ.

---

### حەرفەکانی ئیجاب ( هاوەڵکاری ئەرێ )

حەرفەکانی ئیجاب شەشن: (نعم، بلى، إي، اجل، جير، إن).

(نعم)بۆ تەقریرکردنی-پەسەندکردن- قسەیەکە کەپێشتر کراوە[1]، موسبەت بێت یان مەنفی.

(بلى) تایبەتە بە پەسەندکردنی کردنی نەفی، ئیتر یەکسانە لەگەڵ پرسیاردا بێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿ ألست بربكم قالوا بلى﴾، یان لەگەڵیدانەبێت، وەك ئەوەی کە دەگوترێت: (لم يقم زيد، قلت بلى)واتە: (قد قام)-ئەو هەستاوەتەوە-.

(إي) حەرفی وەڵامە بە مانای (نعم)، بەکاریش نایەت لەگەڵ سوێندندا نەبێت، وەك ئەوەی کە ئەگەر بووترێت: (هل كان كذا؟) تۆش دەڵێیت: (إي والله).

(اجل)و(جير)و(إن) دێن بە مانای: بڕوات پێ دەکەم لەم خەبەرەدا.

---

١ مەسەلەی إيجاب جودایە لە جواب، ئیجاب وەك ووتمان پەسەند کردنی قسەیەکە یان حوکمێکە کە دەگوترێت، بەڵام جواب لە وەڵامی ئیستیفهامدایە، لێرەدا (نعم) بۆ تەقریرکردنی قسەیەك دەبێت کە کەسێك دەیکات، وەك ئەوەی کەسێك قسەت بۆ بکات تۆش وەك ئاماژەیەك بەوەی کە قسەکانی لای تۆ پەسەندن لە نێوان قسەکانیدا دەڵێیت (نعم)، کە لە زمانی کوردیشدا ئێمە (بەڵێ) بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنین هەر وەك چۆن لە وەڵامی پرسیاردا بەکاری دەهێنین.بەڵام نوسەر ئەم دوو مانایەی تێکەڵ کردووە، چونکە(إيجاب) لە (وجب)ەوە هاتووە و (جواب) لە (جوب)ەوە.

**الخُلاصَةُ:**

حُرُوفُ التَّنْبِيهِ: مَا وُضِعَتْ لِتَنْبِيهِ الْمُخَاطَبِ، لِئَلاَّ يَفوتَهُ شَيءٌ مِنَ الْحُكْمِ، وهِيَ ثَلاثَةٌ:(أَمَا، و أَلا ، و هَا).

حُرُوفُ النِّداءِ خَمْسَةٌ: (يَا ، وأَيَا ، وهَيَا ، وإِي ، والْهَمزَةُ الْمَفْتُوحَةُ).

حُرُوفُ الإِيجَابِ سِتَّةٌ: (نَعَمْ ، وبَلَى ، وإِي ، وأَجَلْ ، وجَيْرِ ، وإِنَّ).

**أَسْئِلَة:**

١-عَدِّدْ حُرُوفَ التَّنْبِيهِ ، وبَيِّنْ لِأَيِّ مَعْنًى وُضِعَتْ ، ومَثِّلْ لَهَا.

٢-عَلى أيِّ الجُمَلِ تَدْخُلُ (ألا ، أمَا)؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-هَلْ تَدْخُلُ (هَا) عَلى الْمُفْرَدِ أَمْ عَلى الْجُمْلَةِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٤-مَا هِيَ حُرُوفُ النِّداءِ؟ نَادِ بِها فِي أَمْثِلَةٍ مُفِيدةٍ.

٥-مَا هِيَ حُرُوفُ النِّداءِ الْمُخْتَصَّةُ بِالقَرِيبِ؟ ومَا هِيَ الْمُخْتَصَّةُ بِالبَعِيدِ؟

---

**پوخته**

حەرفەكانی تەنبیه: ئەوانەن كە دانراون بۆ ئاگاداركردنەوەی گوێگر، بۆ ئەوەی شتێك لە خەبەرەكەی لەدەست نەچێت، ئەوانیش سیانن: (اما، الا، ها).

حەرفەكانی نیدا پێنجن: (یا، أیا، هیا، أي، هەمزەی فەتحەدار).

حەرفەكانی ئیجاب، شەشن: (نعم، بلى، إي، اجل، جير، إن).

**پرسیار:**

١. حەرفەكانی تەنبیه بژمێرە، و ڕوونی بكەوە كە بۆ چ مانایەك دانراون، و نموونەیان بۆ بێنەوە.

٢. (الا) و (اما) دەچنە سەر چ جۆرە ڕستەیەك؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣. ئایا (ها) دەچێتە سەر تاك یان سەر ڕستە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.

٤. حەرفەكانی نیدا چین؟ لە چەند نموونەیەكی بەسوودا بانگیان پێ بكە.

٥. حەرفەكانی نیدای تایبەت بە نزیك كامانەن؟ ئەی ئەوانەی كە تایبەتن بە دوور؟

٦- مَا هُوَ حَرْفُ النِّداءِ الْمُشْتَرِكُ فِيهِ البَعِيدُ والقَرِيبُ والْمُتَوسِّطُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٧-مَا هِيَ حُرُوفُ الإيجَابِ؟ مَثِّلْ لَهَا فِي جُمَلٍ.

٨-لِأيِّ مَعنىً تُستَعمَلُ (نَعَمْ)؟ مَثِّلْ لِذلِكَ.

٩-بِمَ تَختَصُّ (بَلَى) مَثِّلْ لَها.

١٠-مَا هِي حُرُوفُ الإيجَابِ الَّتِي تُسْتَعْمَلُ لِلتَّصْدِيقِ؟

١١-لِأيِّ مَعنىً تُستَعمَلُ (إِيْ) مَثِّلْ لَهَا.

---

٦. ئەو حەرفەی ئیدا کە بۆ دوور و ناوەندی و نزیك بانگی پێ دەکرێت کامەیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٧. حەرفەکانی ئیجاب چین؟ نموونەیان بۆ بێنەوە لە ڕستەدا.

٨. (نعم) بۆ چ مانایەك بەکاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٩. (بلی) تایبەتە بە چی؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

١٠. ئەو حەرفانەی ئیجاب کامانەن کە بەکار دێن بۆ بڕوا پێکردن؟

١١.(إي) بۆ چ مانایەك بەکاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ-

١. لە چەند ڕستەیەکدا ئاگادار بکەرەوە بەهۆی حەرفەکانی تەنبیهەوە.

٢. بانگ بکە بە هۆی حەرفەکانی تایبەت بە نزیك و دوور و ناوەندی و ئەو حەرفەی کە هاوبەشە لە نێوان هەموویاندا.

ب.مانای حەرفەکانی ئیجاب لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیاری بکە:

١-هَلْ رَأيْتَ سَعِيداً؟ نَعَمْ.

٢- قال تعالى: ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ﴾(الزمر / ٣٦).[١]

---

١ ئەم پرسیارە وەڵام نەدراوەتەوە بەڵام قورئان خوێن خۆی لە وەڵامیدا دەڵێت: بلی.

٣-أَكَانَ يَعْمَلُ فِي البَيتِ؟ إيْ وأَبِيكَ.

٤-سافَرَ سَعِيدٌ؟ إنَّ.

٥-لَدَيكَ نُقُودٌ؟ أَجَلْ.

٦- هُوَ مَرِيضٌ؟ جَيْرِ.

٧-ألا تَأكُلُ مَعَنا؟ بَلى.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١-ألا عَامِلٌ لِنَفْسِهِ قَبْلَ يَوْمِ بؤْسِهِ؟

٢- قال تعالى:﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ (٨)قَالُوا بَلَى ﴾ (الملك/٨،٩).

٣- قال تعالى:﴿وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾(يونس/٥٣).

٤-هَلْ كَتَبْتَ الرِّسَالَةَ؟ نَعَمْ.

٥-عِنْدَكَ ضَيْفٌ؟ أَجَلْ.

## الدرس الخمسون

## الحُرُوفُ الزَّائِدَةُ

قَدْ تَقَعُ بَعْضُ الحُرُوفِ زَائِدَةً فِي الكَلامِ بِحَيْثُ لا يَتَغَيَّرُ المَعْنى بِحَذْفِها.

وحُرُوفُ الزِّيادَةِ سَبْعَةٌ: إنْ ، وأَنْ ، ومَا ، ولا ، ومِنْ ، والبَاءُ ، واللّامُ.

وتُـزَادُ (إنْ): ١–مَعَ (مَا) النَّافِيَةِ ، نَحْوُ (مَا إنْ زَيْدٌ قَائِمٌ).

٢–مَعَ (مَا) المَصْدَرِيَّةِ ، نَحْوُ (صَلِّ مَا إنْ دَخَلَ الوَقْتُ).

٣–مَعَ (لَمَّا) ، نَحْوُ (لَمَّا إنْ جَلَسْتَ جَلَسْتُ).

وتُزادُ (أَنْ):

١–مَعَ (لَمَّا) ، نَحْوُ قَولِهِ تَعَالى: ﴿ فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ ﴾(يوسف / ٩٦).

٢–بَيْنَ (واو) القَسَمِ و (لَوْ) نَحْوُ (وَاللّهِ أنْ لَوْ قُمْتَ قُمْتُ).

---

## وانەی پەنجا

## حەرفە زیادەکان[1]

دەگونجێت هەندێ لە حەرفەکان زیادە بن لە قسەدا، بە جۆرێك ماناکە بە لابردنیان نەگۆڕێت.

حەرفە زیادەکانیش حەوتن: (إن، أن، ما، لا، من، باء، لام).

(إن) زیاد دەکرێت:

١. لەگەڵ (ما)ی نافیەدا، وەك: (ما إن زید قائم).

٢. لەگەڵ (ما)ی مەصدەریەدا دا، وەك: (صلّ ما إن دخل الوقت).

٣. لەگەڵ (لمّا)دا، وەك: (لمّا إن جلست جلست).

(أن)یش زیاد دەکرێت:

١. لەگەڵ (لمّا)دا، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿فلمّا أن جاء البشیر﴾.

٢. لەنێوان واوی سوێند و (لو)دا، وەك: (والله أن لو قمت قمت).

---

١ لە ڕێزمانی کوردیدا زۆرجار لەشێوەی ئامرازی پەیوەندی لێکدراودا دێن ، وەك:(من لە بۆ تۆمەو تۆ لە بۆ کێتە)

وتُزادُ (مَا):

١-مَعَ (إذ ، ومَتى ، وأيّ ، وأَيْنَ ، وإنِ الشَّرْطِيَّةِ) كَمَا تَقُولُ: (إذ مَا صُمْتَ صُمْتُ). وكَذا البَواقِي.

٢-بَعْدَ بَعْضِ حُرُوفِ الجَرِّ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالى:﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنْ اللّهِ﴾(آل عمران/١٥٩).

وتُزادُ (لا) قَلِيلاً:

١-مَعَ (الواو) بَعْدَ النَّفْيِ ، نَحْوُ (مَا جَاءَ حَمِيدٌ ولا مَحْمُودٌ).

٢-بَعْدَ (أنْ) المَصْدَرِيَّةِ ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعالى: ﴿ قَالَ مَا مَنَعَكَ ألاّ تَسْجُدَ إذ أمَرْتُكَ﴾(الأعراف / ١٢).

٣-قَبْلَ القَسَمِ ، كَقَوْلِهِ تَعالى:﴿ لاَ أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ وَلاَ أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾(القيامة/ ١)، بِمَعْنى أُقْسِمُ.

وأمّا (مِنْ ، والبَاءُ ، واللاّمُ) فَقَدْ تَقَدَّمَ ذِكْرُهَا فِي حُرُوفِ الجَرِّ فَلا نُعِيدُهَا.

---

(ما)يش زیاد دەکرێت:

١. لەگەڵ: (إذ) و (متى) و (أيّ) و (اين) و (إن)ی شەرتییدا، وەك: (إذما قمت قمت)، ئەوانیدیش هەربەم شێوە.

٢. پاش هەندێ لە حەرفەکانی جەڕ، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿ فبما رحمة من الله﴾.

(لا)یش بە کەمی زیاد دەکرێت:

١. لەگەڵ واو دا لەپاش نەفی، وەك: (ماجاء حميد ولا محمود).

٢. پاش (ان)ی مەصدەریە، وەك فەرموودەی خوای مەزن: ﴿مامنعك ألاّتسجد إذ أمرتك﴾.

٣. پێش سوێند، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿لا أقسم بيوم القيامة ولا أقسم بالنفس اللوامة﴾ بە مانای(اقسم).

(من)و (باء)و (لام)یش لە حەرفەکانی جەڕدا باسمان لێوە کردن و لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

## الحُرُوفُ المَصدَرِيّةُ

الحُرُوفُ المَصْدَرِيَّـةُ ثَلاثَةٌ: (ما ، وأنْ ، وأنَّ). فَالأوّلانِ لِلجُمْلَةِ الفِعْلِيَّـةِ ، كَقَوْلِهِ تَعَـالَى: ﴿ وَضَـاقَتْ عَلَـيْكُمْ الأَرْضُ بِمَـا رَحُبَـتْ ثُـمَّ وَلَّيْـتُمْ مُدْبِرِينَ﴾(التوبـة/٢٥) ، أيْ بِرَحْبِهـا ،

وكَقَوْلِ الشّاعِرِ: يَسُرُّ المَرْءُ مَا ذَهَبَ اللَّيَالي وكَانَ ذَهَابُهُنَّ لَهُ ذَهَابَا [1]

و(أنْ)كَقَوْلِهِ تَعَالَى:﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إلاَّ أَنْ قَالُوا﴾(النمل/ ٥٦، العنكبوت/ ٢٤).

و (أنَّ) لِلجُملَةِ الاسْمِيَّةِ ، نَحْوُ (عَلِمْتُ أنَّكَ قائِمٌ) ، أيْ عَلِمْتُ قِيامَكَ.

### اَلخُلاصَةُ:

حُرُوفُ الزِّيَادَةِ: هِيَ الَّتِي إذا حُذِفَتْ مِنَ الكَلامِ لا يَتَغَيَّرُ مَعْنـاهُ. وهِـيَ سَـبْعَةٌ: إنْ ، وأَنْ ، وما ، ومِنْ ، والبَاءُ ، واللاَّمُ. اَلحُرُوفُ المَصْدَرِيَّةُ ثَلاثَةٌ: (مَا ، وأَنْ ، وأَنَّ).

---

## حەرفە مەصدەریەکان[2]

حەرفە مەصدەریەکان سیانن: (ما، ان، انّ). دووانەکەی سەرەتا بۆ ڕستەی فیعلی دەبن، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿وضاقت عليهم الأرض بما رحبت﴾، واتە: (برَحْبها)، هەروەها وەك

گووتەی شاعیر: يسرّ المرء ما ذهب الليالي وكان ذهابهنّ له ذهابا

(ان)یش وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿فما كان جواب قومه إلاّ أن قالوا اقتلوه أو حرّقوه﴾.

(انّ)یش بۆ ڕستەی ئیسمیی بەکاردێت، وەك: (علمت انّك قائم)، واتە: (علمت قيامك).

### پوختە

حەرفەکانی زیادە: ئەوانەن کە ئەگەر لە قسەدا لابران ماناکەی ناگۆڕێت. ئەوانیش حەوتن: (إن، أن، ما، مِن، باء، لام).حەرفە مەصدەریەکان سیانن: (ما، ان، انّ).

---

١ - (ما)مَصدَرِيَّةٌ، وهِيَ مَعَ مابَعْدَها بتأويلِ المصدرِ فاعلٌ لـ(يَسرُّ). والليالي: الدهورُ، والمعنى أنّ المرءَ يَفْرَحُ بمُضيِّ الزّمانِ، ولكِنْ لا يَلْتَفِتُ أنّ مُضيَّهُ يَنقصُ من عُمْرِهِ ، و يُقرِّبُهُ منَ الموتِ .

٢ لە ڕێزمانی کوردیدا دەتوانین بە (کە)ی ئامرازی لێکدەر کە لەپێش پارستەی ناویەوە دێت واتای بکەین کە پارستەیەك کە کاری تێدایە دەیکاتە پارستەی ناویی وەك: (دەزانم کە دەڕۆیت)کە بە پێی لێکدانەوە عەرەبیەکە دەبێتە ( ڕۆیشتنت دەزانم).

## أسئلة:

١-مَا هِيَ حُرُوفُ الزِيادَةِ؟ مَثِّلْ لِزِيادَتِها.

٢-مَتَى تُزادُ (أنْ)؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٣-أُذكُرْ مَوارِدَ زِيادَةِ (إنْ) مَعَ إيْرادِ مِثَالٍ.

٤-مَعَ أيِّ الحُرُوفُ تُزادُ (مَا)؟ مَثِّلْ لِذلِك بِجُـمَلٍ مُفِيدَةٍ.

٥-مَعَ ماذا تُزادُ (لا)؟ وكَيْفَ ذلِك؟ أُذكُرْ ذلِك ومَثِّلْ لَهَا.

٦-عَدِّد الحُرُوفَ المَصْدَرِيَّةَ ، وأدْخِلْها فِي جُمَلٍ مُفِيدَةٍ.

٧-بِمَ تَختَصُّ (ما ، وأنْ) المَصْدَرِيَّتان؟ مَثِّلْ لذلِك.

٨-هَلْ تَختَصُّ (أنَّ) بالأفْعالِ أمْ لا؟ وَضِّحْ ذلِك ومَثِّلْ لَهَا.

---

## پرسیار:

١. حەرفەکانی زیادە چین؟ نموونەیان بۆ بێنەوە کە زیادەبن.

٢. کەی (ان) زیاد دەکرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٣.ئەو جێیانەی کە (إن) تێیاندا زیاد دەکرێ بڵێ بە نموونەوە.

٤.(ما) لەگەڵ چ حەرفێکدا زیاد دەکرێت؟ لە ڕستەیەکی بە سووددا نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. (لا) لەگەڵ چیدا زیاد دەکرێت؟ ئەوە چۆن دەبێت؟ بە نموونەوە باسی بکە.

٦. حەرفە مەصدەریەکان بژمێرە، و بیانخەرە ڕستەی بەسوودەوە.

٧. (ما)و (ان)ی مەصدەر تایبەتن بە چیی؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨. ئایا (أنْ) تایبەتە بە فیعلەکانەوە یان نا؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

## ڕاهێنان:

أ- لەم ڕستانەدا حەرفە زیادەکان دەربهێنە، و ڕووی زیادبوونەکەیان بڵێ:

١-مَتَى مَا جَلَسْتَ جَلَسْتُ.　　٢-مَا سَافَرَ سَعِيدٌ ولا خَالِدٌ.

٣-قال تعالى:﴿لاَ أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾(القيامة/١).　　٤-مَا رَدَعَكَ ألاّ تَفْعَلَ ذلِك.

٥-لَمَّا أنْ سَافَرْتَ سَافَرْتُ.　　٦-واللهِ أنْ لَوْ أتَيْتَ أتَيْتُ.

ب- ئەمانەی خوارەوە دروست بکە:

١- سێ ڕستە کە (إن) تێیاندا زیادە بێت.

٢- دوو ڕستە کە (ان) تێیاندا زیادە بێت.

٣- سێ ڕستە کە (لا) تێیاندا زیادە بێت.

٤- سێ ڕستە بێنەوە کە (أن) و (أنْ) و (ما)تێیاندا بۆ مەصدەر بن.

ج- حەرفە مەصدەریەکان لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە و چۆنیەتی تەئویل کردنیان -لێکدانەوەیان- بە مەصدەر ڕوون بکەوە:

١-عَلِمْتُ أنَّكَ مُسافِرٌ.

٢-قَالَ لي: أَنْ تَكْتُبُوا فَائِدَةٌ لَكُمْ.

٣- قال تعالى: ﴿ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ ﴾(المائدة / ١١٧).

٤-رَأَيْتُ أنَّـك ماهِرٌ.

٥-خِلْتُ أَنْ يَكْتُبَ إليْكَ رِسَالَةً.

د. ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ﴾(المائدة / ٩٦).

٢-سَرَّنِي أنْ تُلازِمَ الفَضيلَةَ.

٣- قال تعالى: ﴿ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ ﴾(التوبة / ١٢٨).

٤- قال الشاعر فما إنْ طِبُّنَا جُبْنٌ ولكن... مَنَايَانَا وَدَوْلَةُ آخَرِينا

٥-وَاللّهِ أنْ لَوْ أَتَيْتَ احْتَرَمْتُـكَ.

٦- قال تعالى: ﴿ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ ﴾(المائدة / ١١٧).

## الدرس الحادي والخمسون

### حَرْفا التَّفْسِيرِ

وهُما:(أَيْ و أَنْ). فـ(أَيْ)كَقَوْلِهِ تَعَالَى:﴿وَاسْأَلْ الْقَرْيَةَ ..﴾(يوسف/٨٢) أيْ أَهْلَ القَرْيَةِ ، كَأَنَّكَ قُلْتَ: تَفْسِيرُهُ أَهْلُ القَرْيَةِ. و(أَنْ) إنَّما يُفَسَّرُ بِهِ بِمَعْنى القَوْلِ كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿ وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ﴾(الصافات/١٠٤)، فَلا يُقَالُ(قُلْنَاهُ أَنْ) إذ هُوَ لَفْظُ القَوْلِ، لا مَعْنَاهُ.

### حُرُوفُ التَّحْضِيضِ

حُرُوفُ التَّحْضِيضِ أَرْبَعَةٌ وهِيَ: هَلاَّ ، وأَلا ، ولَوْلا ، ولَوْما ، ولَها صَدْرُ الكَلامِ ، ومَعْنَاهَا حَثٌّ عَلى الفِعْلِ إذا دَخَلَتْ عَلىَ المُضارِعِ نَحْوُ (هَلاَّ تَأْكُلُ)

---

## وانەی پەنجاویەك

### دوو حەرفەكەی تەفسیر [1]

ئەوانیش بریتین لە (اي) و (ان).

(اي)وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿واسأل القرية ...﴾، واتە:(اهل القرية)، ئەمە وەك ئەوە وایە كە گوتبێتمان: تەفسیرەكەی بریتیە لە (اهل القرية).(ان)یش تەنها فیعلێكی پێ تەفسیر دەكرێت كە بەمانای(قول)بێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿ و ناديناه أن يا إبراهيم﴾، ناگوترێت:(قلناه ان)[2] چونكە ئەمە خۆی خودی لەفزی قەولەكەیە، نەك ماناكەی.

### حەرفەكانی تەحضیض

حەرفەكانی تەحضیض چوارن، كە بریتین لە:(هلا، الا، لولا، لوما)، ئەمانە دەبێت لەسەرەتای ڕستەوەبن، گەر چوونەسەر موضاریع ماناكەیان دەبێتە هاندان لەسەر كارێك وەك:(هلا تأكل)،

---

١ لە زمانی كوردیدا (ای) بە مانای (واتە) دێت، و دەبێتە ووشەی بەراورد یان هاوواتاكردن. ووشەی (ان)یش بە مانای (كە) دێت، وەك: (پێم گووت كە بڕوات).

٢ بەم جۆرە نوسراوە، بەڵام دەبوا بگوترایە: (قلنا ان)، چونكە ئەوەی لە پاش قەولەوە دێت مەقولەكەیە كە دەبێتە مەفعول بیهی، ئەگەر بڵێین (قلناه) ئەوە ئەو هاءە ناگەڕێتەوە بۆ كەسەكە بەڵكو بۆ مەقولەكە دەگەڕێتەوە، ئەمە بە پێچەوانەی (نادیناه) كە لێرەدا بۆ ئیبراهیم دەگەڕێتەوە.

، ولَوْمٌ وتَعيِيرٌ إنْ دَخَلَتْ عَلى المَاضِي ، نَحْـوُ (هَـلاَّ أَكْرَمْـتَ زَيْـداً) ، وحِينَئِـذٍ لا يَكُـونُ تَحْضِيضاً إلاّ بِاعْتِبَارِ مَا فَاتَ. ولا تَدْخُلُ إلاّ عَلى الفِعْلِ كَمَا مَرَّ.

وإنْ وَقَعَ بَعْدَهَا اسْمٌ ، فَبِإضْمَارِ فِعْلٍ ، كَما تَقُولُ لِمَنْ نَصَرَ قَوْماً هَـلاَّ سَـعِيداً ، أيْ هَـلاَّ نَصَرْتَ سَعِيداً.

وجَمِيعُها مُرَكَّبَةٌ ، جُزْؤُها الثَّانِي حَـرْفُ النَّفـيِ ، والجُـزْءُ الأوَّلُ حَـرْفُ الشَّـرْطِ وحَـرْفُ المَصْدَرِ وحَرْفُ الاسْتِفْهَامِ

و (لَوْلا ، لَوْمَا) لَهُما مَعْنىً آخَرُ ، وهُوَ امتِناعُ الجُمْلَةِ الثَّانِيَةِ لِوُجُودِ الجُمْلَـةِ الأولى ، نَحْـوُ (لَولا عَلِيٌّ لَهَلَكَ عُمَرُ) وحِينَئِذٍ يُحْتَاجُ إلى جُمْلَتَيْنِ أُولاهُما اسْمِيَّةٌ أبَداً.

---

ئەگەریش چوونە سەر ماضی بۆ لۆمە و عەیبدارکردن دەبن ، وەك: (هلا اكرمت زيدا)، ئەوكات نابێتە تەحضیض مەگەر بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لەدەست چووە. هەروەك باسمانکرد ئەمانە جگە لە فیعل ناچنە سەر شتێکی تر.

ئەگەر ئیسمێك بە دوایاندا هات، ئەوە فیعلێکی شاراوەی لەگەڵدایە، هەروەك تۆ بە کەسێك دەڵێیت کە کەسانێکی سەرخستبێت: (هلا سعيدا)، واتە: (هلا نصرت سعيدا) -ئەی نەدەبوو سەعید سەربخەی-.

هەمووشیان مورەکەبن -لێکدراون-، بەشی دووەمیان حەرفی نەفیە، و بەشی یەکەمیان حەرفی شەرت، و حەرفی مەصدەر، و حەرفی ئیستیفهامە[1].

(لولا)و(لوما) مانایەکی تریان هەیە، ئەویش بریتیە لە ڕوونەدانی ڕستەی دووەمیان لەبەر هەبوونی ڕستەی یەکەم، وەك: (لولا علي لهلك عمر)، لەم کاتەدا پێویستیی دەبێت بە دوو ڕستە کە یەکەمیان هەردەبێت ئیسمیی بێت.

---

[1] واتە یەکێك لەم سیانەیە.

## الخُلاصةُ:

حَرْفا التَّفْسِيرِ: (أَيْ ، وأَنْ) ويُشْتَرَطُ فِي (أَنْ) يَكُونُ التَّفْسِيرُ لِمَعْنى القَوْلِ لا لِلَفْظِهِ.

حُرُوفُ التَّحْضِيضِ: حُرُوفٌ تُفِيدُ الحَثَّ إذا دَخَلَتْ عَلى الفِعْلِ المُضارِعِ ، واللَّوْمَ والتَّعيِيرَ إذا دَخَلَتْ عَلَى الماضِي.

ولِلتَّحْضِيضِ أَرْبَعَةُ حُرُوفٍ (هَلاَّ ، أَلا ، لَوْلا ، لَوْمَا) ولا تَقَعُ إلاّ فِي صَدْرِ الكَلامِ ، ولا تَدْخُلُ إلاّ عَلى الفِعْلِ. ولِـ (لَوْلا ، ولَوْمَا) مَعْنىً آخَرُ ، وهُوَ امتِنَاعُ وُجُودِ الجُمْلَةِ الثَّانِيَةِ لِوُجُودِ الأُولى ، وحِينَئِذٍ لا بُدَّ أَنْ تَكُونَ الجُمْلَةُ الأُولى اسْمِيَّةً أَبداً.

## أسئلة:

١-أُذكُرْ حَرْفَي التَّفْسِيرِ ، وأَدْخِلْ كُلاًّ مِنْهُما فِي جُمْلَةٍ مُفِيدَةٍ.

٢-عَدِّدْ حُرُوفَ التَّحْضِيضِ ، وبَيِّنْ مَوْقِعَها مِنَ الجُمْلَةِ.

٣-مَا مَعْنى حُرُوفِ التَّحْضِيضِ إذا دَخَلَتْ عَلى المُضارِعِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

---

## پوختە

دوو حەرفی تەفسیر بریتین لە: (اي)و(ان)، بە مەرجیش گیراوە لە (ان)دا کە تەفسیرەکەی بۆ مانای (قول)بێت نەك بۆ لەفزەکەی.

حەرفەکانی تەحضیض: کۆمەڵە حەرفێکن ئەگەر چوونە سەر موضاریع مانای تەحضیض دەگەیەنن، ئەگەریش چوونە سەر ماضی مانای لۆمە و عەیبدارکردن دەگەیەنن.

تەحضیض چوار حەرفی هەیە: (هلا، الا، لولا، لوما)، کە دەبێت لەسەرەتای ڕستەوە بن، جگە لە فیعل ناچنە سەر شتی تر، (لولا) و (لوما) مانایەکی تریشیان هەیە، ئەویش نەبوونی ڕستەی دووەمە لەبەر هەبوونی یەکەم، لەم کاتانەشدا پێویستە هەمیشە ڕستەی یەکەم ئیسمی بێت.

## پرسیار:

١. دوو حەرفەکەی تەفسیر بڵێ، و هەریەکەیان بخەرە ڕستەیەکی بەسوودەوە.

٢. حەرفەکانی تەحضیض بژمێرە، و جێگایان لە ڕستەدا ڕوون بکەوە.

٣.ئەگەر حەرفەکانی تەحضیض بچنەسەر موضاریع مانایان دەبێتە چی؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٤-مَاذا تُفِيدُ حُرُوفُ التَّحْضِيضِ إذا دَخَلَتْ عَلى الماضي؟ مَثِّلْ لَها.

٥-هَلْ تَدْخُلُ حُرُوفُ التَّحْضِيضِ عَلى الاسْمِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثال.

٦-هَلْ يُوجَدُ لِـ (لَوْلا ، ولَوْمَا) مَعْنىً غَيرُ التَّحْضِيضِ؟ اُذكُرْ مِثالاً لَهُ.

---

٤. حەرفەکانی تەحضیض چ مانایەك دەگەیەنن ئەگەر چوونە سەر ماضی؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. ئایا حەرفەکانی تەحضیض دەچنە سەر ئیسم؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٦. ئایا (لولا) و (لوما) جگە لە تەحضیض مانای تریان هەیە؟ نموونەیەکی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان

أ- حەرفەکانی تەفسیر و تەحضیض دیاری بکە، و ماناکەیان بڵێ لەم ڕستانەدا:

١-سَلِ البَيْتَ عَنِ المَوْضُوعِ، أَيْ أَهْلَ البَيْتِ. ٢-نَادَيْتُ أَنْ يا سَعِيدُ تَعالَ مَعِي.

٣-هلاَّ أَكْرَمْتَ أَخاكَ؟ ٤-ألا تَذْهَبُ مَعِي إلى المُحاضَرَةِ؟

٥-هَلاَّ تَشْتَرِكُ مَعَهُم فِي الأَمْرِ؟ ٦-لَوْلا سَيْفُ خالدٍ لَما انْتَشَرَ الإسْلامُ.

٧-لَوْمَا مُحَمَّدٌ لَرَسَبْتُ.

ب. وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەرەوە:

١. دوو ڕستە بێنەوە کە بە (أی) و (أن) تەفسیر کرابن.

٢. (ألا) و (هلا) و (لولا) و (لوما) بخەرە ڕستەی بەسوودەوە.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ ﴾(النور / ٢٢).

٢- قال تعالى: ﴿ لَوْلاَ أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ... ﴾(المنافقون / ١٠).

٣- قال تعالى: ( لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ).

٤-هَلاَّ يَرْتَدِعُ أَخُوكَ عَنْ غَيِّهِ.

٥- قال تعالى: ﴿ فَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ أَنْ اصْنَعْ الْفُلْكَ ﴾(المؤمنون / ٢٧).

## الدرس الثاني والخمسون

## حَرْفُ التَّوَقُّعِ و حرفا الإستفهام

حَرْفُ التَّوَقُّعِ (قَدْ): وهُوَ حَرْفٌ يَدْخُلُ عَلى الفِعْلِ الْمَاضِي ، لِتَقْرِيبِهِ إلى الحَالِ ، نَحْوُ (قَدْ رَكِبَ الأَمِيرُ) ، أَيْ قَبْلَ هذا ، ولِأجْلِ ذلِك سُمِّيَتْ حَرْفَ التَّقْرِيبِ أَيْضاً. وَلِهذا تَلْزَمُ الماضِي لِيَصْلُحَ أَنْ يَقَعَ حالاً. وقَدْ يَجِيءُ لِلتَّأكِيدِ إذا كَانَ جَواباً لِلسَّائِلِ فَتَقُولُ فِي جَوابِ مَنْ قَالَ: (هَلْ قَامَ زَيْدٌ؟: قَدْ قَامَ زَيْدٌ).

وتَدْخُلُ (قَدْ) عَلى المُضَارِعِ فَتُفِيدُ التَّقْلِيلَ ، نَحْوُ (إنَّ الكَذُوبَ قَدْ يَصْدُقُ ، وإنَّ الجَوادَ قَدْ يَفْتُرُ). وقَدْ يَجِيءُ لِلتَّحْقِيقِ ، كَقَوْلِهِ تَعَالى: ﴿ قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ ﴾(الأحزاب / ١٨) ، ويَجُوزُ الفَصْلُ بَيْنَها وَبَيْنَ الفِعْلِ بِالقَسَمِ ، نَحْوُ (قَدْ وَاللَّهِ أَحْسَنْتَ).

---

## وانەی پەنجاو دوو

### حەرفی تەوەقوع ( پێشبینی ) و دووحەرفەکەی ئیستیفهام ( ووشەی پرس )

حەرفی تەوەقوع بریتیە لە (قد): ئەویش حەرفێکە دەچێتە سەر فیعلی ماضی، بۆ ئەوەی نزیکی بکاتەوە لە ئێستاوە، وەك: (قد رکب الأمیر)، واتە: پێش ئێستا. هەر لەبەر ئەمەیە کە ناویش نراوە بە حەرفی تەقریب -نزیککردنەوە-، بۆیە لەگەڵ ماضیدا دەبێت تا وای لێبکات بەکەڵکی ئەوە بێت بۆ ئێستا بەکار بێت[١]. دەگونجێت بۆ تەئکید بێت ئەگەر وەڵام بوو بۆ کەسێك کە پرسیار دەکات، کەواتە لە وەڵامی کەسێکدا کە دەڵێت: (هل قام زید؟) دەڵێین: (قد قام زید).

(قد) دەچێتە سەر فیعلی موضاریع ئەوکات تەقلیل -کەمکردنەوە- دەگەیەنێت، وەك: (إن الکذوب قد یصدق) و (إن الجواد قد یفتر)، هەروەها دەگونجێت بۆ تەحقیق -هاتنە ڕوودان- بێت، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿ قد یعلم الله المعوقین﴾ ، دروستیشە لەگەڵ فیعلەکەیدا جیابکرێنەوە بەهۆی سوێندەوە، وەك: (قد والله أحسنت).

---

١ نموونەی ئەمە وەك: (قد قامت الصلاة) لە قامەتدا، کە فیعلەکە ماضی یە بەڵام بۆ ئێستا بەکار دێت کە دەیانەوێت دەست بکەن بە نوێژ.

وَيُحذَفُ الفِعْلُ بَعْدَها عِنْدَ وُجُودِ القَرِينَةِ ، نَحْوُ قَوْلِ النابغة:

أَفِدَ التَّرَحُّلُ غَيرَ انَّ رِكابَنا... لَمَّا تَزُلْ بِرِحالِنا وكأنْ قَدِ [1]

أيْ: وكأنْ قَدْ زَالَتْ.

## حَرْفَا الاسْتِفهام

(الهَمْزَةُ وهَلْ) ، ولَهُما صَدْرُ الكَلامِ ، وتَـدْخُلانِ عَلـى الجُمْلَـةِ الاسْـمِيَّةِ والفِعْلِيَّـةِ ، نَحْـوُ (أَزَيْدٌ قَائِمٌ؟ وهَلْ قَامَ زَيْدٌ؟) ودُخُولُهُمَا عَلى الفِعْلِيَّةِ أَكْثَرُ ، لِكَثْرَةِ الاسْتِفْهَامِ عَنِ الفِعْلِ.

وقَدْ تُسْتَعْمَلُ الهَمْزَةُ فِي مَوَاضِـعَ لا يَجُـوزُ اسْـتِعْمَالُ (هَـلْ) فِيهـا ، نَحْـوُ (أَزَيْـداً رَأَيْـتَ؟ وأَتَضْرِبُ زَيْداً وهُوَ أَخُوكَ؟ وأَجَعْفَرٌ عِنْدَكَ أَمْ حَمِيدٌ؟) (أَوَ مَنْ كَـانَ ، و أَفَمَـنْ كَـانَ) ولا تُسْتَعْمَلُ (هَلْ) فِي هذِهِ المَواضِعِ.

---

هەندێ جار فیعلەکەی کە دەکەوێتە پاشیەوە حەزف دەکرێت ئەگەر بەڵگەیەك هەبێت لەسەری، وەك گووتەی نابیغە:

لفِدَ الترحُّلُ غيرَ انَّ رِكابنا... لما تزل برحالنا وكأن قدِ

واتە: (وكأن قد زالت).

## دوو حەرفەکەی ئیستیفهام

بریتین لە (هەمزە) و (هل)، هەردوویان سەرەتای ڕستەیان بۆ هەیە، دەچنە سەر ڕستەی ئیسمی و فیعلیش، وەك: (ازيد قائم؟ هل قام زيد؟)، چوونیان بۆ سەر فیعل زۆرترە، لەبەر زۆریی پرسیارکردن سەبارەت بە فیعل.

دەکرێت هەندێ شوێن هەبێت هەمزەی تێدا بەکاربێت و دروست نەبێت (هل)ی تێدا بەکار بهێنرێت، وەك: (ازيداً رايت؟) و (اتضرب زيداً وهو اخوك؟) و (اجعفرٌ عندك ام حميدٌ؟)هەروەها (اوَ من كان) و (افمن كان)، ئەم شوێنانە (هل)یان تێدا بەکارنایەت.

---

١ - ( أفِدَ ) بمعنى قَرُبَ. و (الترحُّل): السَفَرُ و (الرِّكاب): الدَوابُ، والباءُ في (رِحالنا) بمعنى من ، والمعنى قَرُبَ مَوْعِدُ الرَحيلِ، إلا أنّ الرِّكابَ لم تغادرْ مكانَ احبتنا بما عليها من الرِّحالِ وكأن قد زالت لوشك الارتحالِ . والشاهِدُ فيهِ حَذفُ الفِعلِ بعدَ (قد) والتقديرُ وكأن قد زالت. ( شرح الأشموني ، ١ / ٢٢ )

## الخُلاصَةُ:

(قَدْ) حَرْفُ تَوَقُّعٍ يَدْخُلُ عَلى الماضِي ، فَيُفِيدُ تَقْرِيبَهُ إلى الحَالِ.

ويَدْخُلُ عَلى المُضارِعِ فَيُفِيدُ التَّقْلِيلَ ، وقَدْ يَأتِي لِلتَّحْقِيقِ أيْضاً ، ويَجُوزُ الفَصْلُ بَيْنَهُ وبَيْنَ الفِعْلِ بِالقَسَمِ.

حَرْفَا الاسْتِفْهَامِ: (الهَمْزَةُ وهَلْ) وهُمَا يَقَعَانِ فِي صَدْرِ الكَلامِ ، ويَدْخُلانِ عَلى الجُمْلَةِ الاسْمِيَّةِ قَلِيلاً ، وعَلى الفِعْلِيَّةِ كَثِيراً ، وتُسْتَعْمَلُ الهَمْزَةُ فِي مَوَاضِعَ لا تُسْتَعمَلُ فِيها (هَلْ).

## أسْئِلَة:

١-مَا هُوَ حَرْفُ التَّوَقُّعِ؟

٢-مَتَى تُسْتَعْمَلُ (قَدْ) لِمَعنى التَّقْرِيبِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٣-هَلْ تُستَعمَلُ (قَدْ) لِلتَّأكِيدِ؟ وَضِّحْ ذِلك بِمِثالٍ.

٤-مَا مَعْنَى (قَدْ) إذا دَخَلَتْ عَلى المُضارِعِ؟ بَيِّنْ ذَلِك بِمِثالٍ.

---

## پوختە

(قد)حەرفی تەوەقوعە، دەچێتە سەر ماضی، ئەوکات نزیکبوونەوەی لە ئێستا دەگەیەنێت.

دەچێتە سەر موضاریعیش ئەوکات تەقلیل دەگەیەنێت، هەروەها هەندێ جار بۆ تەحقیق دەبێت، دروستیشە جیابکرێتەوە لە فیعلەکە بەهۆی سوێندەوە.

دووحەرفەکەی ئیستیفهام: بریتین لە(هەمزە) و(هل)، هەردووکیان لەسەرەتای ڕستەوە دێن، بەکەمیش دەچنە سەر ڕستەی ئیسمی، و بەزۆریش سەر فیعلی، هەمزە لە هەندێ جێگادا بەکار دەهێنرێت کە (هل)ی تێدا بەکار نایەت.

## پرسیار:

١.حەرفەکەی تەوەقوع چییە؟

٢. کەی (قد) بەکار دەهێنرێت بۆ مانای تەقریب؟ نموونە بۆ ئەمە بێنەوە.

٣. ئایا (قد) بۆ تەئکید بەکار دێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. مانای (قد) چیە ئەگەر بچێتە سەر موضاریع؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٥-هَلْ يُسْتَفادُ مِنْ (قَدْ) مَعْنى التَّحْقِيقِ؟ مَثِّلْ لِذلِكَ.

٦-هَلْ يَجُوزُ الفَصْلُ بَيْنَ (قَدْ) والفِعْلِ ، هَاتِ مِثالاً عَلى ذلِكَ.

٧-مَتَى يَجُوزُ حَذْفُ الفِعْلِ بَعْدَ (قَدْ)؟ مَثِّلْ لِذلِكَ.

٨-مَا هِيَ حُرُوفُ الاسْتِفْهَامِ؟

٩-مَا هِيَ المَوارِدُ الَّتِي يَجُوزُ اسْتِعْمَالُ الهَمْزَةِ فِيها دُوْنَ (هَلْ)؟

---

٥. ئایا (قد) مانای تەحقیق دەگەیەنێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. ئایا دروستە جیایی بخرێتە نێوان (قد) و فیعلەکەیەوە؟ نموونەیەك بۆ ئەمە بێنەوە.

٧. کەی دروستە پاش (قد) فیعلەکە حەزف بکەین؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨. حەرفەکانی ئیستیفهام چین؟

٩. ئەو جێگایانە کامانەن کە دەبێت هەمزیان تێدا بەکار بێت نەك (هل)؟

## ڕاهێنان:

أ- مانای (قد) لەم ڕستانەدا دیاری بکە:

١-قَدْ ذَهَبَ أَبُوكَ.

٢-قَدْ يَنقَطِعُ التَّيَّارُ الكَهْرَبائِيُّ.

٣-قَدْ جَاءَ المُسَافِرُ.

٤-قَدْ واللهِ أَجَدْتَ.

٥-جَاءَ سَعِيدٌ وقَدْ يَجِيءُ حَسَنٌ.

ب- لەم ڕستانەی خوارەوەدا حەرفەکانی ئیستیفهام دیاری بکە، و ئەوە ڕوون بکەوە کە چوونەتە سەر ڕستەی فیعلی یان ڕستەی ئیسمی:

١-أَكُتِبَ الدَّرْسُ؟

٢-هَلْ سَعِيدٌ فِي الدَّارِ؟

٣-أَمُحَمَّدٌ جَاءَ؟

٤-أَوْ مَا عِنْدَكَ حَقٌّ؟

٥-أَلَدَيْكَ خَبَرٌ صَحِيحٌ؟

٦-هَلْ تَعَلَّمْتَ القِرَاءَةَ؟

٧-هَلْ صُمْتَ آخِرَ الشَّهرِ؟

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ﴾(الشمس / ٩).

٢-قَدْ قَامَتِ الصَّلاةُ.

٣- قال تعالى: ﴿ فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ﴾(الأعراف / ٤٤).

٤- قال تعالى: ﴿ هَلْ جَزَاءُ الإِحْسَانِ إِلاَّ الإِحْسَانُ ﴾(الرحمن / ٦٠).

٥- قال تعالى: ﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴾(الشرح / ١).

## الدرس الثالث والخمسون

## حُرُوفُ الشّرْطِ

حُرُوفُ الشَّرْطِ ثَلاثَةٌ: (إِنْ ولَوْ وأمَّا) ولَهَا صَدْرُ الكَلامِ ، ويَدْخُلُ كُـلُّ وَاحِـدٍ مِنْهَـا عَلـى جُمْلَتَيْنِ ، اسْمِيَّتَيْنِ [1] كَانَتَا أوْ فِعْلِيَّتَيْنِ أوْ مُخْتَلِفَتَيْنِ.

فـ (إِنْ) لِلاسْتِقْبَالِ ، وإنْ دَخَلَتْ عَلى الفِعْلِ المَاضِي ، نَحْوُ (إِنْ زُرْتَنِي فَأُكْرِمُكَ) ، و (لَوْ) لِلمَاضِي ، وإنْ دَخَلَتْ عَلى المُضارِعِ ، نَحْوُ (لَوْ تَزُورُنِي أكْرَمْتُكَ).

وحُـرُوفُ الشَّـرْطِ يَلْزَمُهَـا الفِعْـلُ لَفْظـاً كَمَـا مَـرَّ، أوْ تَقْـدِيراً، نَحْـوُ (إِنْ أنْـتَ زَائِـرِي فَأكْرَمْتُـكَ).

ولا تُسْتَعْمَلُ (إِنْ) إلاّ فِي الأمُورِ المَشْكُوكِ فِيها مِثْلُ (إِنْ قُمْتَ قُمْتُ) فَلا يُقـالُ (آتِيـكَ إِنْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ) ،

---

## وانەی پەنجاو سێ

## حەرفەکانی شەرت ( ئامرازی لێکدەری مەرج)

حەرفەکانی شەرت سیانن:(إن، لو، أما)، هەموویان سەرەتای قسەیان بۆهەیە، هەریەکەشیان دەچێتە سەر دوو ڕستە، ئیتر دوو ڕستەکە ئیسمی بن یان فیعلی یان تێکەڵ.

(إن) بۆ ئیستیقبال -داهاتوو- دەبێت، تەنانەت ئەگەر چووبێتە سەر فیعلی ماضیش وەك: (إن زرتني فأكرمك)، (لو)یش بۆ ماضی دەبێت تەنانەت ئەگەر چووبێتە سەر فیعلی موضاریع، وەك: (لو تزورني اكرمتك).

حەرفی شەرت پێویستی بە فیعلە بەلەفزی، وەك پێشتر ڕابورد، یان بە تەقدیری، وەك: (إن انت زائري فاكرَمتك).

(إن) بەکار ناهێنرێت جگە لەو شتانەدا نەبێت کە گومانیان تێدایە، وەك: (إن قمت قمت)، کەواتە ناوترێت: (آتيك إن طلعت الشمس)،

---

[1] - لا تدخل حروف الشرط على جملتين اسميتين ، كما صرح بعد ذلك بقوله : وحروف الشرط يلزمها الفعل لفظا.

وإنَّما يُقَالُ (آتِيكَ إذا طَلَعَتِ الشَّمْسُ). و (لَوْ) تَدُلُّ عَلى نَفْيِ الجُمْلَةِ الثَّانِيَـةِ بِسَـبَبِ نَفْـيِ الجُمْلَةِ الأوْلى كَقَوْلِهِ تَعالى: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾(الأنبياء / ٢٢).

وإذا وَقَعَ القَسَمُ فِي أوَّلِ الكَلامِ وتَقَدَّمَ عَلى الشَّرْطِ يَجِبُ أنْ يَكُونَ الفِعْـلُ الَّـذِي يَـدْخُلُ عَلَيْهِ حَرْفُ الشَّرْطِ ماضِياً لَفْظاً نَحْوُ(وَاللهِ إنْ أَتَيْتَنِي لَأَكْرَمْتُكَ)، اوْ مَعْنىً، نَحْوُ (وَاللهِ إنْ لَمْ تَأْتِنِي لَأَهْجُرَنَّكَ)، وحِينَئِذٍ تَكونُ الجُمْلَةُ الثَّانِيَةُ فِي اللَّفْظِ جَواباً لِلقَسَمِ ، لا جَزاءً لِلشَّرْطِ ، فَلِذلِكَ وَجَبَ فِيها مَا يَجِبُ فِي جَوابِ القَسَمِ مِنْ الَّلامِ ونَحوِها كَمَا رَأَيْتَ فِي المِثالَيْنِ.

---

بەڵكو دەوترێت: (آتيك إذا طلعت الشمس)[1].(لو)یش دەلالەت دەكاتە سەر نەفیكردنی ڕستەی دووەم بەهۆی نەفیكردنی ڕستەی یەكەمەوە، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿لو كان فيهما آلهة إلا الله لفسدتا﴾[2].

ئەگەر سوێندێك كەوتە سەرەتای ڕستەوە و پێشكەوت بەسەر شەرتەكەدا، ئەوە پێویستە ئەو فیعلەی كە حەرفی شەرتەكەی دەچێتەسەر ماضی بێت ئیتر بەلەفزی بێت، وەك: (والله إن اتيتني لأكرمتك)، یان بە مانا، وەك: (والله إن لم تأتني لأهجرتك)[3]، لەم كاتەشدا ڕستەی دووەم وەڵامی سوێندەكە دەبێت بەلەفزی ، نەك جەزای -پاداشت- شەرتەكە، هەر لەبەر ئەوەشە كە هەرچیەك بۆ وەڵامی سوێند پێویست بێت -وەك لام و شتانی تر- هەموویانی تێدا پێویستە، هەر وەك لە دوو نموونەكەدا بینیت.

---

١ ئێمە لە كوردیدا بۆ ئەم مەبەستە تەنها ووشەی (ئەگەر)مان هەیە، ئیتر بە ناوازی قسەكەماندا بەرامبەرەكە دەزانێت كە بۆ گومان بەكارمان هێناوە یان نا، بۆ نموونە ناوازی ئەم ڕستەیە: (ئەگەر چاك بوومەوە سەردانت دەكەم)، جیاوازە لە كاتێكدا قسەی نەخۆشێك بێت كە ئومێدی بە چاك بوونەوە هەبێت، لەگەڵ ئەوەی كە قسەی نەخۆشێك بێت كە نائومێد بێت.

٢ لەم نموونەیەدا بەم شێوە ئەم هاوكێشەیە دێتەدی: ئەگەر چەند خودایەك لەم گەردوونەدا بوایەن تێك دەچوو، خۆ ئێستا گەردوون تێك نەچووە، كەواتە:چەند خودایەكی تێدانیە و تەنها یەك خودایە.

٣ فیعلی موضاریع ئەگەر (لم)ی چووە سەر ئەوا ماناكەی دەكاتە ماضی و لە ماضیەكەدا نەفی دەكات. مانای ڕستەكەیش بەم جۆرەی لێ دێت: (سوێند بەخوا ئەگەر نەهاتبی بۆلام قسەت لەگەڵ ناكەم).

وإذا وَقَعَ القَسَمِ فِي وَسَطَ الكَلامِ جَازَ أَنْ يُعْتَبَرَ القَسَمُ ، بِأَنْ يَكونَ الجَوابُ بِالّلامِ لَهُ نَحْوُ (إنْ تَأتِنِي وَاللهِ لأَتَيْتُكَ) ، وجَازَ أَنْ يُلْغى ، نَحْوُ (إنْ تَأتِنِي وَاللهِ أَتَيْتُكَ).

و (أَمّا) لِتَفصِيلِ مَا ذُكِرَ مُجْمَلاً ، نَحْوُ (النّاسُ شَقِيٌّ وسَعِيدٌ أَمّا الّذِينَ سَعِدُوا فَفِي الجَنّةِ وأَمّا الّذِينَ شَقُوا فَفِي النّارِ).

وتَجِبُ فِي جَوابِهِ:

١–الفاءُ.

٢–أَنْ يَكَونَ الأَوّلُ سَبَباً لِلثّانِي.

٣–أَنْ يُحْذَفَ فِعْلُها – مَعَ أَنَّ الشَّرْطَ لا بُدَّ لَهُ مِنَ فِعْلٍ – لِيَكُونَ تَنْبِيهاً عَلى أَنَّ المَقصُودَ بِها حُكْمُ الاسْمِ الواقِعِ بَعْدَها ، نَحْوُ (أَمّا زَيدٌ فَمُنْطلِقٌ) فَإنَّ تَقْدِيرَهُ (مَهْما يَكُنْ مِنْ شَيءٍ فَزَيْدٌ مُنْطَلِقٌ) فَحُذِفَ الفِعْلُ والجارُّ والمَجرُورُ حَتّى بَقِيَ (أَمّا فَزَيْدٌ مُنْطَلِقٌ)

---

ئەگەر سوێندەکە کەوتە ناوەڕاستی قسەکەوە ئەوە دروستە تەنها ئیعتیبار بۆ سوێندەکە دابنرێت، بەوەی کە وەڵامەکە لامی بەسەرەوە بێت، وەك: (إن تأتني والله لأتيتك)، دروستیشە ئیعتیباری بۆ دانەنرێت، وەك: (إن تأتني والله اتيتك).

(اما) بۆ درێژەدان دەبێت بەو شتەی کە بە موجمەلی -بەسەریەکەوە- بە کورتی ووتراوە، وەك: (الناس شقي وسعيد امّا الذين سعدوا ففي الجنة و اما الذين شقوا ففي النار).

ئەمانەش لە وەڵامەکەیدا پێویستن:

١. فاء.

٢. دەبێت دووەمیان هۆی یەکەمیان بێت.

٣. فیعلەکەی حەزف کرابێت –هەرچەندە شەرت دەبێت فیعلی هەبێت- بۆ ئەوەی ببێتە ئاگاداری لەسەر ئەوەی کە مەبەستی شەرتەکە حوکمی ئەو ناوەیە کە لە پاشیەوە دێت، وەك: (اما زيد فمنطلق)، کە تەقدیرەکەی بریتیە لە: (مهما يكن من شيء فزيد منطلق) فیعلەکە و جارو مەجرورەکە حەزف کراون تاوەکو تەنها (اما فزيد منطلق) ماوەتەوە.

، ولَما لَمْ يُناسِبْ دُخُولُ الشَّرْطِ عَلى (فَاءِ) الجَزاءِ نُقِلَتْ الفـاءُ إلى الجُـزْءُ الثَّـانِي ووُضِـع الجُزءُ الأوَّلُ بَيْنَ (أمَّا) و (الفاءِ) عِوَضاً مِنَ الفِعْلِ المَحْذُوفِ.

ثُمَّ ذلِك الجُزْءُ إنْ كَانَ صَالِحاً لِلابْتِداءِ فَهُوَ مُبْتَدأٌ كَمَا مَرَّ ، وإلاّ فَعامِلُهُ ما بَعْدَ الفاءِ نَحْـوُ (أمّا يَوْمَ الجُمُعَةِ فَزَيْدٌ مُنْطَلِقٌ) فَـ (مُنطلِقٌ) عاملٌ فِي (يَوْمَ الجُمُعَةِ) عَلى الظَّرفِيَّةِ.

**الـخُلاصَةُ:**

حُرُوفُ الشَّرْطِ ثَلاثَةٌ وهِيَ (إنْ ، ولَوْ ، وأمَّا)

وتَقَعُ فِي صَدْرِ الكَلامِ ، وتَدْخُلُ عَلى جُمْلَتَيْنِ ، اسْمِيَّتَيْنِ أوْ فِعْلِيَّتَيْنِ أوْ مُخْتَلِفَتَيْنِ.

و (إنْ) لِلاسْتِقْبَالِ ، وإنْ دَخَلَتْ عَلى الفِعْلِ الماضِي. ولا تُسْتَعْمَلُ (إنْ) إلاّ فِي الأمُورِ الّتِي لَمْ يُتَيَقَّنْ وُقُوعُها.

و(لَوْ) تَدُلُّ عَلى انْتِفاءِ الجُمْلَةِ الثّانِيَةِ بِسَبَبِ انْتِفاءِ الأولى، وهِيَ لِلماضِي، وإنْ دَخَلَتْ عَلى المُضارِعِ.

---

کاتێکیش کەنەگونجاوە شەرت بچێتەسەر (فاء)یجەزا، (فاء)ەکە گوازراوەتەوە بۆ بەشی دووەمی ڕستەکەو بەشی یەکەمیشی خراوەتە نێوان (اما) و (فاء)ەکەوە لەبری فیعلە حەزف کراوەکە.

پاشان ئەو بەشە ئەگەر بەکەڵکی ئەوە هات ببێتە موبتەدا ئەوە موبتەدایە وەك پێشتر باسکرا، ئەگەر نا ئەوە عامیلەکەی بریتیە لەوەی کە بەدوای (فاء)ەکەدا هاتووە، وەك: (اما یوم الجمعة فزید منطلق)، لێرەدا (منطلق) عامیلە لە(یوم الجمعة)دا لەسەر زەرفیەت.

**پوختە**

حەرفەکانی شەرت سیانن، ئەوانیش بریتین لە: (إن، لو، اما).

ئەمانە دەکەونە سەرەتای قسەوە، و دەچنە سەر دوو ڕستە، ئیسمی بن یان فیعلی یان تێکەڵ.

(إن) بۆ ئیستیقبال دەبێت، هەرچەندە چووبێتە سەر فیعلی ماضی. بەکاریش نایەت جگە لەو شتانەدا کە یەقینمان نەبێت لە ڕوودانیان.

(لو) دەلالەت دەکاتە سەر نەفی بوونی ڕستەی دووەم بەهۆی نەفی بوونی ڕستەی یەکەمەوە، ئەمیش بۆ ماضی دەبێت، هەرچەندە چووبێتە سەر موضاریع.

وإذا وَقَعَ القَسَمُ مُقَدَّماً عَلى حَرْفِ الشَّرْطِ يَجِبُ أَنْ يَكُـونَ فِعْـلُ الشَّـرْطِ ماضِـياً ، كَمَـا يَجِبُ فِي الجُملَةِ الثّانِيَةِ ما يَجِبُ فِي جَوَابِ القَسَمِ مِنَ الّلامِ ونَحْوِها.

وإذا وَقَعَ القَسَمُ فِي وَسَطِ الكَلامِ جَازَ فِي الجُمْلَـةِ الثَانِيَـةِ الوَجْهَـانِ ، مِـنْ كَوْنِهـا جَوابـاً لِلقَسَمِ أَوْ جَواباً لِلشَّرْطِ.

و (أمّا) لِتفْصِيلِ مَا ذُكِرَ مُجْمَلاً ، ويَجِبُ فِي جَوابِهِ.

١-الفَاءُ.

٢-سَبَبِيَّةُ الأوَّلِ لِلثَّانِي.

٣-حَذفُ فِعْلِ الشَّرْطِ.

اسئلة:

١-عَدِّدْ حُرُوفَ الشَّرْطِ وبَيِّنْ مَوْضِعَهَا مِنَ الجُمْلَةِ.

٢-مَا هِيَ أَنْواعُ الجُمَلِ الّتِي تَدْخُلُ عَلَيْها حُرُوفُ الشَّرْطِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

---

ئەگەر سوێند کەوتە پێش حەرفی شەرتەوە ئەوە پێویستە فیعلی شەرتەکە ماضی بێت، هەروەها هەرشتێك لە وەڵامی سوێندا پێویست بێت -لە لام و شتانی تر- لە ڕستەی دووەمیشدا پێویست دەبێت.

ئەگەر سوێند کەوتە ناوەڕاستی قسەکەوە ئەوە لە ڕستەی دووەمدا دوو ڕوو دروستە: وەڵامی سوێندەکە بێت، یان وەڵامی شەرتەکە بێت.

(امّا)بۆ درێژەدانە بەوشتەی کە بە موجمەلی باسکراوە، ئەمانەش پێویستن لە وەڵامەکەیدا:

١. فاء.

٢. یەکەم هۆی دووەم بێت.

٣. حەزفکردنی فیعلی شەرتەکە.

پرسیار:

١. حەرفەکانی شەرت بژمێرە و جێگایان لە ڕستەدا ڕوون بکەوە.

٢. جۆرەکانی ئەو ڕستانە چین کە حەرفەکانی شەرت دەچنە سەریان؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٣-لِأيِّ زَمَنٍ تُستَعْمَلُ (إنْ) و(لو)؟ بَيِّن ذلك مَعَ أمثِلة مفيدَة.

٤-مَاذا يلزم حُرُوفَ الشَّرْطِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثال.

٥-بَيِّنْ نَوْعَ الفِعْلِ الّذي يَدْخُلُ عَلَيْهِ حَرْفُ الشَّرْطِ إذا وَقَعَ القَسَمُ فِي أوَّلِ الكَلامِ، وتَقَدَّمَ عَلى الشَّرْطِ. وهَلْ يَجِبُ دُخُولُ اللّامِ عَلى جَوابِ الشَّرْطِ أمْ لا؟ وَضِّحْ ذلِك بِأمْثِلَةٍ.

٦-إذا وَقَعَ القَسَمُ فِي وَسَطِ الكَلامِ فَهَلْ يَكُونُ الجَوابُ لِلقَسَمِ أمْ لِلشَّرطِ؟ اِشْرَحْ ذلِك مَعَ أمْثِلَةٍ.

٧-لِأيِّ مَعْنىً تُستَعْمَلُ (أمّا)؟ مَثِّلْ لَهُ.

٨-مَاذا يَجِبُ فِي جَوابِ (أمّا)؟ وَضِّحْ ذلِك بَأمْثِلَةٍ.

٩-لِماذا تُحْذَفُ جُملَةُ الشَّرْطِ فِي (أمّا)؟ اُذكُرْ ذلِك مَعَ إيرادِ مِثالٍ لَهُ.

١٠-مَا هُوَ حُكْمُ الجَزاءِ بَعْدَ (أمّا)؟

---

٣. (ان) و (لو) چ کاتێك بەکار دەهێنرێن؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٤. حەرفەکانی شەرت پێویستیان بە چی هەیە؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٥. جۆری ئەو فیعلەی کە حەرفی شەرتی دەچێتە سەر ڕوون بکەوە ئەگەر سوێند لەسەرەتای ڕستەکەیەوە بێت و پێش کەوتبێت بەسەر شەرتەکەدا. ئایا پێویستە لام بچێتە سەر وەڵامی شەرتەکە یان نا؟ ئەمە بە نموونە ڕوون بکەوە.

٦.ئەگەر سوێند کەوتە ناوەڕاستی ڕستەکەوە، ئایا وەڵامەکە هی سوێندەکەیە یان شەرتەکە؟ ئەمە بە نموونەوە شی بکەرەوە.

٧.(اما) بۆ چ مانایەك بەکاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٨. چی پێویستە لە وەڵامی (اما)دا؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بکەوە.

٩. بۆچی ڕستەی شەرت لە (اما)دا حەزف دەکرێت؟ ئەمە باس بکە بە هێنانەوەی نموونەوە.

١٠. حوکمی جەزا چیە لە دوای (اما)وە؟

## ڕاهێنان:

ا- ڕستەی شەرت و وەڵامی شەرت دیاری بکە لەم ڕستانەی خوارەوەدا، ئەوەش ڕوون بکەرەوە بۆچی لام چووەتە سەر وەڵامی شەرتەکە، پاشان ئەوەش ڕوون بکەوە کە کام لە حەرفەکانی شەرت بۆ ماضی دەبن و کامیان بۆ ئیستیقبال:

١-إنْ أَسَأْتَ فَأُعَاقِبُكَ.

٢-إنْ سَافَرْتَ أُسَافِرْ.

٣-تَاللّهِ إنْ جِئْتَنِي لَأُكْرِمَنَّكَ.

٤-إنْ جِئْتَ واللّهِ لأعْطَيْتُكَ الهَدِيَّةَ.

٥- قال تعالى: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللّهُ لَفَسَدَتَا ﴾(الأنبياء / ٢٢).

٦-قال الشاعرُ :

يَا ضَيْفَنَا لَوْ جِئْتَنا لَوَجَدْتَنَا نَحْنُ الضّيُوفُ وأَنْتَ رَبُّ المَنْزِلِ

٧-إنْ لَمْ يَكُنْ لَكُم دِينٌ فَكُونُوا أَحْراراً فِي دُنْياكُمْ.

ب- (اما) بەکاربهێنە لە سێ ڕستەی بە سوودا، (فاء)ی جەزاکەی دەستنیشان بکە لە گەڵ هۆکاربوونی یەکەم بۆ دووەمیان.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ إِنْ يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ ﴾(الأنفال / ٣٨).

٢- قال تعالى: ﴿ لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا ﴾(الواقعة / ٦٥).

٣- قال تعالى: ﴿ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ ﴾(فاطر / ١٤).

٤- قال تعالى: ﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ ﴾(البقرة / ٢٦).

٥- قال تعالى: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ﴾(آل عمران/٧).

## الدرس الرابع والخمسون

### حَرْفُ الرَّدْعِ

حَرْفُ الرَّدْعِ (كَلاَّ) ، وُضِعَ لِزَجْرِ المُتَكَلِّمِ ورَدْعِهِ عَمَّا تَكَلَّمَ بِهِ ، كَقَوْلِهِ تعالى:﴿ وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ (١٦) كَلَّا بَلْ لَا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ (١٧) ﴾ ﴿الفجر/١٦-١٨﴾ ، أيْ: لا تَتَكَلَّمْ بهذا فَإِنَّهُ لَيْسَ كَذلِك ، وهذا في الخَبَرِ.

وقَدْ يَجِيءُ بَعْدَ الأَمْرِ أَيْضاً، كَمَا إذا قِيلَ لَكَ (اضْرِبْ زَيداً) فَتَقُولُ (كَلا) أيْ: لا أَفْعَلُ هذا قَطُّ.

وقَدْ جَاءَتْ بِمَعْنَى حَقّاً، كَقَوْلِهِ تَعَالَى:﴿كَلاَّ سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾(التكاثر/٤)وحِينَئِذٍ تَكُونُ اسْماً مَبْنِيّاً لِكَوْنِها مُشابِهَةً لِـ(كَلا) الّتِي هِيَ حَرْفُ الرَّدْعِ. وقِيلَ تَكُونُ حَرْفاً أَيْضاً بِمَعْنى (إنَّ) لِكَوْنِها لِتَحْقِيقِ مَعنى الجُمْلَةِ.

---

## وانەی پەنجاو چوار

### حەرفی ڕەدع (گێڕانەوە[1]) و تـاءی تەئنیسی ساکین

حەرفی ڕەدع: بریتیە لە(کلا)، دانراوە بۆ ڕاوەشاندنی قسەکەر و گێڕانەوەی لەو قسەیەی کە کردوویەتی، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ (١٦) كَلَّا بَلْ لَا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ (١٧)﴾ واتە: قسەی وا نەکەیت چونکە ئەوە وانیە، ئەمەش لە خەبەردا بەم جۆرەیە.

هەندێ جاریش لەپاش ئەمرەوە دێت، وەك ئەوەی ئەگەر بە تۆ بووترێت: (اضرب زیدا) تۆش دەڵێیت: (کلا) واتە: هەرگیز شتی وا ناکەم.

هەندێ جار بە مانای (حقا)-واتە: بەڕاستی- هاتووە، وەك فەرموودەی خوای مەزن:﴿کلا سوف تعلمون﴾، ئەوکات ناوێکی مەبنیە لەبەر ئەوەی کە لەو (کلا)یە دەچێت کە حەرفی ڕەدعە. ووتراویشە ئەوکات حەرفە و بە مانای (إن)یە چونکە بۆ هاتنەڕوودانی مانای ڕستەکەیە.

---

١ مەبەست گێڕانەوەو دوورخستنەوەی کەسێکە لە کارێك.

## تَــاءُ التَّأنِـيثِ السَّاكِـنَةُ

حَرْفٌ يَلْحَقُ الماضِيَ لِيدُلَّ عَلى تَأنِيثِ ما أُسْنِدَ إِلَيْهِ الفِعْلُ ، نَحْـوُ (أَكَلَـتْ هِنْـدٌ) وعَرَفْـتَ مَواضِعَ وُجُوبِ إلْحاقِها.

وإذا لَقِيَهَا ساكِنٌ بَعْدَها وَجَبَ تَحْرِيكُها بِالكَسْرِ ، لِأنَّ السّاكِنَ إذا حُرِّكَ حُرِّكَ بِالكَسْـرِ ، نَحْوُ (قَدْ قَامَتِ الصَّلاةُ).

وحَرَكَتُها لا تُوجِبُ رَدَّ مَا حُذِفَ لِأجْلِ سُكُونِها ، فَلا يُقالُ فِي: رَمَتْ ، (رَمَـاتِ المَـرْأَةُ) ، لِأنَّ حَرَكَتَهَا عَارِضَةٌ لِدَفْعِ التِقَاءِ السَّاكِنَيْنِ ، وقَولُهُمْ (المَرْأتَان رَمَاتَا) ، ضعِيفٌ.

وأمَّا إلحاقُ عَلامَةِ التَثْنِيَةِ وجَمْعِ المُذَكَّرِ وجَمْعِ المُؤَنَّثِ [1] فَضَعِيفٌ ، فَلا يُقَالُ: قَامَا الزَّيْـدَانِ وقَامُوا الزَّيْدُونَ وقُمْنَ النِّسَاءُ.

---

### تـاءی تەئنیسی ساكین

حەرفێكە دەنوسێت بە ماضیەوە بۆ ئەوەی دەلالەت بكاتە سەر مێینەیی ئەوەی كە فیعلەكەی دراوەتە پاڵ، وەك: (اكلت هند)، پێشتریش ئەو شوێنانەت زانی كە تێیاندا پێویستە بنوسێنرێت بە فیعلەوە.

ئەگەر حەرفێكی ساكینی پێگەیشت كە بەدوایدا هاتبوو ئەوە پێویستە حەرەكەتداری بكەین بە كەسرە، چونكە ساكن ئەگەر حەرەكەتی درایە كەسرەی دەدرێتێ، وەك: (قد قامتِ الصلاة).

ئەم حەرەكەتداربوونەشی ئەوە بە پێویست ناگێڕێ كە هەرچیەك كاتی خۆی لەبەر ساكن بوونەكەی لابراوە ئێستا بیگێڕینەوە، كەواتە ناووترێت لە: (رمتْ)دا، (رمات المرأة)، چونكە ئەو حەرەكەتەی كە ئێستا وەریگرتووە لاوەكیە و بۆ پاڵنانە بە پێككەیشتنی دوو حەرفە ساكینەكەوە، گووتەی هەندێكیش كەدەڵێن: (المرأتان رماتا)، لاوازە.

هەروەها نووساندنی نیشانەی تەسنیە و جەمعی موزەكەر و جەمعی موئەنەسیش بە فیعلەوە لاوازە، كەواتە ناووترێت: (قاما الزیدان، قاموا الزیدوا، قمن النساء).

---

١ - وهيَ الضَمائِرُ .

وبِتَقْدِيرِ الإلْحَاقِ لا تَكُونُ ضَمَائِرَ لِئَلاَّ يَلْزَمَ الإضْمَارُ قَبْلَ الذِّكْرِ [1]، بَلْ هِيَ عَلامَـاتٌ دَالَّـةٌ عَلى أَحْوَالِ الفَاعِلِ كَتاءِ التَّأْنِيثِ.

**الخُلاصَةُ:**

(كَلا): حَرْفُ رَدْعٍ وَزَجْرٍ ، وَيُفِيدُ مَعَ ذلِك النَّفيَ والتَّنْبِيهَ عَلى الخَطَأِ. وقَـدْ يَـأْتِي بِمَعْنـى (حَقّاً) فَيَكُونُ اسْماً مَبْنِيّاً.

تَاءُ التَّأْنِيثِ السّاكِنَةُ: تَاءٌ تَلْحَقُ الفِعْلَ الماضِيَ لِلدَّلالَةِ عَلى أَنَّ فَاعِلَهُ مُؤَنَّثٌ.

وإذا التَقَتْ مَعَ ساكِنٍ بَعْدَها حُرِّكَتْ بِالكَسْرِ، وحَرَكَتُها لا تُوجِـبُ رَدَّ مـا حُـذِفَ لِأجـلِ سُكُونِها.

---

خۆ ئەگەر تەقدیری ئەوەش بکەین کە ئەم پێوەنووسانە دروستە ، ئەوە ئەمانە نابنە ضەمیر، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی بەضەمیرکردنی ناوێك لە پێش ناوبردنیدا، بەڵکو نیشانە دەبن لەسەر حاڵی فاعیلەکە هەروەك تاءی تەئنیس[2].

**پوختە**

(کلا): حەرفی ڕەدع و گێڕانەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا مانای نەفی و ئاگادارکردنەوە لەسەر هەڵە دەگەیەنێت.

هەندێ جاریش بەمانای تەحقیق دێت، ئەوکات ناوێکی مەبنی دەبێت.

تاءی تەئنیسی ساکین: تاءێکە دەنوسێت بە ماضیەوە بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەوەی کە فاعیلەکەی موئەنەسە.

ئەگەر گەیشتە ساکینێکی تر کە لەپاشیەوە بوو ئەوا حەرەکەتدار دەکرێت بە کەسرە، حەرەکەتەکەیشی نابێتە هۆی گێڕانەوەی ئەوەی کە بەهۆی سکونەکەوە لەدەستی داوە.

---

١ - وبذلك يتقدم الضميرُ على مَرجعهِ لفظاً ورتبةً مِنْ غَيْرِ مُسَوِّغٍ .

٢ واتە چۆن تاء ی تەئنیس مەحەلی ئیعرابی نیە و تەنها نیشانەی تەئنیسە ئەوە (ان، ون، ن)ەکانیش نیشانەی ئەوەن کە فاعیلەکە موسەنایە یان جەمعی موزەکەرە یان جەمعی موئەننەسە و مەحەلی ئیعرابیان نییە.

## أسْئِلَة :

١-مَا هُوَ حَرْفُ الرَّدْعِ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-أَيْنَ يُسْتَعْمَلُ حَرْفُ الرَّدْعِ؟ هَاتِ مِثالاً يُوَضِّحُ ذلِك.

٣-هَلْ تُسْتَعْمَلُ (كَلا) بِمَعْنى (حَقّاً)؟ مَثِّلْ لِذلِك .

٤-مَا هِيَ تَاءُ التَّأْنِيثِ السّاكِنَةُ؟ مَثِّلْ لَها.

٥-مَاذا يَعْرِضُ لِتاءِ التَّأْنِيثِ السّاكِنَةِ إذا لَقِيَها ساكِنٌ.

٦-هَلْ إنَّ حَرَكَةَ تاءِ التَأْنِيثِ تُوجِبُ رَدَّ مَا حُذِفَ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

---

## پرسیار:

١. حەرفی ڕەدع چییە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. حەرفی ڕەدع لە کوێدا بەکار دەهێنرێت؟ نموونەیەك بێنەوە ئەمە ڕوون بکاتەوە.

٣. ئایا (كلا) بەمانای تەحقیق بەکاردێت؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. تاءی تەئنیسی ساکین کامەیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٥. تاءی تەئنیسی ساکین چیی بەسەردێت ئەگەر گەیشت بە ساکینێکی تر؟

٦. ئایا حەرەکەتدان بە تاءی تەئنیس دەبێتە هۆی گێڕانەوەی ئەوەی کە لابراوە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

## ڕاهێنان:

أ- مانای (كلا) لەم ڕستانەی خوارەوەدا ڕوون بکەوە:

١-كَلا سَتَرى مَنِ المُهانُ.

٢-هَلْ ذَهَبْتَ إلى المَلْعَبِ؟ كَلاّ.

٣- إنَّ سَعِيداً كَاذِبٌ، كَلاّ.

٤-كَلا لا أَعْمَلُ مَا تَعْمَلُونَ.

٥- قال تعالى: ﴿ قَالَ كَلاَّ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِي ﴾(الشعراء / ٦٢).

٦- قال تعالى:﴿كَلَّا لا وَزَرَ (١١) إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ(١٢)﴾ (القيامة/١٢،١١).

٧-﴿ كَلاَّ بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾(الانفطار / ٩).

ب- ئەم فیعلانەی خوارەوە بەهۆی تاءی تەئنیسی ساکینەوە لە ڕستەدا بکە بە موئەنەس، لەگەڵ دانانی سەرو بۆردا:

هَيَّأَ، كَلَّمَ، قَامَ، جَاءَ، جَلَسَ، أَكَلَ.

ج- تاءی تەئنیسی ساکین لەم ڕستانەدا دەربهێنە، و ئەگەر حەرەکەتی هەبوو ڕوونی بکەوە بۆچی ئەو حەرەکەتەی پێدراوە:

١-قَامَتِ البِنْتُ بِأَدَاءِ واجِبِهَا.

٢-جَلَسَتِ الأُمُّ تَخِيطُ ثوْبَهَا.

٣-أَدَّتْ زَيْنَبُ مَا عَلَيْهَا.

٤-خَرَجَتِ الطِّفْلَةُ مِنَ البَيتِ.

٥-ظَلَّتِ المُعَلِّمَةُ وَاقِفَةً.

د- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ كَلاَّ إِنَّ الإِنسَانَ لَيَطْغَى ﴾(العلق / ٦).

٢- قال تعالى: ﴿ كَلاَّ إِنَّ كِتَابَ الفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ ﴾(المطففين / ٧).

٣- قال تعالى: ﴿ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلاَّ ﴾(المؤمنون / ١٠٠).

٤- قال تعالى: ﴿ قَالَتْ الأَعْرَابُ آمَنَّا ﴾(الحجرات / ١٤).

٥- قال تعالى: ﴿ قَالَتْ يَاأَيُّهَا المَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي ﴾(النمل / ٣٢).

## الدرس الخامس والخمسون

## التَّنوِينُ وأقسامُهُ

التَّنوينُ ، نُونٌ سَاكِنَةٌ تَتْبَعُ حَرَكَةَ آخِرِ الكَلِمَةِ ، ولا تَلْحَقُ الفِعْلَ ، وهِيَ أَرْبَعَةُ أَقْسامٍ:

الأَوَّلُ: تَنوِينُ التَّمَكُّنِ ، وهُوَ مَا يَدُلُّ عَلى أَنَّ الاسْمَ مُتَمَكِّنٌ فِي الإِعْرابِ ، بِمَعْنى أَنَّهُ مُنصَرِفٌ ، قَابِلٌ لِلحَرَكاتِ الإعرابِيَّةِ ، نَحْوُ (زَيْدٍ).

الثَّانِي: التَّنْكِيرُ ، وهُوَ مَا يَدُلُّ عَلى أَنَّ الاسْمَ نَكِرَةٌ [1] ، نَحْوُ (صَهٍ) أيْ: اُسْكُتْ سُكُوْتاً ما.

الثَّالِثُ: العِوَضُ ، وهُوَ مَا يَكُونُ عِوَضاً عَنِ المُضافِ إِلَيْهِ ، نَحْوُ (حِينَئِذٍ ، ويَوْمَئِذٍ) أيْ: حِينَ إذ كَانَ كذا ، ويَوْمَ إذ كَانَ كذا ، و (ساعَتَئِذٍ) أيْ ساعَةَ إذ كانَ كذا.

---

## وانەی پەنجاو پێنج

## تەنوین و بەشەکانی

تەنوین: نونێکی ساکینە کە بەدوای حەرەکەتی کۆتایی ووشەدا دێت، و نانووسێت بە فیعلەوە، ئەویش چوار بەشە:

یەکەم: تەنوینی تەمکین: ئەویش ئەوەیە کە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی کە ناوەکە توانای وەرگرتنی ئیعرابی هەیە، واتە مونصەریفە، قوبوڵی حەرەکەتەکانی ئیعراب دەکات، وەك: (زیدٍ).

دووەم: تەنکیر -نەناسراوی-: ئەویش ئەوەیە کە دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی کە ناوەکە نەکیرەیە، وەك: (صهٍ) واتە: بەجۆرێك لە جۆرەکان بێدەنگ بە.

سێیەم: عیوەض -قەرەبوو-: ئەوەیە کە دەبێتە قەرەبووی موزاف ئیلەیهی، وەك: (حینئذٍ، یومئذٍ)، واتە: (حین إذ کان کذا) -کاتێ ئەو شتە وابوو-، و (یوم إذ کان کذا) - ئەو ڕۆژەی ئەو شتە وابوو-، و (ساعتئذٍ) واتە: (ساعة إذ کان کذا) - ئەو سەعاتەی کە ئەو شتە وابوو-.

---

١ - والمقصودُ بالنكِرَةِ هنا بَعضُ الأسماءِ المبنيَّةِ كاسمِ الفعلِ والعَلم المختوم بـ ( وَيْهِ ) فرقاً بينَ المعرفةِ منها والنكِرَةِ ، فما نُوِّنَ كانَ نَكِرَةً وما لمْ يُنَوَّنْ كانَ مَعرِفَةً ، نحوُ : صَهْ وصَهٍ ومَهْ ومَهٍ وإيهِ وإيهٍ . ومثلُ : مَرَرْتُ بسيبَوَيْهِ وسيبَوَيْهٍ آخَرَ . جامعُ الدروس ج ١ / ٧ .

الرّابِعُ: المُقابَلَةُ ، وهُوَ التّنْوينُ الّذي يَلحَقُ جَمْعَ المُؤنَّثِ السّالِمَ ، نَحْوُ (مُسلِماتٍ) لِيُقابِلَ نُونَ جَمْعِ المُذكّرِ السّالِمِ في (مُسْلِمِينَ) وهذِهِ الأرْبَعَةُ تَخْتَصُّ بـ (الاسْمِ).

وهُنَاكَ قِسْمٌ خامِسٌ لا يَخْتَصُّ بـ(الاسْمِ) وهُوَ تَنْوينُ التَّرنُّمِ ، وهُوَ الّذِي يَلْحَقُ بآخِرِ الأبْياتِ وأنْصَافِ المَصاريعِ كَقَوْلِ جرير:

أَقِلِّي اللَّوْمَ عَاذِلَ وَالعِتَابَاً      وقُولِي إنْ أَصَبْتُ لَقَدْ أَصَابَاً [1]

وكَقَوْلِ الشاعر :

تَقُولُ بِنْتِي قَدْ أَنَى أَنَاكَاً      يَا أَبَتَا عَلَّكَ أوْ عَسَاكَاً [2]

و قَدْ يُحْذَفُ التَّنْوينُ مِنْ العَلَمِ إذا كَانَ مَوصُوفاً بـ(ابْنٍ) مُضَافاً إلى عَلَمٍ ، نَحْوُ (جَاءَنِي زَيْدُ بْنُ عَمْرٍو).

---

چوارەم: موقابەلە -بەرامبەری-: ئەو تەنوینەیە کە دەنوسێت بە جەمعی موئەنەسی سالمەوە، وەك:(مسلماتٍ) بۆ ئەوەی بەرامبەربێت لەگەڵ نونی جەمعی موزەکەری سالم لە (مسلمين)دا.

ئەم چوارەش تایبەتن بە ئیسمەوە.

بەشی پێنجەمیش هەیە کە تایبەت نیە بە ئیسمەوە، ئەویش بریتیە لە تەنوینی تەرەننوم -ئاواز-، کە بریتیە لەوەی کە دەنوسێت بە کۆتایی بەیتە شیعریەکان و نیوەی میصراعەکانەوە،

وەك گووتەی شاعیر: اقلي اللوم عاذل والعتاباً وقولي إن اصبت لقد اصاباً

هەروەها وەك: تقول بنتي قد انى اناكاً يا أبتا علك او عساكاً

هەندێ جار تەنوین بە عەلەمەوە حەزف دەکرێت ئەگەر وەصف کرابوو بە (ابن)ێك کە ئیزافە کرابێت بۆ عەلەم، وەك: (جاءني زيدُ بن عمرٍو).

---

١ - ( اقلي ) فعلُ امرٍ من الإقلالِ والمرادُ هنا تركُ اللومِ و ( عاذلَ ) منادى مرخمٌ و اصلهُ ( يا عاذلةُ ) وهيَ اللائمةُ . والمعنى : أتركي ايتها اللائمةُ لومي ، وقولي إن انا فعلت الصوابَ لقدْ اصبْتَ . والشاهدُ فيهِ دخولُ تنوينِ الترنُّمِ على الاسمِ والفعلِ .

٢ - والمعنى : سافرْ تجدْ رزقاً .

**الخُـلاصَةُ:**

التَّنوِينُ نُونٌ سَاكِنَةٌ تَلْحَقُ آخِرَ الاسْمِ ، وهِيَ خَمْسَةُ أَقْسامٍ

١-تَـنْوِينُ التَّمَكُّنِ.

٢-تَـنْوِينُ التَّنْكِيرِ.

٣-تَـنْوِينُ العِوَضِ.

٤-تَـنْوِينُ المُقابَلَةِ.

وهُناكَ تَنوِينٌ خَامِسٌ يُسَمّى تَنوِينَ التَّرَنُّمِ ، وهُـوَ يَلْحَـقُ الاسْـمَ والفِعْـلَ فِـي الضَّـرُورَاتِ الشِّعرِيَّـةِ.

**أسْئِلَة:**

١-مَا هُوَ التَّنوِينُ؟ مَثِّلْ لَهُ.

٢-مَتى يُحذَفُ التَّنوِينُ مِنَ العَلَمِ.

---

**پوختە**

تەنوین: نونێکی ساکینە دەنوسێت بە کۆتایی ناوەوە، ئەویش پێنج بەشە:

١. تەنوینی تەمکین.

٢. تەنوینی تەنکیر.

٣.تەنوینی عیوەض.

٤.تەنوینی موقابەلە.

پێنجەمیش هەیە کە پێی دەوترێت تەنوینی تەرەننوم، ئەویش دەنوسێت بە ئیسم و فیعلەوە لە زەروورەتی شیعریدا.

**پرسیار:**

١. تەنوین چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٢. کەی تەنوینی عەلەم حەزف لادەبرێت.

٣–عَرِّفْ تَنوِينَ التَّمَكُّنِ ، ومَثِّلْ لَهُ.

٤–مَا هُوَ تَنوِينُ التَّنكِيرِ؟ هَاتِ مِثالاً.

٥–مَا هُوَ تَنوِينُ العِوَضِ؟ مَثِّلْ لِذلِك.

٦–عَرِّفْ تَنوَينَ المُقابَلَةِ ، ومَثِّلْ لَهُ.

٧–عَرِّفْ تَنوِينَ التَّرنُّمِ.

---

٣. پێناسەی تەنوینی تەمکین بکە، و نموونەی بۆ بێنەوە.

٤. تەنوینی تەنکیر چیە؟ نموونەیەك بێنەوە.

٥. تەنوینی عیوەض چیە؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. تەنوینی موقابەلە پێناسە بکە، و نموونەی بۆ بێنەوە.

٧. تەنوینی تەرەننوم پێناسە بکە.

## ڕاهێنان:

أ.ناوە تەنویندارەکان دەربهێنە، و جۆری تەنوینەکە دیاری بکە لەم ڕستانەدا:

١–إذا وَصَلْتَ إلى البَيْتَ مَاذا تَعْمَلُ حِينَئِذٍ؟

٢–هذا زَيدٌ أَخُوكَ.

٣–هُنَّ مُسْلِماتٌ مُؤْمِناتٌ.

٤– قال تعالى: ﴿ يُنَبَّأُ الإنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴾(القيامة / ١٣).

٥–أَقِلِّي اللَّوْمَ عَاذِلَ والعِتاباً.

٦–مَهٍ. إنَّهُمْ قادِمُونَ.

٧–جَاءَ سَعِيدٌ مِنَ السُّوقِ.

ب- ئەم ناوانەی خوارەوە بخەرە ڕستەی بەسوودەوە و تەنوینیان بدەرێ و جۆرەکەشی دیاری بکە:

مُعَلِّمَة، يَوم، خالِد، صَه، لَيلَة.

ج- ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ فَلاَ تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِمَّا يَعْبُدُ هَؤُلاَءِ ﴾(هود / ١٠٩).

٢-جَاءَنِي سِيبَوَيْهِ وَسِيبَوَيْهِ آخَرُ.

٣- قال تعالى: ﴿ وَانشَقَّتْ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾(الحاقة / ١٦).

٤- قال تعالى: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ﴾(الممتحنة / ١٠).

٥-وقُولِي إنْ أَصَبْتُ لَقَدْ أَصَاباً.

## الدرس السادس والخمسون

## نُونُ التّـأكِيد

نُونُ التأكِيدِ: نُونٌ وُضِعَتْ لِتَأكِيدِ الأمْرِ والمُضارِعِ إذا كَانَ فِيهِ طَلَبٌ بإزَاءِ (قَـدْ) لِتَأكِيـدِ المَاضِي.

نُونُ التَّأكِيدِ عَلى ضَرْبَيْنِ:

١-خَفِيفَةٌ: وهِيَ سَاكِنَةٌ.

٢-ثَقِيلَـةٌ: وهِيَ مُشَدَّدَةٌ.

والثَّقِيلَةُ مَفْتُوحَةٌ إنْ لَمْ يَكُنْ قَبْلَهَا أَلِفٌ، نَحْوُ (أُكْتُبَنَّ، أكْتُبُنَّ، أُكْتُبِنَّ)، وإلاّ فَمَكْسُورَةٌ، نَحْوُ (أُكتُبانِّ، أكتُبْنانِّ) ويَجُوزُ أنْ تَـدْخُلا عَلـى الأمْـرِ، والنَّهْـيِ، والاسْـتِفْهامِ، والتَّمَنِّـي، والعَرْضِ ، لِوُجُودِ مَعْنَى الطَّلَبِ فِي كُلٍّ مِنها، نَحْوُ (أُكتُبَنَّ، ولا تَكْتُبَنَّ، وهَـلْ تَكْتُبَنَّ، ولَيْتَ تَكْتُبَنَّ، وألا تَكْتُبَنَّ).

---

## وانەی پەنجا و شەش

## نونی تەئکید (جەخت کردنەوە)

نونی تەئكيد: نونێكە دانراوە بۆ تەئكيدی ئەمر، و موضاریع ئەگەر داخوازیەكی تێدا بوو، لە بەرامبەر (قد) دا كە بۆ تەئكيدی ماضی دەبێت.

نونی تەئكيد دوو جۆرە::

١. خەفیفە -سووك-: كە ساكینە.

٢. سەقیلە -قورس-: كە شەددەدارە.

سەقیلەكەیان هەمیشە فەتحەی هەیە ئەگەر ئەلف لە پێشیەوە نەبوو، وەك: (اكتبَنّ، اكتبُنّ، اكتبِنّ)، ئەگەرنا ئەوە كەسرەی دەبێت، وەك: (اكتبانّ، اكتبنانّ)، دروستیشە كە بچنە سەر ئەمر، و نەهی، و ئیستیفهام، و تەمەننی، و عەرض، چونكە مانای داخوازی لەهەریەكە لەمانەدا هەیە، وەك: (اكتبنّ، لا تكتبَنّ، هل تكتبَنّ، ليت تكتبَنّ، الا تكتبَنّ).

وقَدْ تَدْخُلُ النُّونُ عَلى القَسَمِ [1] وجُوباً لِتَدُلَّ عَلى تَأكِيدِ كَوْنِ الفِعْلِ مَطْلُوباً لِلمُتَكَلِّم ، فَلا يَخلُو آخِرُ القَسَمِ عَنْ مَعْنَى التَّأكِيدِ ، كَمَا لا يَخلُو أوَّلُهُ مِنهُ ، نَحْوُ (واللّهِ لَأفعَلَنَّ كذا).

ويَجِبُ أنْ تَكُونَ حَرَكَةُ ما قَبْلَها عَلى ما يَأتِي:

١–ضَمُّ ما قَبْلَها فِي الجَمْعِ المُذَكَّرِ ، نَحْوُ (اُكْتُبُنَّ) لِتَدُلَّ عَلى (واو) الجَمْعِ المَحْذُوفِ.

٢–كَسْرُ ما قَبْلَها فِي الواحِدِ المُؤَنَّثِ المُخاطَبَةِ نَحْوُ (اُكْتُبِنَّ) لِتَدُلَّ عَلى الياءِ المَحْذُوفَةِ.

٣–الفَتْحُ فِيما عَداهُما.

أمّا الفَتْحُ فِي المُفرَدِ ، فَلأنَّهُ لَوْ الضَمَّ ، لَالْتَبَسَ بِالجَمْعِ المُذَكَّرِ ، ولَوْ كُسِرَ ، لاَلْتَبَسَ بِالمُخاطَبَةِ. وأمّا فِي المُثَنّى والجَمْعِ المُؤَنَّثِ فَلأنَّ مَا قَبْلَهَا ألِفٌ ، نَحْوُ :

---

هەندێ جار بە واجیبی نون دەچێتە سەر سوێند بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر تەئکیدی ئەوەی کە فیعلەکە شتێکی خوازراوە بۆ قسەکەرەکە، ئەوکات کۆتایی سوێندەکە خاڵی نابێت لە مانای تەئکید، هەروەك چۆن سەرەتاکەی لێی خاڵی نیە، وەك: (والله لأفعلنْ كذا).

حەرەکەتی حەرفەکەی پێشەوەی دەبێت بەم شێوەیە بێت:

١. لە جەمعی موزەکەردا ضەممەی هەبێت، وەك: (اكتبنْ) بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەوەی کە (واو)ی جەمعەکە حەزف کراوە.

٢. لەموفرەدی موئەنەسی موخاتەبدا کەسرەی هەبێت، وەك: (اكتبنْ) بۆ ئەوەی دەلالەت بکاتە سەر ئەوەی کە (یاء)ەکە حەزف کراوە.

٣. فەتحە لە شوێنەکانی تردا.

هۆی فەتحەپێدانی لەموفرەددا ئەوەیە کە ئەگەر ضەممەی بدرێتێ ئەوە لەگەڵ جەمعی موزەکەردا[2] تێکەڵ دەبێت، ئەگەر کەسرەیشی بدرێتێ ئەوە تێکەڵ بە موئەنەسی موخاتەب[3] دەبێت، هەروەها لە تەسنیە و جەمعی موئەنەسدا لەبەر ئەوەیە کە پێشەوەی ئەلفە، وەك:

---

١ - المقصود هنا فعل القسم .

٢ وەك: (اكتبنْ ).

٣ وەك: (اكتبنْ ).

(اُكْتُبانِّ واُكْتُبْنانِّ) وَزِيدَتِ الألِفُ فِي الجَمْعِ المُؤَنَّثِ قَبْلَ نُوْن التَّأكِيدِ ، لِكَراهَةِ اجتِماعِ ثَلاثِ نُوناتٍ ، نُوْن المُضْمَرِ ، ونُون التَّأكِيدِ الثَّقِيلَةِ.

وَنُونُ التَّأكِيدِ (الخَفِيفَةُ) لا تدْخُلُ عَلى التَّثنِيَةِ ولا عَلى الجَمْعِ المُؤَنَّثِ أَصْلاً لِأنَّهُ لَوْ حُرِّكَ النُونُ لَمْ يَبْقَ عَلى الأصْلِ فَلَمْ تَكُنْ خَفِيفَةً سَاكِنَةً ، وإنْ أبْقَوها ساكِنَةً فَيَلْزَمُ التِقَاءُ السّاكِنَيْنِ (عَلى غَيْرِ حَدِّهِ) وهُوَ غَيْرُ حَسنٍ.

**الخُلاصَةُ:**

نُونُ التَّأكِيدِ: نونٌ يُؤتى بِها لِتَأكِيدِ الأمْرِ ، والمُضارِعِ إذا كَانَ فِيهِ مَعْنَى الأمْرِ.

نُونُ التَّأكِيدِ عَلى قِسْمَينِ: ١–خَفِيفَةٌ سَاكِنَةٌ. ٢–ثَقِيلَةٌ مُشَدَّدَةٌ.

ويَجُوزُ دُخُولُهُما عَلى الأمْرِ ، والنَّهْي ، والاسْتِفْهامِ ، والتَّمَنِّي ، والعَرْضِ.

---

(اكتبانّ) و (اكتبنانّ) وەك دیارە پێش نونەکە ئەلفی بۆ زیاد کراوە لە جەمعی موئەنەسدا لەبەر ناباشی کۆبوونەوەی سێ نون، واتە نونی ضەمیرەکە و نونی تەئکیدی سەقیلە.

نونی تەئکیدی خەفیفە هەرگیز ناچێتە سەر موسەنا و جەمعی موئەنەس، چونکە ئەگەر نونەکە حەرەکەتی بدرێتێ ئەوە لەسەر ئەسڵەکەی خۆی نامێنێتەوە[1]، و نابێتە نونی خەفیفەی ساکین، ئەگەریش بە ساکینی بیهێڵنەوە ئەوە دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی دوو حەرفی ساکین (بە جیا لە جێگای سروشتی خۆی)[2] کە ئەمەش باش نیە.

**پوختە**

نونی تەئکید: نونێکە بەکار دەهێنرێت بۆ تەئکید کردنەوەی ئەمر، یان موضاریع ئەگەر مانای ئەمری تێدابوو.

نونی تەئکید دوو جۆرە: ١. خەفیف و ساکین ٢. قورس و شەددەدار

دروستە بڕۆنە سەر ئەمر، و نەهی، و ئیستیفهام، و تەمەننی، و عەرض.

---

١ چونکە ئەسڵ وایە نونی خەفیفە ساکین بێت.

٢ کۆبوونەوەی دوو حەرفی ساکین لەعەرەبیدا دروست نیە، گەر لە جێگای خۆیدا نەبێت، جێگای خۆی ئەوەیە کە یەکەمیان حەرفی مەد بێت-ئەلف- یان لین و دووەمیان دەغم کرابێت لە حەرفێکی تردا.

وتَدْخُلُ نُونُ التَّوْكِيدِ عَلى جُمْلَةِ القَسَمِ لِلدّلالَةِ عَلى تأكِيدِ طَلَبِ الفِعْلِ.

ويَجِبُ أنْ تَكُونَ حَرَكَةُ مَا قَبْلَها عَلى ما يَأتِي:

١-الضَمُّ فِي جَمْعِ المُذَكَّر.

٢-الكَسْرُ فِي المُؤَنَّثَةِ المُخاطَبَةِ.

٣-الفَتْحُ فِيما عَداهُما.

ولا تَدْخُلُ نُونُ التَّأكِيدِ الخَفِيفَةُ عَلى التَثْنِيَةِ والجَمْعِ المُؤَنَّثِ أصلاً.

**أسئلة:**

١-عَرِّفْ نُونَ التَّأكِيدِ ، ومَثِّلْ لَها.

٢-بأيِّ الأفْعال تُلْحَقُ نُونُ التَّأكِيدِ؟ وَضِّحْ ذلِك بِمِثالٍ.

٣-مَا هِيَ أنْواعُ نُونِ التَّأكِيدِ؟ ومَا عَلامَةُ كُلٍّ مِنْها؟

٤-لِمَاذا تَلْحَقُ القَسَمَ نُونُ التَّأكِيدِ وُجُوباً.

---

**نونی تەئكید دەچێتە سەر ڕستەی سوێند بۆ ئەوەی دەلالەت بكاتە سەر تەئكید كردنەوەی داخوازی لەسەر فیعلەكە.**

**پێویستە حەرەكەتی حەرفەكەی پێشەوەی بەم شێوەیە بێت:**

**١. ضەممە لە جەمعی موزەكەردا.**

**٢. كەسرە لە موئەنەسی موخاتەبدا.**

**٣. فەتحە لەوانی تردا.**

**نونی خەفیفە ناچێتە سەر موسەنا و جەمعی موئەنەس بەهیچ جۆرێك.**

**پرسیار:**

**١. پێناسەی نونی تەئكید بكە، و نموونەی بۆ بێنەوە.**

**٢. نونی تەئكید بە چ جۆرە فیعلێكەوە دەنوسێنرێت؟ ئەمە بە نموونەوە ڕوون بكەوە.**

**٣.جۆرەكانی نونی تەئكید كامانەن؟ نیشانەی هەریەكەیشیان چیە؟**

**٤. بۆچی نونی تەئكید بە واجیبی دەنوسێت بە سوێندەوە؟**

٥-مَا هيَ حَرَكَةُ مَا قَبْلَ نُونِ التَّوكِيدِ فِي الجَمْعِ المُذَكَّر؟ مَثِّلْ لِذلِك.
٦-مَا هيَ حَرَكَةُ مَا قَبْلَ نُونِ التَّاكِيدِ فِي الواحِدِ المُؤَنَّثِ المُخاطَبَةِ؟ ولِمَاذا؟
٧-لِمَاذا تُزادُ الألِفُ فِي الجَمْعِ المُؤَنَّثِ الّذِي أُلحِقَتْ بِهِ نُونُ التَاكِيدِ الثَّقِيلَةُ؟
٨-هَلْ تَدْخُلُ نُونُ التَأكِيدِ الخَفِيفَةُ عَلى المُثَنّى والجَمْعِ المُؤَنَّثِ؟ ولِمَاذا؟

---

٥. حەرەکەتی حەرفی پێش نونی تەئکید چیە لە جەمعی موزەکەردا؟ نموونەی بۆ بێنەوە.

٦. حەرەکەتی حەرفی پێش نونی تەئکید چیە لە موفرەدی موئەنەسی موخاتەبدا؟ بۆچی؟

٧. بۆچی لەو جەمعە موئەنەسەدا کە نونی تەئکیدی سەقیلەی پێوە دەنوسێنرێت ئەلفێك زیاد دەکرێت؟

٨. ئایا نونی تەئکیدی خەفیفە دەچێتە سەر موسەنا و جەمعی موئەنەس؟ بۆچی؟

## ڕاهێنان:

أ-فیعلە تەئکید کراوەکان دەربهێنە، و هۆی حەرەکەی حەرفەکەی پێشەوەیان بڵێ، لەم ڕستانەی خوارەوەدا:

١-واللهِ لَتَذْهَبَنَّ.
٢-أُكْتُبَنَّ الدَّرْسَ.
٣-أُدْرُسِنَّ كَيْ تَفْهَمِي المَوْضُوعَ.
٤-تَاللّـهِ لَأفْرَحَنَّ بِهذا.
٥-أُكْتُبانِّ مَا أَقُولُهُ.

ب-ئەم فیعلانەی خوارەوە تەئکید بکەوە بە نونی سەقیلە لە ڕستەی بەسووددا، و هۆی حەرەکەتی پێش نونی تەئکیدەکەیش ڕوون بکەوە:

أُكْتُبَا ، هَلْ تَدْرُسِينَ ، لاَ تَذْهَبْنَ ، اِنْظِمْ ، بِيعُوا.

ج-ئیعرابی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە:

١- قال تعالى: ﴿ وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُمْ ﴾(الأنبياء / ٥٧).

٢- قال تعالى: ﴿ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا ﴾(مريم / ٢٦).

٣- قال تعالى: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (الأعراف/٢٠٠).

٤- قال تعالى: ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ﴾(العنكبوت / ١١).

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

*　　*　　*

## كۆتایی

## بەم زوانە چاوەڕێ بن:




ووشەسازی لە شێوازێکی نوێ و بێوێنەدا هەموو بەشەکانی ووشەی عەرەبی کە لە پڕۆگرامەکانی خوێندندا باسیان لێوەکراوە شیتەڵ دەکات بە زمانی کوردی و بە بەکارهێنانی خشتە و هێڵکاری بۆ ڕونکردنەوەی بابەتەکان. بۆیە فێرخوازان دەتوانن چاوەڕوانی ئەم کتێبە بن کە بەم زوانە دەخرێتە بەر چاپ...

# کتێبی ڕێنما...

کتێبی هەموو ئاستەکانە، لە فێرخوازەوە بۆ مامۆستا دەتوانن لێی سودمەندبن، چونکە بە پوختی و کورتی بابەتەکانی شیتەڵ دەکات و دەیانخاتە بەردەست، بەجۆرێك کە بە خوێندنەوەی هەر بابەتێك واهەستدەکەیت کە نهێنی و کلیلی ئەو بابەتە بەدەستتەوەیە.
لەلایەکی ترەوە بەهۆی ئەو پرسیار و ڕاهێنانانەوە کە بۆ هەر بابەتێك دانراون بە شێوەیەکی کردەیی ڕێزمانی عەرەبی کردووەتە ماددەیەکی ئاسان، چونکە ڕاهێنانەکانی بەدوورن لەو مەتەڵکاریەی کە لە ڕاهێنانی پڕۆگرامەکانی خوێندندا بە ئاشکرا دیارە، ئەمەش وایکردووە شێوازێکی ئاسان و ئەکادیمی وەربگرێت.
لە کۆتاییدا... ئەم کتێبە یەکێکە لە باشترین ڕێگاکان بۆ فێربوونی ڕێزمانی عەرەبی، ئەمەش بەهۆی ئاسانی تێگەیشتن و سادەیی باسکردن و گشتگیری بابەتەکانیەوە.



نرخ: ( 8500 ) دینار


ژمارەی سپاردن: ( 173 )ی ساڵی 2010